چوار

شیعرەتابلۆ

تەواوکاری

ژوانەگورگە

لەم تێکستەدا

چوار

شیعرەتابلۆ

تەواوکاری

ژوانەگورگە

لەم تێکستەدا

چوار

سکرین چیرۆک

# ژوانەگورگ



نالّ کردنی دەست و پێی گەنجانی
کورد لەلایەن پاسدارانی ئێرانی و
ئەبن بەخواردنی گورگ لەنیوەشەودا،
لەئەرز چەقاندن تامل و چەناگەیان
لەلایەن عەرەبە حەرەس قەومیەکان و
ئەبن بەخواردنی گورگ لەنیوەڕۆدا،
بێ سەروشوێن کردنیان لەلایەن
سەربازانی حکومەتی بەعس و
ئەبن بەخواردنی گورگ لەنیوەشەودا،
ئەمانە ئەخزێنە نێو بەسەرهاتی
قوربانیانی عیشق لەنیوەشەوێکدا.

بورهان جۆلا 2009

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
زنجیرە (٦٤٤)

## سکرین چیرۆک

# ژوانە گورگ

نالّ کردنی دەستو پێی گەنجانی کورد
لەلایەن پاسدارانی ئێرانیو
ئەبن بەخواردنی گورگ لەنیوەشەودا،
لەئەرز چەقاندن تامڵو چەناگەیان
لەلایەن عەرەبە حەرەس قەومیەکانو
ئەبن بەخواردنی گورگ لەنیوەڕۆدا،
بێ سەروشوێن کردنیان لەلایەن
سەربازانی حکومەتی بەعسو
ئەبن بەخواردنی گورگ لەنیوەشەودا،
ئەمانە ئەخزێنە نێو بەسەرهاتی
قوربانیانی عیشق لەنیوە شەوێکدا.

**نوسینی**
**بورهان جۆلا**
burhanjola@yahoo.com

سلێمانی 2009

زۆرجار دابونەریت ئەبێتە بەربەست لەبەردەم کچ و کوڕە عاشقانی نێو کۆمەڵگەو گوناهی لەگۆڕنانی خەونەکانی ئەوانی ئەکەوێتە ئەستۆ.

قوربانیانی ئیشق لەوڵاتی ئێمەدا زۆرن، چەندین بەسەرهاتی جەرگبڕیان لێکەوتۆتەوەو بەمراد نەگەیشتوون.

دوژمنانی چواردەوریشمان بەهیچ شێوەیەك دەستیان نەپاراستووە لێمان، خەونی چەندین گەنجی کوردیان خستۆتە ژێر گڵ.

- ناوی کتێب/ ژوانە گورگ
- بابەت/ سکرین چیرۆك
- ناوی نووسەر/ بورهان جۆلا
- تایپ/ باوان بورهان
- بەرگ/ باڤێل بورهان
- دیزاین/مەهدی ئەحمەد
- سەرپەرشتیاری چاپ: کەنعان خەلیل
- تیراژ/ ( ٥٠٠ ) دانە
- ژمارەی سپاردن/ ( ١١٥٢ )ی ساڵی ٢٠٠٩
- چاپی یەکەم چاپخانەی شڤان – سلێمانی ٢٠٠٩

ناونیشان

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

سلێمانی- گردی ئەندازیاران: ١٠٥ کۆڵانی: ٣٤ ژمارەی خانوو: ١٠

ژمارەی تەلەفۆن: ٣١٨٠٩٩٤

## بەسەرهاتو رووداوە
## لەلایەن دوژمنەکانمان

چەندین بەسەرهاتی گەنجانی عاشق، لەگەڵ چەندین پەلاماری جیاجیای دوژمنانی گەلی کورد بۆلەناوبردنی گەنجانو زڕاندنی خەونەکانیان، بەردەوامیی ترسو دڵەڕاوکێی دوژمنانی چواردەوریش بۆ دواکەوتنی نەتەوەکەمان لەهەموو روویەکەوە لەم دەقە ئەدەبیەدا خۆیان خزاندۆتە تەك یەکتر.

- لەهەشتاکانی سەدەی رابوردوو دەسەڵاتو بیری شۆڤینیەتی داگیرکەری باشووری وڵاتمان چەندین گەنجو لاوی کوردی خستە زیندانو بێسەروشوێنی کردن.
- لەلایەن شۆڤینیەتی داگیرکەری رۆژهەڵاتی وڵاتیشمان چەندین کوڕی یەکەیەکەی میللەتەکەمان پێش چوونە بەرپەتی سێدارە ئازاری جەستەیی بێوێنە دراون، چەندین خێزانیش لەنێو خاکی خۆماندا ئاوارە بوونو ئاوهاش لەنێو سنورە دەستکردەکەی دوژمنانمان ژیان بەسەردەبەین.
- دوژمنانمان لەباکوور بەهەما شێوە.
- دوژمنانی رۆژئاواش لەم سێیانە خراپتر نەبێ باشترنیە.

## قەبوڵکردن و سەیرکردنە
## لەلایەن خۆمانەوە

گرفتی ئێمە لەوەدایە:-
یەك دڵ ویەك گووتار نین.
کارێکی قورسە ببین بەیەك هێزو یەك پارچە، بۆیە ماڵی کورد بەشکراوەو هەرپارچەیەکیش دوژمنێکی سەرکێش و ناقۆڵا دەستی بەسەرداگرتووە، بەهەرحاڵ و هەرچۆنێ بێت بەیارمەتی دەرەکی و ناوخۆیی باشووری ولآتمان کەمێك لەرەنگرێژی دوژمنی رەگەزپەرست و داگیرکەر پاککردۆتەوە.
بەبۆچوونەکانی خۆم توانیم ئەم چیرۆکە کەتێکەڵەیەکە لەتەمەنی دڵداری گەنجانی کوردو قینە سیاسیەکانی دوژمنانی کورد بەناونیشانێکی گونجاو (ژوانە گورگ) لەچوارچێوەی ژیانی دێهاتەکانی باشووری کوردستان لەم دەقە ئەدەبیەدا وێناو ئامادەی بکەم، هەروەها چوار (شیعرە تابلۆ) بکەم بەتەواکاری ئەم ژوانە گورگە.
جووڵە درامیەکە لەسەرەتای رووداو تاکۆتایی بەسەر هێڵی گشتیدا بەکێش دەکەم، جارجارەش زەینی خوێنەر پەیوەست دەکەم بەلقەجووڵەکان کەبەهێڵێکی باریکتر لەسەر هێلی گشتی لائەداو دواتر بەپێچەوانەی دەرچوون بەسەر هەمان رێچکە ئەیگەرێنمەوە سەر هێڵی کارای گشتی.
بێگوومان پەیوەندیەکی بابەتیانەی بەهێز لەنێوان هێڵی گشتی و هێڵە باریکەکانی لقەجووڵەدا هەیەو هەرگیز لەم دەقە ئەدەبیەدا لەیەکتر جیا نابنەوەو بەدڵنیاییەوە ئەڵێم تەواوکاری یەکترن و بەبێ یەکتر نەبوونی باشترەو دەقێکی نادەقی کرچ و کاڵی لێ دەردەچێ.

## تێستێك بۆ ناساندنی

## كات و شوێن و بەسەرهات و كەسێتیەكانی ئەم چیرۆكە

**زەمەنی ئەم چیرۆكە :-**

زەمەنی میحوەری نێو ئەم دەقە ئەدەبیە بۆ رووداوە سەرەكیەكە لەسەر هێڵی درامیدا ئاماژە بەشەوێك لەبەسەرهاتی تێكستەكەدا ئەكات، واتا درێژی هێڵی زەمەن بەهەشت سەعات هاوتەریبی هێڵی كارای رووداو ئەبێت، بەخزاندنی یادەوەری ساڵونێوێك ژیانی ئیشقبازیی دوو گەنجی لادێ لەگەڵ تێهەڵكێشكردنی چەندین ساڵەی قینەبەرایەتی و كوشتن و بڕینی گەنجانی كورد لەلایەن دوژمنانمان بۆنێو (جووڵە بەسەرهاتەكانی) ئەم دەقە.

**قورسایی بەسەرهات و رووداوە میحوەریەكەی ئەم دەقە ئەدەبیە لەزستان و كۆتایی مانگی دوانزەی ساڵی (١٩٩٤)ـە كەرووداوی سەرەكی تیا لەقاڵبی جوڵە دراوە بەهاوسەنگی لەگەڵ دیزاینی گێڕانەوەدا كەدابەشكراوە بەسەر ساڵانی (١٩٨٥)و (سەرەتای ١٩٩٢)و (هاوینی ١٩٩٣)و (زستانی نێوان ١٩٩٣و١٩٩٤) (بەهار و هاوین و پاییزی ١٩٩٤)دا.**

هۆكاری سەرەتای رووداوی ئەم بەسەرهاتە لەهاوینی ١٩٩٣دا لەچركەساتی یەكتر بینینی -دوو دڵدار- دا كەبەسەردانێكی خێزانیی چووبوون بۆماڵی یەكتر، بەڵام دواتر بەپێی فۆرم و پرۆسەی دابەشكردنی بەسەرهاتەكان كەبەسەر زەمەنە جۆراوجۆرەكانی ئەم دەقە بڵاو كراونەتەوە ئەم -سەرەتا- یەم خستە نێو نەخشەی گێڕانەوە كەلەلایەن تاكە كەسێكەوە ئەگاتە وەرگر ئەویش پاڵەوانی ئەم چیرۆكەیە.

دواجاریش بەهۆی سەخت و ترسناكی رێگای ژوانەكانیان و نزیك بوونەوەی دڵدار لەمەرگ....سەرجەم مەرگە سەپێندراوەكانی لای دوژمانی كورد بەرێچكەیەكی باریك بەپێی نەخشەی هێلكاری گێڕانەوە خۆیان ئەخزێننە

سەر هێڵی کارای ئەم تێکستە، واتا ئەم دەقە ئەدەبیە تەنها یەك پاڵەوانی تیایە کەچەقبەستووی نێوان سەرجەم رووداوەکانەو لەزۆربەی بەسەرهاتەکان بەشدارەو هەرخۆشی تاکەکەسە لە بەرجەستەکردن و گێرانەوەی گشت کارەساتەکان.

لەکاتی بەکێشکردنی زەمەنە سەرەکیەکە واتا تزیکەی هەشت سەعاتی نێو شەوێکدا تاکە پاڵەوان ماندووی ململانێی نێوان مەرگ و ژیان ئەبێت، هەر لەو شەوەدا گیراوی نێو تۆری خەیاڵ ئەبێت بۆ لەقاڵبدان و لێکچواندنی مەرگی خۆی بەمردنی کۆمەڵێك کەسێتی نێو ئەم دەقەو زۆریش لەدووبارەکردنەوەی چارەنووسی ئەوان ئەترسێ.

<u>شوێنی رووداوەکانی ئەم چیرۆکە :-</u>

قورسایی شوێنی بەسەرهاتەکانی ئەم دەقە لەباشووری کوردستانە، بەشی زۆری لەناوچە سنوریە دەستکردەکانی نزیك حاجی ئۆمەران و خانەیە، بەهۆی تەکنیکی هێلکاری گێرانەوە لەشێوەی (فلاش باك)دا بەشێك لە(شوێن) ئەکەوێتە دێهاتەکانی ناوچەی کفری لەگەرمیان کەلەسەر هێڵی گشتی لەتێکست ئەدرێ.

<u>بەسەرهاتەکانی ئەم چیرۆکە بریتین لە :-</u>

- جۆری پەیوەندی نێوان کیژان و کوران لەباشووری کوردستان و خۆ شاردنەوە لەداب ونەریتی کوردەواری.
- نەناسینی ماندوێتی لای گەنجانی عاشق و گیان بەخشین لەپێناوی یەکتردا.
- دژایەتی کردنی تاکی دوژمن بۆ تاکی کوردو دەرخستنی قینی ئەستووری سەرکردەکانیان بەرامبەر بەگەلی کورد.

**کەسێتیەکانی ئەم چیرۆکە بریتین لە :-**

**یەعقوب**

گەنجێکی لادێییە، تەمەنی بیست ساڵێك ئەبێت، عاشقێکی سەرکێشە، ماندوو نەناسە، دوای مردنی سێ برای لەخۆی گەورەتر ئێستا تاقانەیماڵەوەیە.

**مەلاعەلی**

پیاوێکی پیرە باوکی یەعقوب-ـە، تەمەنی حەفتا ساڵێك ئەبێت، دووکوری گورگ خواردوونی، کوڕە گەورەکەشی بەعس کوشتوویەتی.

**بەیان**

تاقە خوشکی یەعقوب-ـە تەمەنی هەژدە ساڵێك ئەبێت، لەماڵەوە زۆر یارمەتی دایكو باوکی ئەدات، پەیوەندیشی لەگەڵ یەعقوب-دا وەك دوو هاوڕێ وان.

**ئایشێ خان**

دایکی یەعقوب-ـە تەمەنی شەست ساڵێك ئەبێت، پیرەژنێکی جەرگ سووتاوەو بەهۆی کاریگەری مردنی سێ کوڕی زۆر بێدەنگو کەم دووە.

**مام حەمەد قادر**

پیاوێکی پیری دوکاندارە لەگوندەکەی ماڵی یەعقوب، تەمەنی حەفتا ساڵێك ئەبێت، بێکەسە، ژنی نەهێناوە، لەگەنجیەوە دایكو باوکی مردوون، لەناوچەی گەرمیان دوو برای گورگ خواردوونیو ئێستاش لەگوندەکەی خۆی بەتەنها ماوەتەوە هەرلەنێو دوکانەکەیدا ئەژی.

**مریەم**

کیژە گوندییەکی زۆر بەنازە، تەمەنی هەژدە ساڵێك ئەبێت، زۆر عەیارە، دولبەرێکی ناوچەکەی خۆیەتیو ماڵیان لەگوندی ئەودیو گوندەکەی ماڵی یەعقوبە.

**ترێ**

خوشکە بچووکی مریەم-ـە، تەمەنی چواردە ساڵێك ئەبێت، کچێکی روح سووکەو زۆر مریەم-ی خۆش دەوێ‌و زۆریش یارمەتی دەدات.

**مام خدر**

دوکانداریێکی گوندەکەی ئەودیو گوندەکەی ماڵی یەعقوب-ـە، تەمەنی حەفتا ساڵێك ئەبێت باوکی مریەم‌و ترێیە.

**هەییەت**

پیرەژنێکی لادێییە تەمەنی پەنجا بۆ شەست ساڵێك ئەبێت، دایکی مریەم‌و ترێیـە، کچەکانی زۆر خـۆش دەوێ، خۆشەویستی‌و ناسیاویان لەگەڵ ماڵی یەعقوب-دا هەیە.

**شنۆ**

کچێکی هەرزەکارە، هاوڕێی مریەم-ـە کەمێك فزوڵیە بەڵام روح سووکەو خۆشەویستیەکی تەواوی هاوڕێیەتی هەیە لەگەڵ مریەم-دا.

**چەندین پیاوو ئافرەت**

لادێیین لەگوندەکەی ماڵی یەعقوب تەمەنیان جۆراوجۆرە.

**چەندین پیاوو ئافرەت**

لادێیین لەگوندەکەی ماڵی مریەم تەمەنیان جۆراوجۆرە.

***ناوی کەسێتیەکانی ئەم دەقە زۆریەیان خوازراوی خۆمن، بەناوی خۆشەویستانم وەك باوکم‌و خوشکم‌و هاوسەرەکەی‌و منداڵەکانیەوە دامناون.***

پێش ئەوەی....................

بچینە سەر هێڵی درامی واتا هێڵی کارا یان ئەو هێڵە سوورو دیارە کەبەرێکی لەسەر هێڵی گشتی ئەرکی ریزکردنی رووداوەکانی لەئەستۆدایە، باروونکردنەوەیەك بخەمە بەردیدەی بەرێزی ئێوەی خوێنەر تاکو لەگەڵ سەرەتای چیرۆکەکە تووشی داچڵەکینی زەینی نەبن.

## تێستێك وەك تایتڵە سەرەتایەك

### سەرەتای ساڵی ١٩٩٢ـە وەرزیش بەهارە

### وردە وردە گوندەکانی ناوچەی حاجی ئۆمەران لەئاوەدانکردنەوەدان

لەساڵی ١٩٩٢دا واتا ساڵێك دوای راپەرینەکەی باشووری کوردستان خەڵکی دێهاتەکان کەم تازۆر لەودیو سنوورە دەستکردەکان گەرانەوە بۆ نێو گوندە وێران بووەکانیان و ئاوەدانیان کردنەوە.

چەند گوندێك لەناوچەی حاجی ئۆمەراندا کەناوچەیەکی شاخاویە لەوساڵەدا ئاوەدانکرانەوەو خەڵکەکەشی وەکو جاران بەئاژەڵداریو کەمێکیشیان بەچاندنی دانەوێڵە خەریك بوون.

ماڵی مەلاعەلی لەساڵانی هەشتاکانی سەدەی رابردوو لەسەردەمی حکومەتی بەعس ئاوارەی ئەودیو سنووری ئێران بووبوون، ئەم خێزانە چەندجارێك لەلایەن حکومەتی بەعس گیرابوونو بەرەڵاکرابوون، ئەویش بەهۆی یوسف-ی کورە گەورەیان کەبەجلو چەکی پێشمەرگایەتی لەماڵی خۆیان بەهۆی موختاری ناوچەکەیان گیرابووو بێسەروشوێن کرابوو! خۆشیان لەلایەن حکومەتی بەعس زۆر بێزار بووبوون، هەرئەو بێزاریەش بوو وایلێکردن گوندەکەی خۆیان بەجێبهێڵن، لەشەوێکدا چەند پێداویستیەکی خۆیان

کۆکردەوەو مەلا عەلیو ئایشێی خێزانیو بەیانی کچیو ئەیوبو کامەرانو یەعقوب هەرشەشیان کەوتنە رێ بەرەو ئێرانو ئاوارەیی.
مەلاعەلی مەلای مزگەوت نەبوو بەلام پیاوێکی روو لەخوابوو بۆیە لەگوندەکەی خۆیان بەمەلا ناوی دەرکردبوو هەربەوناوەش لەژیانی ئاوارەیی نێو رۆژهەلاتی کوردستان ناسرابوو، هەرچەندە لەگەڵ کوردەکانی ئەوێ ئاشنایەتیان پەیدا کردبوو و خۆیان بەئاوارە نەدەزانی بەلام لەژێر سێبەری حوکمڕانیەکی بێگانەدا لەوڕایە زۆر سەربەست نەبوو و نەبوون.
چەند ساڵێك ژیانیان بەسەربرد لەشارەکانی سەردەشتو مەهابادو چەند شوێنێکی‌تر، هەروەها لەگەڵ کوردەکان راهاتبوون هەرچەندە حەزیشیان لەگەڕانەوە ئەکرد بۆ گوندەکەی خۆیان چونکە بەهۆی کەم دەرامەتی لەژیانی ئەوێ بێزار بووبوون.
لەبەهاری ساڵی ١٩٩١دا راپەڕین لەباشووری ولات بەرپابوو، ئەوانیش وەکو چەندین خێزانی‌تر بڕیاری گەڕانەوەیاندا بۆ گوندەکەی خۆیان، چونکە لەودیو ژیانێکی مەمرەو مەژی-یان بەسەردەبرد بۆیە زۆر پەلەی هاتنەوەیان دەکرد، زۆریش حەزیان دەکرد بگەڕێنەوە بۆ گوندەکەی خۆیان تاکو لەوچەرمەسەریەی ئەوێ رزگاریان بێت، لەگەڵ ئەوەشدا ساڵێکی تریش دوای راپەڕین لەوێ مانەوە دواتر لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٢ بەیەکجاری بڕیاری گەڕانەوەیان داو تەدارەکی هاتنەوەیان بۆ شوێنەکەی خۆیان رێکخست.
هاتنەوەشیان چەندین کێشەی هەبوو....
ئەبوایە چاوەڕێ بن تاپسوڵەی گەڕانەوەیان بۆ دەردەچوو، ئەمەش ئەبووە هۆی دواکەوتنیان لەگەڕانەوە، پێویست بوو ماوەیەکی زۆرتر بمێننەوە بۆ تەواوکردنی ئەوجۆرە مامەلانەی نێو ولاتی ئێران، گەڕانەوەیان بۆ زێدی خۆیان خەریکبوو دوائەکەوت، زۆریش بێزار بوون بۆیە لەهاتنەوە

پەلـەیانکردو ڕێگـای قاچاغی سـنووریان هەڵبـژارد بـەرەو گوندەکـەی خۆیـان، ئەوەبوو لەشەوێکی بەهاری ١٩٩٢ لەپێش نیوە شەودا لەسەر سنووری عیراق ئێران و لـەنێوان شاری حـاجی ئۆمـەران و خانـە کەهێشتا سەر ئەوشاخانە پڕ بوو لەبەفر لەلایەن پاسدارەکان دەگیرێن و لەرەبیەکەی خۆیان دەست بەسەریان دەکەن.

**کۆتایی ساڵی ١٩٩٤ـە وەرزیش زستانە**

**لەگوندە شاخاویەکانی ناوچەی حاجی ئۆمەران —دا....**

گوندەکەیان ئاوەدانکردۆتەوە، خێزانەکان بەئاژەڵداریو کەمێکیش بەرەزوباخ خەریکن، یەعقوبیش گەنجێکی گوندە تازە ئاوەدانکراوەکەی خۆیانە، کورە بچووكو گەورەو تاقانەی مەلا عەلی-یە، خۆیو دایكو باوکێکی پیرو یەك خوشکی لەماڵەوە ئەژین، دووبرای گورگ خواردوویەتیو براگەورەکەشی حکومەتی بەعس بێسەروشوێنی کردووە، لەماڵی خۆیاندا تەنها چوارکەس ماونو بەمەڕداری خەریکن، وەکو خێزانەکانیتر نزیکەی سێ ساڵێکە گەڕاونەتەوە بۆ گوندەکەی خۆیان، ژیانی هەموو گوندنشینەکانیش وەکو ژیانی ئەوان وا دەڕواتو هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوانیاندا تەنانەت لەدەرامەتیشا جیاوازیان کەمە.

مام حەمەد قادر پیاوێکی بەتەمەنەو ژنی نەهێناوە، لەم گوندە دوکانێکی بچووکی لەقوڕ دروستکراوی هەیە بۆ بژێوی رۆژانەی خۆی، شەوانەش هەر لەنێو دوکانەکە ئەخەوێو خەڵکی ئاواییش هەموویان خۆشیان دەوێ، بەرۆژ گەنجان لێی کۆدەبنەوە بۆ بەسەربردنی کاتەکانی دوای ئیش، لەشەوانیشدا چواردەوری ئەگرن بۆ قسەخۆشەکانیو ئامۆژگاریە چاکەکانی، هەر ئێوارەو خێزانێك خواردنەکەی مامە پیرە ئامادە دەکاتو یەکێ لەمناڵەکانی بۆی ئەبات چونکە خەڵکی ئەم گوندە هەمووی کوڕو کچی مام حەمەد قادر-ن، خۆشەویستیەکی باوكو مناڵ لەنێوانیاندا دروست بووە، دوکانەکەی مام حەمەد قادر لەناوەڕاستی گوند دروستکراوە، ئەوشوێنەی گەنجانی گوندەکەیان رازی دڵی خۆیانیان تیا هەڵەڕژن بۆ یەکتر، ئەو دوکانەی چا گەرموخۆشەکەی دەستە لەرزۆکەکانی مام حەمەد قادری تیا ئەخۆنەوە، ئەو ژوورە بچووکەی تیایا کۆئەبنەوە بۆ گۆڕینەوەی بیرو بۆچوونەکانیان،

مەنزڵەکەی مام حەمەد قادر تاکە شوێنە گەنجانی ئەم گوندە دڵیان پێی خۆشەو هەر لەعەسرەوە دوای گەڕانەوەیان لەئیش و کارەکانیان لەوێ بەدەوری مامە پیرەی قسە خۆش ریز ئەبەستن، دوای نانخواردنی ئێوارانیش جارێکی‌تر خۆیان ئەکەن بەدوکانەکەی‌و لەچواردەوری دائەنیشنەوە بۆ گوێگرتن لەهەقایەت‌و بەسەرهاتەکانی زەمانی پێشووو سەردەمی گەنجێتی‌و هی دەسەڵاتدارانی پێشوو.

خەڵکی ئەم گوندە لەگەڵ گوندێکی‌تری نزیک خۆیان ئاشنایەتیان هەیە، هەردوو دێ لەنزمایی دروستکراون، چەندین تەپۆلکە شاخ لەنێوانیاندا هەیە، بەهۆی سەختی رێگاوبانی ناوچەکە بەپێ هاتووچۆی یەکتر دەکەن‌و نزیکەی کاتژمێرێك لەیەکتر دوورن، هەندێك لەگوندیەکانی هەردوولا دراوسێیەتیان زۆر نزیکە لەیەکتر ئەویش بەهۆی ڕەزوباخەکانیان کەبەتەنیشت یەکترو لەنێوان هەردوو دێ لەدامێنی شاخەکە دروستکراون، زۆرجاریش لەگەڵ یەکتر بەروبوومەکانیان ئاڵوگۆڕ ئەکەن.

لەوگوندەی ئەودیویش چەندین خێزانی تیا ئەژی لەنێوانیاندا خێزانێکی بەختەوەر هەیە ئەویش ماڵی مام خدری دوکانداره، ئەم پیاوە لەگەڵ ژنەکەی تەنها دوو کچیان هەیە بەناوی مریەم‌و ترێ، زۆریشیان خۆش دەوێن، مریەم نۆبەرەیەو ترێ-ش کچە بچکۆلەو ژیکەڵەی ماڵەوەیە.

ساڵ‌و نیوێك ئەبێت مریەم-ی ئەودیو و یەعقوب-ی ئەمدیو لەگەڵ یەکتر دڵیان گۆڕیوەتەوە ئەویش لەهاوینی ١٩٩٣ لەسەردانێکی خێزانی‌داو هەرئەوکاتەش چاوە رەشەکانی ئەو کچە لادێییە ئەقڵیان لەسەری یەعقوبی گەنج نەهێشتبوو بەلام بەهیچ شێوەیەك نەیانهێشتووە کەس پێیان بزانێ، چونکە مریەم کچێکی زۆر عەیارو مەکربازە هەرئەوەشە وای لەیەعقوب-ی گەنج کردووە زمانی بگرێ‌و لای کەس باسی پەیوەندیەکەیان نەکات.

لەزۆربــەی ژوانەكانیانــدا مریــەم بــەنازەوە پەنجــە خەناویــە پــڕ هەڕەشەكانی بۆ بەرز ئەكاتەوە كەنابێ ئەم پەیوەندیە لایكەس بدركێنێ، خۆ یەعقوبی دڵداریش نەك هەربەقسەی ئەكات بەڵكو بەقوربانی دەستو پەنجە سوورەكەشــی ئــەبێتو چــەندجارێكیش ماچــی ئــەكات، ئــەو عــەیارەش ئەوەنـدەیتر نازەكـانی قـورس ئـەكاتو زیـاتریش سـواری كـۆڵی ئـەم گەنجـە لادێیە ئەبێت، ئەم كچە لادێیە بەجوانیـە وردیلەكـەی ئەنازێو دڵـی ئـەم گەنجـە گوندیەی هێناوەتە لەرزە، پەیوەندیەكی روحی لەنێوانیاندا دروست بووە، ئەم گەنجەش بەردەوام وەك قەڕابەیەك شەرابی خواردبێتەوە وابوو، بۆیە بەزستانو سەرما ئەو شاخ وداخەی ئەبڕی بۆ ژوانێكی ئەو كچە دێهاتیە چاوبازە.

كیژەكـەی مـام خـدری دوكانـدار زۆر نـازوفیز دەكـات بەسـەر یـەعقوبی گەنج، تەنها لەوەرزی زستانیشدا ئەچنە ژوانو ئاوێزانی یـەكتر ئـەبن، تەمـەنی پەیوەندی ئەم دوو گەنجە لادێیەی زۆر كۆن نیە، تەنها یەك وەرز لەقـەدو بـالای یـەكتر ئالاون، ئـەویش زسـتانی كۆتـایی سـاڵی ١٩٩٣و سـەرەتای سـاڵی ١٩٩٤ بوو، ئەم زستانەی كۆتایی ساڵی ١٩٩٤ یەكەم شەوە لەدووەمین زستاندا بـەرەو ژوان ئەبنـەوە، شێتەی دڵدار ئالـەم شـەوی زستانەشدا لـەم سـەرماو بەفرەشـدا بەتەمایـە هـەروەكو ژوانـەكانی زسـتانی پێشـوو بـەپێ لەگوندەكـەی خۆیانـەوە بچـێ بـۆ گوندەكــەی مــاڵی دولبــەرە مــەكربازو عەیارەكــەی كەســەرەتای دروستبوونی هێلی گشتیە.

## سەرجەم

## چاوپێکەوتنەکانی یەعقوب و مریەم

دوو دڵداری مراد خواز، دوو دڵداری ڕەنجدەر، دوو دڵداری دڵ ناسك، دوو دڵداری هەردوو گوندی ئەمدیو ئەودیوی شاخێکی کوردستان، لەتەمەنی ساڵونیوێکی دڵداریاندا تەنها چەند جارێك بەبینینی یەکتر شاد بوون، تەنها لەچەند زەمەنێکی کورتدا یەعقوب چاوە ڕەشەکانی مریەم-ی ماچ کردووە، تەنها چەند کەرەتێك مریەم-ی عەیار نازەکانی داوە بەسەر یەعقوب-ی گەنج، ئەویش لەکاتەکانی:-

- هاوینی ساڵی١٩٩٣ ماڵی یەعقوب بەسەردانێکی خێزانی چووبوون بۆ ماڵی مریەم، لەم بینینەدا یەکەم جاربوو دڵیان لەلێدانی ئاسایی دەرچوو، خێراتر باڵیان گرتو ڕووەو یەکتر هەڵفڕین، کە غەزەلە سەرنجەکانی یەعقوب لەگۆشەی چاوە ڕەشەکانی مریەم گیرسایەوە ئەوکچە عەیارەش توند لەئامێزی دڵە مەکربازەکەی گرتو هەرلەوێوە چاوە تیلە لێهاتووەکەی دڵی ئەو کوڕە گەنجەی داخورپاندو بەمشێوەیە یەکتریان ناسی.
- زستانی کۆتایی ساڵی١٩٩٣و سەرەتای ساڵی ١٩٩٤ لەو زستانەدا یەعقوب چەند شەوێك لەگوندەکەی خۆیانەوە بەپێ چووبوون بۆ گوندەکەی ئەودیویان بۆ ژوانی مریەم.
- بەهاری ساڵی١٩٩٤ یەعقوبو مریەم دیسانەوە چاویان بەیەکتر ئەکەوێ، ئەویش لەشەوهەڵپەڕکێی گوندەکەی ماڵی مریەم بۆئەوەی

لەزەماوەندێکی ئەوێدا کەمێك بۆنی یەکتر بکەن‌و شان لەشانی یەکتر بخشێنن‌و سرەوت بەگیانیاندا بێت.

- هاوینی ساڵی ١٩٩٤ مریەم لەگەڵ خێزانەکەیدا هاتبوون بۆ ماڵی یەعقوب بۆ سەرخۆشی مردنی کامەران-ی برای یەعقوب کە لەناوچەی کفری گورگ خواردبووی، سەرلەنوێ چاویان بەیەکتر ئەکەوێ.
- لەپاییزی ساڵی ١٩٩٤دا جاریکی‌تریش دوای پرسەی کامەران، مریەم لەگەڵ حێزانەکەی هاتنەوە بۆ ماڵی یەعقوب، بۆ ئەوەی هەیبەتی دایکی مریەم کەمێك دڵنەوایی ئایشێ خانی دایکی یەعقوب بداتەوە بەبۆنەی تێپەڕبوونی چەند مانگێك بەسەر مردنی کامەرانی کوڕی، جارێکی‌تریش لەوێ ئەو دوو عاشقە چاویان بەیەکتر ئەکەوێ.
- کۆتایی ساڵی ١٩٩٤ کە تەنها دە (١٠) ڕۆژ زستانی بەردەکەوێ، یەکەم ڕۆژە لەدووەم‌و دوا ژوانی ئەو دوو دڵدارە، هەموو قورسایی هێڵی گشتیی دڕامی لەم کاتەدا دەست پێدەکات‌و بەرەو کۆتایی ئەڕوات، واتا من وەکو نووسەری ئەم چیرۆکە لە ١٩٩٤/١٢/٢١ ئەم چیرۆکەتان بۆ ئەگێڕمەوەو هەرلەهەمان زستاندا هێڵی گشتی بەرلەوەی بگاتە ساڵی ١٩٩٥ کۆتایی دێت...........

خوێنەری بەڕێز....

لێرەوە سەرەتای هێڵی گشتی ڕووداو وبەسەرهات دەست پێدەکات.

ئاگاداری خاڵی دەستپێکردن بە.

کاتو شوێنەکانم بۆت دیاری کردووە.

خاڵی کۆتاییشم بۆ نیشان کردووی.

تەنها زەمەنی شەوێکی بەسەرهاتەکانی سەرهێڵی کارای ڕووداوە، هێڵی گشتیش لەگەڵ یادەوەری چەند ساڵێکی بەسەرهاتەکانی تەنیشت خۆی وەك لقەجوڵە هەموو ئەمانە بخزێنە نێو زەینی خۆت.

لەوشەوەی نزیك کۆتایی ساڵی ١٩٩٤دا بەپێی پرۆسەی دیزاینی گێڕانەوە بەرەو کۆتایی دەق ئەتانبەم، بەڵام جارجار ئەتانگەڕێنمەوە بۆ ساڵانی پێش ١٩٩٤، بەمەرجێك هەموو فلاش باکەکان پەیوەستن بەهێڵی گشتی دڕامیو هەروەها پەیوەندیەکی بابەتیانەیان لەگەڵ یەکتردا هەیە.

دەفەرموون....

## سەرەتای تێکست

لە ٢١/١٢/١٩٩٤دا، لەشەوێکی سەرەتای زستاندا کەنزیکەی ماوەی ساڵێکە یەعقوب ئامادەیە بۆ دووەم ژوانە چاوەڕوانکراوەکەی ئەمشەو.

بۆ بۆنکردنی، عەتری قژی خاو، سنگو گەردنی مریەمی نازدار.

بۆجارێکی‌تر، چوونە ژێر باری، نازیلەکانی مریەمی عەیار.

هەرچەندە سەرەتای زستانەو ئەمڕۆ یەکەم ڕۆژە چوونەتە نێو ئەم وەرزە، بەڵام لەو ناوچە شاخاویانەدا لەپێش کۆتایی وەرزی پاییز ئەچنە نێو سەرماو سۆڵەی ئاوهاو هەرزووش بەفر بارین دەست پێدەکات، بۆیە هەرلەکۆتایی هاوینو سەرەتای پاییز ئەکەونە کۆکردنەوەی دارو چیلکە تالەسەرما شاخاویەکەدا وەك سووتەمەنی بەکاری بهێننو ماڵە لەقوڕ دروستکراوەکانیان پێگەرم بکەنەوە.

*        *        *

خوێنەری بەڕێز لێرەدا خاڵی سەرەتای هێلی گشتی دەست پێدەکات........

**کات**

**سەرەتای شەوە**

**سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٩٤ـە**

**واتا ساڵی ١٩٩٤ بەرەو کۆتایی دەڕوات**

**لەنێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر**

**لەگوندەکەی ماڵی یەعقوب**

ئەمشەو دونیا زۆر ساردە، ناو دێ بارانەو ڕەشەبایەکی زۆر توندی لەگەڵدایەو هەرچی گیانلەبەر هەیە هەر هەمووی خۆیان خزاندۆتە کون و کولانەکانی خۆیان، یەعقوب لەگەڵ گەنجانی گوندەکەی خۆیدا دوای نانخواردنی ئێوارەیان وەکو زۆربەی شەوانیتر لەدەوری مام حەمەد قادری دوکاندار کۆبوونەتەوە بۆئەوەی کات بەسەرببەن، گشت گەنجەکان کەوتوونەتە پەنا یەکترو چاویان بڕیوەتە دەمی مامە پیرە کەبەسمێڵێکی سپی زەردهەڵگەڕاو داپۆشراوە، روخساریشی بەڕیشێکی سپیەوە ویقار پەخش ئەکات.

مام حەمەد قادر بۆ یەعقوب و چەند گەنجێکیتری ئەگێڕێتەوە کەکاتی خۆی گەنج بووە، هەرزوو دایك و باوکیان مردووە، ئەوانیش سێ برابوون و کۆچیان کردووە بۆ ناوچەی گەرمیان تابژێویەکی باشتریان دەست بکەوێ و خۆیان لەمەینەتی ژیان رزگار بکەن.

یەعقوب لەنێو گەنجەکاندا بەرامبەر مام حەمەد قادر دانیشتووە بۆ گوێگرتن لەچیرۆکەکانی ئەمشەو، بەڵام لەگەڵ گەنجەکانیتر جیایە چونکە زیاتر لێو بەباری عیشقی پێوەدیارە، هەربۆیە لەگەڵ ئەو ئازارانەدا ئەژی

کەمامەی دوکاندار تادرەنگی شەو بۆیان ئەگێڕێتەوە....زۆریش پەلەیەتی دانیشتنەکەی نێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر کورت بکاتەوە تازووتر بگاتە نیوەی شەو، لەوکاتە درەنگەشدا رێگا سەختەکەی ژوان بگرێ و جارێکیتریش وەکو زستانی پێشوو ئاوێزانی بالآی مریەم بێتەوە، نزیکەی سالێکە چاوەڕوانی ئەمشەو ئەکات تابگات بەمریەم، لەوێش چەند جارێك چاوەکانی ترێ ماچ ئەکات، چونکە زۆر یارمەتی مریەمی خوشکی ئەدات بۆهاتنە دەرەوەی لەشەوێکی ئەوهادا.

یەعقوب ئەمشەو تەنها بەلەش لەگەڵ هاورێکانیدا لەدوکانەکەی مام حەمەد قادر دانیشتووە، وەکو ئەوانیش هەناسەکانی مەلە ئەکات بەنێو دوکەڵە چڕەکەی ژوورەوە....خۆ هەموو هەستەکانی لای کاتژمێرەکەی دەستیەتی، چرکە دوای چرکە لەشەوگارەکەی یەعقوب-یان کەم دەکردەوەو وادەی ژوانیان بۆ نزیك دەکردەوە، ئێستا ئەم گەنجە بیرەکانی لەژێر کۆنترۆڵی خۆی نیە، لێدانی دڵ و چرکە ژمێرەکەی دەستی بەردەوام ئاراستەکانی زەینی ئەگۆڕن بەرەو دێکەی مالی مریەم، مامە پیرەش بەدەم چالێنان خەریکی گەشکردنەوەی خەڵوزو گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانیەتی.

* * *

ئەمشەو بۆ پاسەوانی مەڕەکانیان یەعقوب دەستبەتاڵە، نۆرەی باوکیەتی لەماڵەوە بەوکارە هەڵسێ، چونکە لەگەڵ باوکیدا هەرشەوەو یەکێکیان لەنێو ڕان ئەخەون لەترسی گورگ! ئەمشەو یەعقوب لەگەڵ هاوڕێکانیدا لەنێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر کات بەسەرئەبات و دوای نیوەشەویش لەم وەرزە تازەیە یەکەم شەوە وەکو زۆر شەوانی زستانی رابوردو رێگای ژوانی مریەم گیان ئەگرێ و لەوێ بەیەکتر شاد ئەبن.

دوکانەکەی مام حەمەد قادر زۆر گەرم بووە، سۆبای دار، مەقاڵی خەڵوون، جگەرەی خۆی‌و گەنجەکان، هەموو ئەمانە لەنێو چوار دیواری قوڕدا کۆبوونەتەوە، بنمیچەکەش چەند دارەڕایەکی رەش هەڵگەڕاوو لەچەند شوێنێکیش دەزوولەی رەش هاتۆتە خوارەوە، دیوارەکانیش چەند دەلاقەیەکی قووڵی تیایەو رەشی چرا نەوتیەکەش لەدەستە ڕاستی شوێنی دانیشتنەکەی مامە پیرەی ڕیش سپی دیارە.

دوکانەکە دەرگایەکی داری هەیەو یەکسەر لەسەر کۆلانە، ئەگەر لەدەرەوە لەکاتی شەو سەیری درزەکان بکەی بەهۆی ڕووناکی چراکەی ژوورەوە کەمێك کەسەکان ئەبینی، مامە پیرەش مەجلیسی زۆر گەرمەو بەردەوامە لەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی، هەندێ کات یەعقوب سەیری دەمی مام حەمەد قادر دەکات بەڵام دەنگەکانی مریەم-ی دولبەر لەگوێچکەیدا ئەزرنگێتەوە، کاتی واش هەیە لەنێو قەرەباڵغیەکی وادا گوێی لەهیچ شتێك نیە، وێنەکانی بەرچاوی مامە پیرەو گەنجەکانی هاوڕێیەتی بەڵام دەنگەکان هی مریەم‌و ترێیە بەگوێچکەیدا گوزەر ئەکەن‌و تێئەپەڕن، بۆیە ئەم گەنجە عاشقە لەژیانی ئاسایی‌و هەروەها لەنێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر-یش بەردەوام ژوانەکانی زستانی ڕابردووی لەبەرچاوە، چ وەك زۆری خۆشەویستی بۆ مریەم یان وەك تامەزرۆیی ڕاموسانەکانی نێو باوەشی ئەو کچە لادێییە.

دڵی گەنج وەکو ئەو تەمەنەی ئێستای یەعقوب هێندە ئاقڵ نیە تا دان بەخۆی بگرێ‌و نهێنی ڕازەکانی دڵداری لای کەسێك باس نەکات، بەڵام لەناوەڕۆك‌و داهاتووی خوێندنەوەی ئەم دەقەدا بۆتان ئەدوێم‌و ئەیخەمە بەر زەینتان کەکاریگەری عەیارباشی مریەم چەندە لەسەر ئەم گەنجە هەرزەکارە بۆ شاردنەوەی نهێنی عیشقەکەیان لەناودڵی خۆیاندا، هەرچەندە مریەم-یش

لەهەمان تەمەندایەو بگرە بچووکتریشە بەڵام لەتەمەنی گەنجێتیدا کچان بەڕێژە لەکوڕان زۆرزانترو عەیار ترن.

*       *       *

**جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر،**

**دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........**

**یەعقوب ئەچێتە دونیای خەیاڵ**

**لە دوکانەکەی مام حەمەد قادر ئەفڕێ و**

**ئەڕوات بۆ یەکێك لەشەوژوانی زستانی پێشوو**

یەکێ لەشەوە سەرماو تاریکەکانی زستانی کۆتایی ساڵی (١٩٩٣)و سەرەتای ئەمساڵی ١٩٩٤دا یەعقوب و مریەم لەگوندەکەی ئەودیو واتا ماڵی ئەو دولبەرە لەبەردەم دوکانەکەی مام خدری باوکیدا بەیەکەوە وەستابون، بەردەمی ئەم دوکانەی مام خدری باوکی مریەم ژوانگە تاریك و ساردەکەی ئەم دوو عاشقەیە، لەو وەستانەدا مریەم هەردوو دەستە خەناویەکەی کردۆتە ملی یەعقوب، ئەویش دەستەکانی ئاڵاندۆتە کەمەری ئەو کچە عەیارە لادێییەو تێروپڕ ناودەمی یەکتر هەڵەمژن.

یەعقوب-ی گەنج جارجارە دەستەکانی ئەدزێتەوەو ئەیبات بۆ نێو سنگ و مەمکی ئەو کچە چاوڕەشە، بەڵام دولبەری عەیار هەرزوو بەمڵچەیەك لێوەکانی لەنێو دەمی ئەو کوڕە دەرئەهێنێ و دوای زللەیەك بۆ پەنا گوێی دووبارە باوەش ئەکەنەوە بەیەکترو دەمی هەردووکیان لەناو یەکتردا وون ئەبێت.

مریەم// (<u>دەمی لەماچەکەی بەرئەداو بەپەنجەکانی هەڕەشە لەو دڵدارە گەنجە تازە پێگەیشتووە ئەکات و</u>

بەهەزاران باریش نازوفیز ئەکات بەسەریدا بەنەرمی پێی ئەڵێ) نامەوێ کەس پێمان بزانێ! باش....!

یەعقوب// (ئەو گەنجە گێژوحۆڵبووەش بەردەوام سەیری دەموچاوو سنگی دولبەرەکەی ئەکات‌و بەسەریش یەك لەسەریەك ڕەزامەندی پێشکەش ئەکات لەپڕ دێتە قسەکردن) باشە بەقوربانت بم.

کەمێکی تریش ئەچنەوە باوەشی یەکترو توند توند یەکتری ئەگووشن، بەساقەو بەقوربانی یەکتر ئەبن، لەیەکتر ئەڕوانن، ماچی یەکتر ئەکەن، زۆریشیان بەلاوە خۆشە بەبێ دەنگی بچنە خەڵوەتی باوەشی یەکترو سنگ بنێن بەسنگی یەکتر، دوای تاوێك مریەم بەنازو فیزێکەوە دێتە قسەکردن‌و:-

مریەم// ئەزانی ئەو ڕۆژە شنۆی هاوڕێم ئەیووت چی؟

یەعقوب// (سەیری مریەم ئەکات‌و چاوەڕێی ئەکات قسەی بۆ بکات) ئم....

بامن وەکو نووسەری ئەم دەقە بۆ ئێوەی خوێنەر روونبکەمەوە، شنۆی هاوڕێی کەلەگەڵ کۆمەڵێك کچانی هاوڕێی‌و مریەم-یش بەیەکەوە لەماڵی مریەم دانیشتبوون‌و چی بەمریەم ووت؟ لەهەمان کاتدا ئەمەوێ‌و ئومێدم وایە شێوەی گێڕانەوەکەم یان روونتر بڵێم هێلکاری لەدیزاینی گێڕانەوەکەم لەنێو ئەم دەقە ئەدەبیەدا کاریگەری وای هەبێت کەلەخەسڵەتی خوێنەر دەرت بهێنێ‌و بتکات بەبینەر، تابەشێوەیەکی بەرچاوتر هەست بە کات‌و شوێن‌و سەرەتاو کۆتایی رووداوەکان بکەیت، هەربۆیە من داهێنەری (سکرین چیرۆك)م ئەویش کە:-

ئەوەتا دەستەیەك لەكیژانی گوند بەیەكەوە لەماڵی مریەم دانیشتوون، قسەو باس و پێكەنینی خۆیان دەكەن، تریێ-ش لەنێوانیان دانیشتووە، دەنگیان نایەت تەنها دەمیان ئەجووڵێ، چونكە پانتایی ژوورەكە بەموزیكێكی ناسكی رەنگ كچانە داپۆشراوە كەهاوتەریبە لەگەڵ قریەوە بچووك و ناسكەكانیان، ئەم دیمەنەش ئەكەوێتە سەر سكرینی روئیای یەعقوب لەنێو دوكانەكەی مام حەمەد قادر.

شێوەی پێكەنین و جووڵەی دەست و قاچە خەناویەكانی ئەو كیژە لادێییانە لەخۆیدا حیوارو جووڵەی گوزارشتێن بۆ ئەو شەوە ساردەی كەئەم دوو دڵدارە لەبەردەم دوكانەكەی مام خدر بەبێدەنگی بەیەكەوە وەستابوون، دولبەر خانیش چۆنیەتی پرسیارەكانی شنۆی هاوڕێی كەلەخۆی عەیارترە بۆ یەعقوب ئەگێڕێتەوە.

* * *

**لقە جووڵە بەردەوامە......**

ژوورەكەی ئەو كچە عەیارانە لێوانلێوە لەناز، عەتر، پێكەنین، تریقانەوەی بەپشتا كەوتوو....جلی رەنگاورەنگ....هەمو ئەمانە لەسەر سكرینی روئیای ئێوەی خوێنەر بەموزیكێكی زۆر ناسك رووپۆش ئەكەم.

ئەوا شانەو ئاوێنەكەش بەردەوام بەسەریاندا ئەسوڕێتەوە، كەهەریەكێكیان لەوەیتری وەرئەگرێ دوای تێرامان پڕبەپڕی ئاوێنەكە خۆی ماچ باران ئەكات، بەزۆرو راكێش راكێش لەیەكتریی وەردەگرن، چونكە كچان حەزدەكەن ئەو پارچە شووشەیە زیاتر لەلایان بمێنێتەوە بۆ ئەوەی زۆرتر سەیری خۆیان بكەن.

لەپڕ دەنگی موزیك ئەپچڕێت و کەمێك بەکزی دەنگی پێکەنینەکانی ئەو کچانە ئەگاتە گوێمان، شنۆ لەو ژوورەو لەنێوان کچانی هاوڕێیدا روو ئەکاتە مریەم–ی جوانکیلەو بەپێکەنینەوە ئەکەوێتە پرسیار:–

شنۆ// (بەپێکەنینەوە) تۆ لەگەڵ کوڕێك دڵت گۆڕیوەتەوە....وانیە؟

مریەم// (هەر بەو پێکەنینەو نازو فیزەوە) نەخێر...ناشیرین، ئەو پرسیارانە چیە؟!

شنۆ// (بەگاڵتەوە) بەخوا مریەم تۆ زۆر عەیاریت.

مریەم// (بەگاڵتەوە) ئەی خۆت؟

شنۆ// (بەپێکەنین وگاڵتەوە) بەخوا........هەرچەند سەیرت دەکەم، لەچاوەکانتدا دیارە شتێکت لەدڵدایە.

مریەم// (هەر پێئەکەنێ) تۆ گەلێك زۆرزانی.

شنۆ// // (بەپێکەنین وگاڵتەوە) عەیاری زۆرزان ئەو هەموو مورو عەتعەتۆکە چیە بەیەخەتەوە؟ سەیری دەستی عەیارخان کەن تا ئانیشکی بازنی تیایە.

مریەم//// (بەپێکەنین وگاڵتەوە) ناشیرین تۆش وایت.

کچەکانی هاوڕێی لێی کۆئەبنەوە بەگاڵتەکردنی هاوڕێیانەی خۆیان لەگەڵ تێکەڵاو بوونیان بەدەنگی موزیك سەیری روخساری مریەم دەکەن، دەست و پەنجەو سنگ و بەرۆکی پڕبوون لە بازن و موستیلەو ملوانکە، چەندین موروو مەرجان و چەند کوژەکەیەکیشی پێوەبوو، دوای چەند پێکەنین و یاریکردنی خۆیان دووبارە شنۆ لەگەڵ پچڕانی موزیك پرسیاری لێدەکاتەوە:–

شنۆ// عەیار پێت نەوتین ئەم کوژەکەو چاووزارە چین؟

مریەم// مەیمونانە ئەمانە بۆ چاووزار هەڵمگرتون (سەر بائەداو وەك نازکردنێك پێئەکەنێ) تانەبم بەچاوەوە.

شنۆ// ئەی....ئەی....چەند عەیاریت.

کچە چاوبازەکان تێکڕا پێکەنینیان ئاوێتەی موزیکە گوزارشتیەکە ئەکەنەوە، دواتر بەگاڵتەوە پەلاماری مریەمو شنۆ ئەدەن، ئەکەونە گاڵتەجاڕی کچانەی خۆیان، تریێ-ش چڵە نێرگزێکی بچکۆلەیەو هەرسات لەباوەشی کچێکە، چونکە هەموویان خۆشیان دەوێ.

*        *        *

گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

کات

هەر سەرەتای شەوە

سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٩٤ـە

یەعقوب لەخەیاڵ دەردەچێ و

ئەگەڕێتەوە نێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر

یەعقوب لەگەڵ پێشکەشکردنی (چا) لەلایەن مام حەمەد قادر لەو خەیاڵە ڕەنگاورەنگە دێتە دەرەوە کەلەیەکێ لەژوانەکانی پێشوو لەگەڵ ماچی پڕبەدەم مریەم دەنگوباسی ئەو کچە سەوزو سوورانەی بۆ گێڕابووەوە، دوای داچڵەکین لەگەڵ (چا) وەرگرتن لە مامە پیرە دێتەوە نێو دوکان و نێو گەنجەکانی هاوڕێی، بەیادی ئەو لەززەت و خۆشیەی لای مریەم زەردەخەنە

لەرووی نابڕێ، کەمێك سەر دائەنەوێنێ تاپێکەنینەکەی بشارێتەوەو کەس پرسیاری لێنەکات، پاشان بەیادی ملچەی ماچەکانی مریەم فرەفڕ (چا) گەرمەکە بخواتەوەو کەسیش لەهاوڕێکانی پێینەزانێ.

دوکانەکەی مامە پیرە شەش پالۆیەکە....پڕە لەدوکەڵی جگەرەی خۆیو گەنجەکان، مام حەمەد قادر هیچ کات نیە بێجگەرە بێت، بەردەوامیشە لەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی خۆیو براکانی، شەوانە بەسەرهاتی لەو جۆرەیان بۆ ئەگێڕێتەوە، بەسەرهاتی واش هەیە چەندین شەوی ئەوێ بۆ تەواو بوونی، مامەی دوکاندار چەندین بەسەرهاتو چیرۆکی گوێ ئاگردانی ئاوهای لایە، ئەمشەویش بەسەرهاتەکەی خۆیو براکانی بەرجەستە ئەکات.

یەعقوب لەپێکەنینو خەیاڵە خۆشەکانی مریەم دەرچووەو سەرلەنوێ لەگەڵ هاوڕێکانی گوێی گرتووە بۆ قسەکانی مامە پیرەی ریش سپی.

مام حەمەد قادر خەڵکی ئەم گوندەیە کەئێستا بەیەکەوە تیای دانیشتوون، هەرلێرەش لەدایك بووە، بەڵام دوای مردنی دایكو باوکیان لەگەڵ دووبرایتری بەهۆی دەست کورتیو قورسی ژیانیان لەساڵی ١٩٦٣ لەناوچەی گەرمیان نیشتەجێ ئەبن، پاش ئەو کارەساتەی بەسەریان دێت مام حەمەد قادر هەر هەمان ساڵ بەتەنها خۆی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەم گوندە، ئەم پیاوە پیرو بێکەسە تەمەنی لەهەڵکشاندایەو هەتا ئێستاش ژنی نەهێناوە.

مام حەمەد قادر// ئێمە سێ برا بووین، دایكو باوکمان هەرزوو مردن (کەمێك ئەوەستێ) خوا لێیان خۆش بێت.

ئێمەش لێرە کارمان دەست نەدەکەوت، ساڵی ١٩٦٣ بوو، چووین بۆ ناوچەی گەرمیان، لەنێوان هەردوو شاری کەلارو کفری لەیەکێ لەگوندەکان خانوێکی

بچکۆلەمان گرت و تیایا ژیانمان بەسەر دەبرد،
هەرسێکمان بەیەکەوە ئیش وکارمان ئەکرد، لەژیاندا
هاوبەش بووین، برا گەورەکەم لەگوندێکی نزیک
خۆمان عاشقی کچێکی گەرمیانی بوو، بەڵام برا
بچووکەکەم زۆر منالْ بوو.

تێکڕا گەنجەکان دەمیان داچەقاندبوو بۆ گوێگرتن لەبەسەرهاتەکانی ئەو مامە پیرەیە، مام حەمەد قادر برا ناوەنجیەو برایەکی لەخۆی بچووکتری هەیە، برا گەورەکەی زۆربەی شەوان بەپێ ئەورێگا دوورەی نێوان هەردوو گوند ئەبڕی بۆ بینینی ئەو کچە ئەسمەرە گەرمیانیە.

مام حەمەد قادر// (لەنێو دوکانەکەی خۆی
دانیشتووەو بەمشەوە ساردە بەردەوام
بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ ئەم گەنجان دەدەگێڕێتەوە)
چەند جارێکیش چووبووین بۆ خوازبێنی، بەڵام
باوکی کچەکە رازی نەدەبوو چونکە ئێمە
کوێستانی و ئەوانیش گەرمیانی بوون.
ئەوشەوە دوا جار بوو چووبووین بۆ داوای ئەو کچە،
خۆزگە لەوێ هەرسێکمانیان قۆڵبەست بکردایەو
تابەیانی نەیانهێشتایە بڕۆینەوە، بەڵام بەداخەوە
هەر زوو وسەرلەئێوارە باوکەکەی بەڕێی کردین.

* * *

**لقە جووڵە بۆ سەر سکرینی خەیاڵی مام حەمەد قادر......**

ئەودیمەنە دەردەکەوێ کەهەرسێ برا لەوماڵە گەرمیانیە دانیشتوون، دەموچاویان کەمێك گرژە چونکە ئەزانن باوکی کچەکە پێیان رازێ نابێت،

لەنێو مەجلیسی ئەو خێزانە گەرمیانیەو ئەو سێ برایە باوکی کچەکە دێتە وەڵام:-

باوکی کچەکە// کچەکەم نادەم بەئێوە، چونکە ئێوە
خەڵکی لای خۆمان نین و هەرکاتێك بێت ئەگەڕێنەوە
بۆ ناوچەی حاجی ئۆمەران.

* * *

**گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی لەدوکانەکەی مام حەمەد قادر......**

بەم شەوە ساردە کەنزیکەی کۆتایی ساڵی ١٩٩٤ـەو مام حەمەد قادر لەنێو دوکانەکەی خۆی بەدەم جگەرە کێشانەوە بەردەوامە لەگێڕانەوەی سەرگوزشتەی خۆی و براکانی بۆ گەنجەکان، ئەوانیش هەرهەمووی عاشق و لێوبەبارن بۆیە حەزیان لەگێڕانەوەی سەربوردەی وایە.

مام حەمەد قادر// (لەنێو دوکانەکەدا بەگەنجەکان
چواردەوری گیراوە) وەرزی هاوین بوو....بەڕۆژ پیاو
هەمووی لەسەر ئیش وکاربوون، ئێوارانیش
ئەگەڕانەوە بۆ نێو ماڵەکانیان....ئەو شەوەی باوکی
کچە گەرمیانیەکە بەڕێی کردین بۆ گوندەکەی
خۆمان، برا گەورەکەمان دڵی زۆر ناخۆش بوو، بەدەم
ڕێگاوە خەریکی دڵدانەوەی بووم.

کوڕانی نێو دوکانەکەی مامەی چیڕۆکڤان ئەبڵەق دانیشتوون و گوێیان هەڵخستووە بۆ قسەکانی ئەو پیاوە پیرە، چاوەڕوانن بزانن کەی و چۆن چۆنی برا گەورەکەیان ئەو کچەی هێناوەو بەچ شێوەیەك بەیەکتر گەیشتوون؟ بۆیە حەز لەبەدواداچوونی ئەم عیشقەی برا گەورەکەی مام حەمەد قادر دەکەن

چونکه هەریەکێك لەوان دڵێکی هەیە، هەرلەدەموچاویانەوە دیارە کە چۆن‌و بەچ شێوەیەك لەمام حەمەد قادر دەڕوانن.

مــــام حەمـــــەد قـــــادر// شـــــەوێکی شـــــووم بوو........ئەوشەوە دوا شەو بوو، ئێمەش بەهەناسە ساردی‌و دڵێکی ناخۆش ئەگەڕاینەوە بۆ گوندەکەی خۆمان....ئاخخخخخ.

*　　*　　*

مامە پیرە ئەوکاتە گەنج بوو، هەر ئەوشەوە لەگەرمیان دەمینێتەوە بۆ بەیانی لەگەڵ خەڵکی ئاوایی تەرمی هەردوو براکەی ئەنێژن‌و دواتر ملی ڕێگای ناوچەی حاجی ئۆمەران ئەگرێتەبەر.

ئێستاش گۆڕی ئەم دوو برایەی مام حەمەد قادر لەناوچەی گەرمیان ماوەتەوە، تاکو ساڵانی هەشتاکانی سەدەی رابردووش جارجارە ئەم تاقە برا ریش سپیە سەردانیانی دەکرد.

*　　*　　*

**جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر،**

**دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........**

**کات**

**شەوە....هاوینی ساڵی ١٩٦٢ ـەیە لەناوچەی گەرمیان**

**لەگەڕانەوەدا مام حەمەد قادرو دوو براکەی تووشی کارەسات دەبن!**

هەرسێ برا بەدڵ شکاوی‌و بەیەکەوە لەدێکەی ماڵی کچەکە بەرەو دێکەی خۆیان ئەگەڕانەوە، وەرزی هاوینەو ڕێگاکەشیان تەختاییەو ترسی هیچیشیان نیە، شارەزاییەکی چاکیشیان هەیە چونکە ئەمە چەندین جارە بەم ڕێگایەدا ئەڕۆن‌و ماوەیەکیشە لەم ناوچەیە ئەژین، بەم شەوە هەرسێکیان وردە وردە بەپێ لەنێوان ئەو دوو گوندە بەسەر ڕێگا خۆڵەکە ئەڕۆیشتن، ئاخ لەو شەوە، ئاخ بۆ بێکەسی ئەو سێ‌برایە، هەرسێکیان بەسەر سوڕمانەوە سەیری بەردەمی خۆیان کرد! چیان بینی؟!

لەدوورەوە چەند خێمەیەکیان بەدیکرد! خۆ سەر لەئێوارە بەوێدا ڕۆیشتبوون هیچ شتێکی وای لێنەبوو! ناشزانن لەکاتی گەڕانەوەدا ئەم خێمانە چیە؟! چۆن هاتوون بۆ ئەوێ؟! بۆچی لەوێ هەڵیانداوە؟! وردە وردە بەسەرسامیەوە لێیان نزیک بوونەوە تائاستی دەستەو یەخە! کەبینیان هەمووی عەرەبی خوارون هاتوون لەوناوچەیە هەڵیانداوە! ئەوانیش لەدوورەوە ئەو سێ کەسەیان بەدیکردبوو، بۆیە هەرهەموویان بەژن‌و منداڵ‌و گەورەو بچووکەوە هاتبوون سەر ڕێگاکەیان لێ گرتبوون.

گەیشتنە لایان، هەرسێ برا کەوتنە نێوانیان! سەیری خۆیان دەکرد چواردەوریان بەو کۆمەڵە خەڵکە کراس سپیە ئاودامانیە گیراوە، بەم شەوە حەپەساوو قوڕبەسەر بوون، تەنها غەڵبە غەڵب ئەهاتە گوێیان‌و لەهیچ

وشـــەیەکی ئـــەوان نەدەگەیشـــتن، تەنانـــەت منالەکانیشـــیان لـــەدەوریان کۆبوووبوونەوەو جارجارە شەڕواڵەکانیان رادەکێشان و بەبەرد لێیان ئەدان.

* * *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی لەنێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر

مـام حەمـەد قـادر لەدووکانەکـەی خۆیـدا بەمشـێوەیە لەگێڕانـەوەی بەسـەرهاتی خـۆی و براکـان بەردەوامـە، بـەردەوامیش جگـەرە دوای جگـەرە دائەگیرسـێنێ، چـوار مشـقیش لەپشـتی مقاڵیەکـە دانیشـتووەو بەمشـێوەیە بەگەنجەکانی ووت:-

مـام حەمـەد قـادر// کوڕینـە چیتان بـۆ بـاس بکـەم؟!
پیاوگـــەلێکی زۆرن و هەمووشـــیان چـــەکیان پێیـــە!
ئێمەش تەنها سێ کەس و یەك دەمانچە.

گەنجەکان هەریەکەو بەشێوەیەك لەسـەر بـەڕەو لبـادی دوکانەکـەی مام حەمەد قادر دانیشتوون، چاکەشیان لەسەرەخۆ قوڵپ ئەدات، مام حەمـەد قـادر قۆریەکـە دائـەگرێ و بەمەقاشـەکە کـەمێك مەقاڵیەکـە لـەخۆی دوور دەکاتـەوە، گەنجـەکانیش لەتاوگـەرمای ژوورەوە جارجـار دەرگـای دوکانەکـە ئەکەنـەوە، ئەوەندەی پێناچێ بەهۆی باران و هەوای سارد یەکسەر دایئەخەنەوەو دووبارە گـوێ هەڵئەخـەن بـۆ مامـە پـیرە، هەنـدێ لەگەنجـەکان داوا ئەکـەن دووبـارەو کەمێکی‌تر دەرگاکە بکرێتەوە چونکە بەهۆی زۆری دوکەڵی جگەرەوە بێزاریـان پێـوە دیـارە، چـەند دانەیـەکیان دەسـتیان گرتبـوو بـەدەم‌ولووتیان، یـەك دوانێکیان بەگاڵتەوە بەهاوڕێکانیان ئەووت:-

- توخوا تۆزێ جگەرە کەم بکەنەوە.
- کورە کاکە خنکاین.

○ ئـەرێ دەبەسـە ئـیتر....لـەناو دوکـەڵ وون بووین.

ئەگەر ئەم دیمەنەی نێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر وێنـەی سینەمای بـۆ بگـیرێ ئـەوا بەشـی لای سـەرەوەی سـکرین یـەك پارچـە سـپیەو لەدوکـەڵ هەڵکێشـراوە، گـەر پشـتی کامێراکـە بکەینـە دەرگاکـەو رووەو ئـەو مەجلیسـە وێنـەیان بگـرین، دەسـتە چـەپ مـام حەمـەد قـادر لەپشـتی مەقاڵیـەکی پـڕ لەخەلوزی گـەش دانیشـتووەو جگەرەشـی بەدەستەوەیە، بەتەنیشتیشیەوە بۆ خـوارەوە رەنگێکـی سـوور ئـەنوێنێ بـەهۆی گـڕی سـۆبا دارە داخ بووەکـە، لای راستی و سەرەوەی ژوورەکەش گەنجەکانی تیا کۆبووەتەوە، مام حەمەد قادر- یش مـاڵی ئاوابـێ جگـەرە بەجگـەرە دائەگیرسێنێ و لەهـەموویان بەجۆشـترە بـۆ دووکەڵکردنـە نێـو دوکانەکـە، خـۆ بنمیچـەکە پڕبـووە، خەریکـە وەکـو هـەور دائەبزێتە خـوارەوەو بەرچاویان ئـەگرێ، مامـەی ریـش سـپی لـەنێو فـەزای ئـەم ژووره گڵـە کـەلای سـەرەوەی رەنگـی سـپیەو لای خوارەوەشـی سـوورەو بەردەوامە لەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی خۆی و براکانی.

*        *        *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێلێکی باریکتر،
## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

دوای ئەوەی مام حەمەد قادرو براکانی بەمشەوە لەنێو ئەو عەرەبانە ئەبلەق بوون، بەکپی سەیری ئەم هەموو زۆر بلێیەیان دەکردو سەریان لێیان سوڕمابوو! تائێستاش لەناو دوکانەکە دانیشتووە ئەم واقوڕمانەی بەسەر دەموچاویەوە ماوەو بەردەوامیشە لەگێڕانەوەی کارەساتە جەرگ بڕەکەی خۆیو براکانی.

*          *          *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی لەنێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر

مام حەمەد قادر بەهۆی ئەو کارەساتەی بەسەریاندا هات زۆر خەمو خەفەت دەخوات، لەدوکانەکەیدا دانیشتووەو بەمشەوە ساردە حەزدەکات دڵی خۆی بەتاڵ بکاتەوەو ئەوەی لەناخیدا پەنگی خواردۆتەوە بۆ گەنجەکانی بخاتە روو، بۆیە بەدەم چاتێکردن بۆ گەنجەکان بەردەوامە لەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی خۆیو براکانی کەلەساڵی ١٩٦٣دا بەسەریان هاتبوو:-

مام حەمەد قادر// هەرسێبرا کەچاومان بەم هەموو عەرەبە کەوت ترسێکی زۆرمان لێنیشت! نەمانئەزانی چیبکەین! نەمان ئەتوانی بگەڕێینەوە! بەمشەوە لەناکاو ئەو دیمەنە کتوپڕە چیبوو؟! هەرگیز شتی وامان نەدیبوو! بەوە نەدەگەیشتین سەیری دەموچاوی یەکتر بکەین! چاویشمان لەکاتی گواستەوەدا بەسەر روخساری ئەو هەمو کراس سپیە درێژە فریای بازدان نەدەکەوت، بەهۆی تاریکی

شەوەکەو ترسی زۆرمانو شپرزە بوونمان ئێستاشی
لەگەڵدابێت هەندێ ڕووی ئەو عەرەبانەمان نەبینی.

*         *         *

خوێنەری بەڕێزم....

لە نێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر گوێ شل بکە بابەسەرهاتەکانی بگێڕێتەوەو لەسەرجەم ڕووداوەکان ئاگادارمان بکاتەوە.

یەعقوب-یش هەر ئەمشەو دوای دەرچوونیی لەم دوکانە بەرەو ژوانی مریەم خان، لەرێگا لەکاتی ڕاونانیی لەلایەن گورگەکانو هەروەها لەترسی پەلاماری گورگەکان لەکاتی خۆشاردنەوەی لەخانووی نێو ڕەزدا بەپێی ریزبەندی ڕووداوەکان لەنێو پرۆسەی هێلکاریو دیزاینی گێڕانەوەی ئەم دەقە تەواوی بەسەرهاتەکەی براکانی مام حەمەد قادرو هەرسێ براکەی خۆیشی بەهێلێکی باریکتر لەهێلی گشتی بۆتان ئەگێڕێتەوە.

بەڵام ئێستا هێلی گشتی لەناو دوکانەکەی مام حەمەد قادر بەردەوامەو لەهەموو لادانو گەڕانەوەیکیشدا ئاگادارتان دەکەمەوە.

مام حەمەد قادر// (بەداخو کەسەرەوە سەر بائەدا)
ئاخ ئەوەی بەسەر ئێمە هات بەدەست ئەو عەرەبانە
یاخوا بەسەر دوژمنیشمان نەیەت.

گەنجەکانیش هەرهەمووی لەنێو دوکەڵ نوقم بوونو بەسەر سوڕمانەوە سەیری دەمولی مامە پیرە ئەکەن، جارجارەش بەچەند پرسێک بەشداری گێڕانەوەکەی ئەو پیاوە پیرە بێکەسە دەکەنو بەڕێزەوە ئەڵێن:-

- بۆچی مام حەمەد قادر چیان لێکردن؟!
- مام حەمەد قادر لێیان دان؟!........ئەزیەتیان دان، وانیە؟!

مام حەمەد قادر// توند ئێمەیان گرتبوو! هاواریان ئەکردو ئەیانووت {احنا البدو، وین العدو}؟!

- ماناى چیە؟!
- وەڵڵا منیش نازانم! مام حەمەد قادر ئەزانێ.

مام حەمەد قادر// ئێی هێی........منیش دوایی زانیم ماناى چیە!....(هەناسەیەکی هەڵکێشا) ماناى ئێمە عەرەبی دەوارنشینین و دوژمنەکەمان لەکوێیە؟!........ئەوان کوردیان بەدوژمنی خۆیان ئەزانی کوڕم (خەریکی فرمێسك سڕینە).

گەنجەکان ئەیانچڕپاند بەگوێی یەکترو نەشیان ئەویست هەستی ئەم پیاوە پیرە بریندار بکەن، هەندێکیان لەپەنا پیاڵە چاکەی نێو دەمیان روخساریان لەمام حەمەد قادر دەشاردەوە، چەند دانەیەکیشیان دەموچاویان ئەخستە پشت سەری یەکترو لەگەڵ ئەوەی تەنیشتیان پرسیاریان ئاڕاستەی یەکتر دەکرد.

- رەنگە ئەزێتیان دابن.
- بەخوا نازانم بەڵام لەوە ئەچێ، چونکە مام حەمەد قادر زۆر خەفەت دەخوات.
- راست ئەکەی، بەخوا زۆر گوناحە ئەوەتا ئەگری.

* * *

ئەو سێبرایە خەڵکی ناوچە شاخاویەکان بوون، دوای مردنی دایكو باوکیان بەهۆی کەم دەرامەتی هاتبوون بۆ ناوچەی گەرمیان، زۆر تێکەڵیان لەگەڵ ناوچەکەو سنووری عەرەبستان نەبوو، لەوەپێش مرۆڤی عەرەبیان

بەکراسێکی درێـژەوە نـەبینیبوو! کاتێك بـەم شـەوە خۆیـان لـەنێو ئـەو هـەموو کراس سپیە بینیەوە زۆر ترسان! شکیان لەوە هەبوو ئێرە سەرگۆڕستان بێ و مردووەکانیش هەربەکفنەکەیانەوە بۆ ئەو سێبرایە هاتبێتنە دەرەوە!.

*　　*　　*

مامـــە پـــیرە لـــەنێو دوکانەکـــەی خـــۆی بەردەوامـــە لەگێڕانـــەوەی چـیرۆکەکەی، نێـو دوکانەکـە زۆر گەرمـەو پڕبـووە لەدوکـەڵ، دەرەوەش! ئـاخ بەمشەوە دەرەوە چەند ساردە! زستانی ١٩٩٤ ـە واتا کۆتایی ئەم ساڵەو ئەم ناوچەیەش پڕ بووە لەبەفر! گورگەکانی حاجی ئۆمەرانیش برسیو هارو دڕن! هەر ئەمشەو مەرگی عاشقێکیان پێیەو لەگەڵ پەلاماردا بەهەردوو گوندەکەی مـاڵی یـەعقوبو مریـەم-ی رادەگەیـەنن، سـوێ ئەخەنـە دڵـی هـەموو خـەڵکی ئاوایی.

مام حەمەد قادر// لەوە پێش شتی وامان نەدیبوو! بەمشـەوە تاریکـە جلـەکانیان سـپی بـوو! بۆیـە زۆر ترساین.

گەنجەکانی چـواردەوری پـیرەی دوکانـدار سەرسـامو حەپەسـاوبوون! هـەموو زەینـەکانیان گرتبـووە مـام حەمـەد قـادرو بـەدوای دوابەسـەرهاتدا ئەگەڕان! بەڵام زەینەکانی یەعقوب-ی گەنج دووبەشی لەیەکتر جیابوون، زیـاتر لـەنیوەی خـەیاڵی لـەلای مریـەم بـوو، بەمشـەوە سـاردە نێودوکانـە گەرمەکـەی بەجێهێشـتبووخۆی گەیانـدبووە گوندەکـەی مـاڵی مریـەم گیـان، لـەوی دەسـت لەملانێی ئەو کچە وردیلەیە بووبوو، کەمێکیش لەگەڵ گەنجەکانـدا لـەنێو ئـەم دوکانە پڕ لەدوکەڵە بەمام حەمەد قادر سەرقاڵ کردبوو.

*　　*　　*

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵیکی باریکتر،

## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

سێ برا بەجلی کوردی لەنێو گەلە عەرەبێك وەستاون! دوو کەلتووری جیا، دوو زمانی جیا، دوو ئەخلاقیەتی جیا، لەزۆربەی شتەکانی تریش هەرجیا، جیا، جیا بۆیە بەیەکتر نامۆن! تەنانەت لەئاییینیشدا ئێمە بەجیا لەئیسلام دائەنێن، بۆیە ئەو ئەنفالەی گوایە ئەبوایە ئەوان بۆ غەیرە ئیسلام بیانکردایە! نەوەی شمشێر بەدەستەکان لەساڵی ١٩٨٨ بەسەر ئێمەی کورددا هێنایان‌و دەستخۆشیشیان لەیەکتر کرد، بەشە غەنیمەو بەشە جاریەی خۆشیان دەستکەوت، ئەوەتا هەر بەگەیشتنی ئەو سێبرایە پێڵاوەکانیان لەپێ داکەندن نەوەکو لەهەڵێکدا رابکەن‌و لەدەستیان دەربازبن!

هەروەکو قەرزی باوکە پێپەتیەکانیان بەسەریانەوە بێت بۆیە لەراکردنیان ئەترسان.

هەروەکو لەخواییەوە نێچیریان بۆ رەوانەکرابێ‌و ئەوانیش حەڵاڵکردنیان لەسەربێت بۆیە لەراکردنیان ئەترسان.

هەروەکو لەهەواوە دەنگێکی زل پێی ووتبن (هؤلاء الاكراد لكم وكل مالديهم او في جيوبهم حلالٌ لكم) بۆیە لەراکردنیان ئەترسان.

هەروەکو الله هی ئەوان بێت‌و سێ براکەش بت پەرست بن‌و لەووشەی (خودا)ش تێنەگەن بۆیە لەراکردنیان ئەترسان.

هەرسێکیان بەدڵەلەرزە لەنێوانیاندا وەستاون، لەو هەموو دەنگ‌و هەرایەی ئەوان لەهیچ وشەیەك نەدەگەیشتن، تەنها واقیان وڕمابوو لەراکێش راکێشیان‌و پەلاماردانیان سەرسام بوون:-

*    *    *

**گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی لەنێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر**

مام حەمەد قادر// ئێمەش ئەوەندە تێك چوو بووین
نەماندەزانی سەیری کامەیان بکەین! زۆر شەوی‌ترو
تەنانەت بەرۆژیش بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتبووین بەڵام
شتی وامان نەدیبوو! ئەو هەموو کراس سپیە
مردوون یان زیندوو؟! لەمردووش نەدەچوون،
چونکە ئەوێ گۆڕستان نەبوو! پاشان مردوو بەم
شێوەیە هەڵسوو کەوت ناکات! ئێ‌ێ‌ێ‌ێ....خۆ
مردوو یەخەی زیندوو ناگرێ‌و دەمانچەی لێبسەنێ.

گەنجەکانیش بەدەم چاخواردنەوە حەپەساوی بەسەر دەموچاویانەوە دیار بوو! هەندێکیان بەزەیی بەمام حەمەد قادر ئەهاتەوە کەکابرایەکی پیرەو بێ‌کەسەو تائێستاش ژنی نەهێناوە، یەك دوانێکیان جگەرەیان بۆ دائەگیرساندو ڕێزی زۆریشیان لێ‌ئەگرت چونکە تاکە شوێنی کۆبوونەوەی گەنجانی ئەم ناوچەیە دوکانەکەی مام حەمەد قادری قسە خۆشە کەبەهۆی تەنیاییەوە ئەرکێکی زۆریشی لەسەرە.

مامە پیرە یەك لەدوای یەك دیمەنەکانی ئەو بەسەرهاتەی خۆی‌و هەردوو براکەی ئەهاتەوە بەرچاو، فرمێسك بەسەر ڕوومەتە چرچ‌و سیسەکانی ئەهاتە خوارەوە، لەنێوان سێ‌چوار ووشە حارێك لیکەکانی قووت ئەدایەوە بۆ تەڕکردنەوەی برینی ووشك بووی هەستەکانی، بەپشدێنەکەی فرمێسکەکانی ئەسڕیەوەو جارێکتر ئەیپێچایەوە لەپشتی، مامە پیرە بەردەوام لەگەڵ فرمێسك‌و هەنسك ئەژیا بۆیە نەیئەویست نەوە بخاتەوەو ئەوانیش لەخەم هەڵکێشێ.

مام حەمەد قادر// ئێمە لەقسەی ئەوان نەدەگەیشتین، (لەپڕ هاواری کرد) بەڵام وشەی (حەرامی) زۆر دووبارەیان دەکردەوە.........(هەناسەیەکی هەڵکێشا) لەدواییدا پرسیارم کرد ئەو ووشەیە مانای (دز)ە.

تاوێك بێدەنگی و سەرداخستنی مامەپیرە لەگەڵ رشتنی فرمێسکە بریسکەدارەکانی بەسەر ریشە سپیەکەی، هەموو گەنجەکانی سەرسام کردبوو، ئەوانیش بەدەم جگەرە کێشانەوە دوکانەکەیان پڕکردبوو لەدوکەڵ، چەند جارێکی تریش دەرگایان کردەوە بۆ پاك بوونەوەی هەوای دوکانەکەو هەناسەشیان.

گەنجەکان چاکتر خۆیان دەخزانده نێو جێگەو گونیە پڕلە کەلوپەلەکانی دوکانەکە بۆ زیاتر گوێ گرتنیان لەمام حەمەد قادری قسەخۆش، ئەوانەی جگەرە کێش نەبوون بەردەوام دەستیان گرتبوو بەدەمو لوتیانو کەمێکیش لەدووری گەنجە جگەرە خۆرەکان دانیشتبوونو لەوێوە بەرامبەر پیرەی داخ لەدڵو بێکەس گوێیان هەڵخستبوو بۆ بەسەرهاتەکان.

*　*　*

لە (<u>شیعرە تابلۆ</u>)ی ئەم ژوارنە گورگەدا:-

**یەکەم شیعرە تابلۆ**

لەو ژوورە گەرمەی خواردوویەتی پەنگ،
مامە پیرەمان ئەگـــری بەبێ دەنگ،
دەنکە فرمێسـکی شەفاف و بێ رەنگ،
ریزیان بەسـتووە بۆ نێو ریشی تەنگ.

* * *

گەنجانی هاورێی بێ هەست و بێ سەنگ،
بۆ سـەرگوزشـتەی مامە پیرەی مەنگ،
گوێیان گـــرتووە بەبێ لارولەنگ،
پیرەی ریش سـپی تانەبێ دڵتەنگ.

* * *

لەدەریای خەیاڵ بەوێنەی نەهـەنگ،
دڵـدار نوقم بوو بۆ کـچی شۆخ وشەنگ،
ئارەزووی ماچی سـەرماو شـەوەزەنگ،
بۆ هەلاڵەی لێو ئەفرێ وەکـــو هەنگ.

* * *

لەکاتی گریان و بێدەنگی مام حەمەد قادر-دا هەلێکی باش بوو بەیادی ژوانەکانی زستانی پێشوو بۆ دووبارە هەڵفرینی خەیاڵەکانی یەعقوب-ی گەنج بۆ گوندەکەی ماڵی مریەم و بینینی چاوە رەشەکانی ئەو نازدارە عەیارە.

* * *

**جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر،**

**دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........**

**کات**

**شەوە....سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٩٤ـە**

**خەیاڵەکانی یەعقوب لەنێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر**

**ئەگەڕێتەوە بۆ زستانی رابردووی نێو باوەشی مریەم..**

ئەم گەنجە عاشقە لەبێدەنگی مام حەمەد قادرو هاوڕێکانی بۆی رەخساو بۆی لوا بچێتە خەڵوەتی خەیاڵو لەم ژوورە گەرمەدا بەیادی ماچەکانی زستانی رابردوو دەم بتەقێنێ، ئیتر هێزی بەرەنگاری و رێگەگرتنی خەیاڵی نەما بۆیە لەشەقەی باڵیداو فڕی....ئەوەندەی نەبرد گەیشتە گوندەکەی ماڵی دولبەر، لەوێ بەسووکی دابەزی و بەرەو دوکانەکەی مام خدری باوکی مراوی گیان رۆیشت، دواتر هێدی هێدی ئەهاتەوە بەرچاوی کەلەزۆربەی ژوانەکاندا ماچی چاوەکانی دولبەرد وردیلەکەی دەکردو....لەیەکێ لەژوانەکان لەگەڵ مریەم-دا وەستابوو:-

یەعقوب// مراوی گیان بەقوربانی چاوەکانت بم،

چاوە رەشەکانت لەترێ رەشکەی لای خۆمان ئەچێ.

خوشکە شێتەش بەووشەی مراوی شێت ئەبوو، بەتوڕەبوونێکی لەناز هەڵکێشراو وەکو ژوانەکانی پێشوو پەلاماری یەعقوب-ی دایەوەو سەرو قژی راکێشاو چەند مشتە کوڵەیەکی خزاندە نێو دەمولێوی و بەچنگەکانی جلەکانی شل وشێواند:-

مریەم// حەیوان....چەندجار پێموتی پێم مەڵێ

مراوی (دووبارە کەوتەوە لێدانی یەعقوب).

ئەویش لەگەڵ هەموو لێدانێکی دەستە بچکۆلانەکەی ئەو کچە لادێییە دەستێ گۆشت و بستێ باڵای ئەکرد، لەو ژوانە شەوەدا لەبەر پێکەنین هێزی نیە دەستەکانی مریەم بگرێ و خۆی بپارێزێ بۆیە بەپێکەنینەوە بەسەر بانگی ترێ دەکات کەبێت یارمەتی بدات.

یەعقوب// (بەپێکەنینەوە) ترێ گیان، وەرە، دەوەرە ئەو مراویە شێتەم لێدوورخەرەوە.

مراوی گیانیش دوای ئەوەی شێتیشی پێوەئەنووسێ ئەوەندەیتر بەنازە کچێنیەکەی باری ئەو گەنجە لادێیە قورس دەکات، ئەوەندەیتر مشتەکۆڵەو شەپازللەی تێئەسرەوێنێ و هەربەو پەلامارەوە هاوار ئەکات بەسەریدا:-

مریـــەم// هـــەی حـــەیوان مـــراویم و شێتیشـــم!؟ ها؟!....(دووبارە دەست ئەکاتەوە بەلێدانی).

ئەو گەنجە شێتەش لەخۆشیا هەرپێئەکەنێ، چونکە نەك ووشەی حەیوان لێدانەکەشی بەلاوە خۆشە، ئەوەتا لەنێو دوکانەکەی مامە گیان دانیشتووە، یەك یەك وێنەکانی مریەم گیانی لەبەرچاوە، وردە وردە لقە جوڵەکانی خوشکە مراوی لەبەرچاوی ئەم گەنجە کاڵتر ئەبنەوەو کۆڕی نێودوکانەکەی مام حەمەد قادر سات لەدوای سات تۆختر ئەبێت و کلۆزیش لەسەر دەموچاوی یەعقوبە، دواتر سکرینی روئیا ئەچێتە قووڵایی و سەرجەم دانیشتووی نێو ئەم دوکانە دەرئەکەون، لەگەڵ سەر هەڵبڕین و قسەی مام حەمەد قادر-دا هەستە فریوەکانی یەعقوب ئەگەڕێتەوە بۆ نێو ئەم دوکانە.

* * *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی لەنێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر

مام حەمەد قادر// (سەری هەڵبڕی بەگریانەوە) ئەوان ئێمەیان بەدز ئەزانی! وایان ئەزانی ئێمەش وەکو ئەوان چووین بۆ تالانی.

دوای سەرلەنوێ سەیرکردن و گوێگرتن بۆ مامە پیرە کەمێك شپرزەیی پێوەدیارە، بۆ رازیکردنی دڵی پیرەی چیرۆکڤان لەخۆیەوە قسەیەك ئەکات نەبادا هەستیان بە غەیب بوونیی کردبێت! بۆیە بەپرسیارێك خۆی تێهەڵکێشی بەسەرهاتەکانی ئەو پیاوە پیرە ئەکات:-

یەعقوب// مام حەمەد قادر ئەوان بۆ تالانی هاتبوون؟!

مام حەمەد قادر// کوڕم ئەو عەرەبانە لەساڵی ١٩٦٣ بەڕڕەوە ئەهاتن بۆ تالانکردنی کوردستان! بەخوا منالی سەربێشکەشیان لێمان کوشتووە! لەزۆربەی کوردستان بلاو بووبونەوەو تالانیان دەکرد.

* * *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێلێکی باریکتر، دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

بەمشەوە درەنگە عەرەبەکان لەناوەڕاستی خێمەکانیان هەرسێ براکوردەکەیان لەنێوان خۆیان دانا! جارجارەش ئازاریان ئەدان و سووکایەتیشیان پێئەکردن! پیاوە عەرەبەکان بەدیار چەند ئاگرێکی گەورەوە دانیشتبوون، جگەرەیان ئەکێشا، گۆشتی برژاوی سەر ئاگرەکەیان ئەخوارد، عەرەبەکان زۆر بەتوندی مامەڵە لەگەڵ ئەو سێ برایە ئەکەن، دەست ئەبەن بۆ باخەڵیان چەند پارەیەکی کەمیان پێ ئەبێ هەموویان لێوەرئەگرن،

براگەورەکـــەیان ســـەعاتێکی لەدەســـتدایە ئەویشـــی لێـــوەردەگرن، هـــەرزوو لەسـەرەتاوە دەمانچـەکەیان لـەبرا گەورەکـە سـەندووە، مشـت ومڕێکی زۆریـش لەنێوانیاندا هەبوو لەسـەر کێبەرکێ بۆ ئـەو تاکـە دەمانچەیە، بـەڵام سـێبراکە لـەزمانی عـەرەبی نەدەگەیشـتن بۆیـە بەچـاوێکی ئەبڵـەق سـەیری ئـەمو ئـەویان دەکرد.

عەرەبەکان لەنێو خۆیانا دەنگە دەنگێکی زۆیانەو زۆریش هاوار ئەکەن بەسـەر ئـەو سـێبرایە، بـەڵام ئـەوان هـیچ نـاڵێن چـونکە لـەهیچ ووشـەیەك ناگـەن تاوەڵامیان بدەنەوە یان شتێك بڵێن، تەنها ئەوەنـەبێ کـەمام حەمـەد قـادر چـەند ووشـەیەکی وەکـو(حـەرامیو ئـەحنا ئەلبـەدوو وێنـە ئەلعـەدو)ی لەبـەرکردبوو چونکە ئـەو کـراس درێژانـە چـەند جارێك ئـەم ووشـانەیان دووبـارەو هـەزاربارە ئەکردەوە.

* * *

مـام حەمـەد قـادر ئـەڵی مـن لـەهیچ ووشـەیە نەدەگەیشـتم، تـەنها ئـەوەم لەبیرە کەدەهاتنە پێشەوە بۆمانو زۆریش هاواریان دەکر بەسـەرماندا، زۆریـش پەنجەیان بۆ رادەوەشاندین، جاری واهەبوو ئەوەندە پەنجەیان لەچاومان نزیـك دەکردەوە ئەگەر دوور نەکەوتینایەوە لەوانە بوو ئەزێتی چاومان بدەن.

وەکـو راڤـەکردنێك بـۆ بەسـەرهاتەکانی مـام حەمـەد قـادر، مـن وەکـو نووسـەرێك ئـەڵێم ئـەو کـراس سـپیە درێژانـە بـەهۆی زۆری ژمارەیـانو توانـای زۆریان بەسەر ئەو سـێ برایـە، جۆرێـك لـەخۆ بـەزل زانـین، خـۆ بـەتواناتر زانـین، خۆ بەپلە یـەك زانـین گوایـە ئـەوان خـاوەنی زمـانی قورئـانن، لەسـەرووی هـەموو ئەمانـە دەسـەڵاتی میری ئەوکاتـەش بەشـێوەیەکی ناشـیرینو دڕنـدە کوردی بـە هاووڵاتیەکانی خۆی ناساندبوو، ئـەو جـۆرە بیرکردنەوانـە وای لێکردبـوون لـەو

ساڵەدا لە١٩٦٣دا هێرش بێنن بۆ کوردستان و بەوپەڕی قەناعەتەوە غەنیمەو سەرانە لەکورد بسەنن و حەلاڵیشی بکەن.

دوای سوکایەتی پێکردنیان، دوای لێدانێکی چاکیان لەسەر ئەرزەکە پاڵیان ئەخەن! تاکو درەنگی شەو بەم شێوەیە ئەیانهێڵنەوە، کراس سپیەکان لەدوای نیوە شەو لەنزیک ئەو شوێنە سێ چاڵ لێئەدەن! ئەو پیاوە پێپەتیانە چونکە ژمارەیان زۆر بوو ئەوەندەی نەبرد چاڵەکان تەواوبوون.

مام حەمەد قادر ئەڵێ ئێمەیان بەدیار ئەو سێ چاڵە دانابوو، تاکو نیوەشەو سوکایەتیان پێکردین، جارجار بەدەم قسەکردنی خۆیان و بەدەم گاڵتە پێکردن بەئێمە، ئاماژەیان بۆ چاڵەکان دەکرد، دواتر پەنجەیان بۆ ئێمە درێژ دەکردو ئاماژەیان بۆسەر ملی خۆیان ئەکرد، وامان ئەزانی بەمانای ئەوەیە کەسەرمان دەبڕن! زۆر ترساین! برابچووکەکەم زۆر گریا، بەلاّم نەماندەزانی مەبەستیانە چیەو؟! چۆن تووشی ئەو کارەساتەش بووین، هەرچەندە پیاوەکان لەکاتی دانیشتنیاندا بەهەردوو پەنجەی دۆشاو مژە وەك ئاماژەکردنێك بۆ هەردوو گوێچکەی دڕندەیەك بەرزیان دەکردنەوەو بەدەمیش ئاماژەیان بۆ قەپگرتن دەکردو گاڵتەیان بەئێمە دەکرد، بەلاّم ئێمە بەهۆی شپرزە بون و ترسمان نەماندەزانی مەبەستیان پەلاماردانی چ جۆرە ئاژەڵێکە؟!

کات دوای نیوەشەوە، چاڵەکانیش ئامادەن، عەرەبەکان سەیری سەعاتی دەستیان دەکەن و هەڵئەستنەوە، هەندێکیان لەسەر چاڵەکان ئەوەستن و قسە ئەکەن لەگەڵ ئەوانی‌تر، بەگۆتەی مام حەمەد قادر ئەڵێ من لەقسەکانیان نەدەگەیشتم کەچیان وتووە؟! بەلاّم من وەك نووسەری ئەم دەقە لەپرۆسەی نەخشەسازی دارشتندا وای دائەنێم:-

چەند عەرەبێك// ئێستا کاتی نیوەشەوەو کاتی ئەوە
هاتووە بیانخەینە ناو چاڵەکان.

خێڵـی پێپـەتی سـێ براکـە رائەکێشـنە ئـەوێ، هەریەکـەیان ئەخەنـە چاڵێك‌و تەنها سەرو ملیان بەدەرەوە ئەمێنێ! زۆر بەچاکی خۆڵی چواردەوریان بەلەقە ئەپەستنەوەو تونـد لەئەرزەکە گیریـان دەکـەن، دواتـر هەرهـەموو پیـاوە کـراس درێــژەکان چـەکەکانیان بــەرز دەکەنــەوەو یــەك بــەدوای یــەکتر بەچـواردەوریان ئەسـوڕێنەوەو هـاوار دەکـەن {احنـا البـدو، ویـن العـدو}، بەمشــەوە تــەپوتۆزی قاچـیان بەخەسـتی ئەچـوو بەسـەر دەم‌وچـاوی ئـەو سێ‌برایەو ئەوانیش لەیەك ووشە نەدەگەیشتن، تاوێك بەم شێوەیە بەدەوریان سوڕانەوە تاماندوو بوون، دواتر یەك یەك‌و دوو دوو ئەهاتن دائەنیشتن.

لەسـەگ وەڕەکـە تـەواو بـوون کەئـەوان پێـی ئـەڵێن (هۆسـە)، هـەمووی هــاتن بەچــەکەوە بــەدیار ئــەو ســێ بــرا لەچــاڵ نراوانــە دانیشــتن، ئافرەتــە پێ‌پەتیەکانیشــیان خـــەریکی کۆکردنـــەوەی کەل‌وپـــەل بـــوون، وردە وردە شـت‌ومەکەکانیان خسـتە سـەر پشـتی وشـترەکانیان، یـەك دوو ئەسپیشـیان لەگەڵـدابوو وچـەند فەردەیـەکیان خسـتە سـەر پشـتیان، هـەموو شـتێکی رۆیشتنیان ئامادە کرد، پیاوەکانیش بەدیار ئـەو سێ برا لەئـەرز نـوقم بووە دانیشتن‌و خـەریکی برژاندن‌و خواردنی گۆشتی ئـەو مەڕانـە بـوون کەلـەتالانی گوندە کوردنشینەکان دەستیان کەوتبوو.

ژنــە قــاچ زلەکانیشــیان ئــەهاتن بــۆ لایــان‌و چــەند خواردنێکیــان لـەپیاوەکانیان وەردەگـرت دواتـر ئەگەڕانـەوە بـۆلای مناڵـەکانیان کەلـەولاتر دانیشـتبوون‌و بەیەکـەوە ئـەیانخوارد، گوایـە میـوانی غـەریبیان هەیـەو ژنـەکان نزیکی ئەوێ ناکەون بۆیە بەم شێوەیە دوورکەوتبوونەوە.

هەرسێ برا تـەواو سەرسام بووبوون! ئەوکاتـە مام حەمـەد قادر گـەنج بوو بەڵام بەزەیی بەبرا بچووکەکەی ئەهاتـەوە کەلـەولای بـرا گـەورەکـەی لەئـەرز

چەقێندرابوو! زۆر دڵیشی لەلای برا گەورەکەی بوو! هەرچەند سەیری خۆیو براکانیی و ئەوعەرەبانەی دەکرد! سەرسامی تیایدا پەنگی دەخواردەوە.

مام حەمەد قادر ئەوەندە سەرسام بووبوو باوەڕی بەم دیمەنە نەدەکرد! باوەڕی بەم شەوە نەدەکرد! باوەڕی بە وونبوونی لەشی خۆیو براکانی نەدەکرد! باوەڕی بەو سێ سەرە نەدەکرد! سەری خۆی لەعەرەبەکان نزیکتر بوو! بۆیە ئەو کراس سپیانە دوای ڕنینەوەی ئێسقانەکانی بەردەستیان ئەیانگرتە دەمو چاوی مام حەمەد قادر! بەم شێوەیەو بەدەم گۆشتخواردن شەویان بەکێش کرد تابەرەبەیان.

*　*　*

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی لەنێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر

شەو درەنگە، یەعقوب لەنێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر سەیری سەعاتەکەی دەستی کرد نزیکی نیوەی شەوە، سەری هەڵبڕی سەیری دەمی مامەی دوکانداری کرد لەکاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانیدا، دەنکە فرمێسکەکانی سەر ڕوومەتی مامە پیرەش بچووک بوونەتەوە....ئەو گەنجە عاشقەش خەیاڵە بچووکەکانی یەك لەدوای یەك بەئاسماندا هەڵئەداو بەرەو دێکەی ماڵی مریەم شەوگاریان ئەگرتو لەوێ چەند جارێك ئەسوڕانەوە بەبێ ئاکامو بەبێ دەستکەوتنی ماچێك، بەبێ هەڵمژینی بۆنە خۆشەکانی سنگو مەمکی مریەم، بەبێ گەڕانی دەستو پەنجەکانی یەعقوب بەناو سەرو قژی دڵدارەکەیدا هەربەکزی ئەگەڕانەوە بۆ نێو دوکانەکەو تێکەڵ بەقسەکانی مام حەمەد قادر ئەبووەوە.

لەزستانی پارەوە یەعقوب دەستی بەردەستی مریەم نەکەوتووە، ئەم ساڵ کە ١٩٩٤ـە سێجار یەکتریان بینیوە، یەکەمیان لەبەهاردا یەعقوب خۆی

گەیاندبووە گوندەکەی ماڵی ئەو دولبەرە لەوێ لەنێو هەڵپەڕکێدا چاویان بڕیبووە چاوی یەکترو کەمێکیش بەتەنیشت یەکەوە هەڵپەڕین، دووەم جار لەهاویندا دوای گەڕانەوەی یەعقوب و باوکی و هێنانەوەی تەرمی کامەرانی برای کەلەناوچەی کفری گورگ خواردبووی! وەکو خەڵکی ناوچەکە ماڵی مریەم-یش هاتبوون بۆ پرسەو سەرخۆش بۆ ماڵی مەلا عەلی، یەعقوب-یش لەدوورەوە لەنێو قەرەباڵغی ژناندا مریەم-ی بینی، دوور بەدوور نیگایان ئەگۆڕیەوە، بەڵام کاتەکەی پڕبوو لەتراژیدیای مەرگ بۆیە غەزەل هیچ کاریگەریەکی نەبوو، لەگەڵ ڕۆیشتنەوەیاندا دولبەریش خۆی پێچایەوەو ڕۆیشت، سێیەمیش لەپاییزی ئەمساڵدا جارێکی‌تریش ماڵی مریەم هاتبوون بۆلای ئایشێ خانی دایکی یەعقوب بۆ جارێکی‌تریش سەرەخۆشی لەوپیرەژنە جەرگ سووتاوە چونکە لەچوار کوڕ تەنها یەعقوب-ی بۆ ماوەتەوە.

ئەوەتا چەند مانگێکە حوزنی برامردن و دووری دولبەر دڵی یەعقوب-یان داگیر کردووە، ئێستاش کۆتایی هەمان ساڵەو وەرزەکەشی زستانە، یەعقوب-یش ئەمشەو لەدوکانەکەی مام حەمەد قادر خۆی سازو ئامادەکردووە بۆئەوەی سەرلەنوێ ئاوێزانی مریەم-ی بەناز ببێتەوە، بۆئەوەی سەرلەنوێ وەکو زستانی پێشووتر بەدولبەرە ناسکەکەی شاد بێتەوە، سەرلەنوێ چاوەکانی ترێ ماچ بکات و شووشە عەترەکەی بەدیاری بۆ بەرێت کەنزیکەی ساڵێکە بەڵێنی پێیداوەو ئەو کچە منداڵەش هەرچاوەڕێیە.

یەعقوب لەنێو ئەم دوکانە دانیشتووە، وێڕای نقوم بوونی لەنێو دووکەڵدا پەیتا پەیتا سەیری مام حەمەد قادر دەکات، ساتێك بەبێدەنگی نێو دوکانەکە دەردەکەوێ و گەنجەکانیش سەرقاڵی گوێگرتنن بۆ مامە پیرەی قسە خۆش.

*　　*　　*

هێلی گشتی بەردەوامە........

کات

نیوە شەو نزیکە

سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٩٤ـە

لەنێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر

لەوشەوەدا مامە پیرە هەرهەموو بەسەرهاتەکانی خۆی خستە زەینی یەعقوب و گەنجەکانیتر، لەسەرەتای بەیەکەوە ژیانیان لەگەڵ دایك و باوکیاندا تامردنیان، تاکۆتایی ژیانە سەختەکەیان، تاڕزگار بوونیان لەکەم دەرامەتی، تائەو شەوەی هەرسێ برا لەلایەن عەرەبە بەدووەکانەوە خرانە ناو چاڵ و بۆ بەیانی گورگ –یان بۆ هاتوو بەئەعجووبەی زەمان ڕزگاری بوو، ئەوەتا لەم گوندەی خۆیان بووە بەمامە پیرەی دوکاندار.

لەو شەوەدا مام حەمەد قادر زۆر گریا، زۆر فرمێسکی هەڵڕشت، زۆر هەنسکی خواردەوە، زۆربەی گەنجەکانیش بۆ کەساسی ئەو مامە پیرەیە گریان، یەعقوب–ی خۆشمان هیچی لەوان کەمتر نەبوو، ئەویش وەکو ئەوان گریانی دەخواردەوە بۆ دووبرا گورگ خواردووەکەی خۆی و بۆ لەناوچوونی یوسفی براشی، سێ کارەساتی زۆر بەسوێ بوون، هەروەها خەمی دووری مەریەم–یش سەرباری هەموو خەمەکانیتر بوو، زۆریش دڵی بەمام حەمەد قادرو هەردوو برا نامورادەکەی دەسوتاو بەزەیی پیایانا دەهاتەوە.

یەعقوب چیتر بەرگەی چاوەڕوانی ناگرێ، لەگەڵ ئازارەکانی پیرەی ریش سپی ئەژی، لەگەڵ هەناسە پەنگخواردووەکەی نێو ئازاری چاوەڕوانیدا ئەژی، بیریش لەباوکە پیرەکەی ئەکاتەوە کەبەم شەوە لەنێو مەڕەکاندا لەترسی گورگ تابەیانی ناخەوێ، بەلایەوە ئاساییە ئەمشەویش لەجیاتی باوکی ئێشك

بگرێ، بەڵام نزیکەیساڵێکە مریەم-ی نەدیوەو ئەمشەو یەکەمجارە لەدووەمین وەرزی ژوانیاندا، هەرئەویش بەرگەی ئازاری ئەم دووریە ئەگرێت.

دوای تەواو بوونی مام حەمەد قادر لەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکانیدا، وێڕای خۆی هەموو گەنجەکانیشی خستبووە گریان، چەند خولەکێك بەبێ‌دەنگی غەرقی گریان بوون‌و هەریەك بەجۆرێك فرمێسکەکانی ئەسڕی، هەندێ لەجحێڵەکان لەکاتی پاککردنەوەی روومەتەکانیان شوێنی سڕینەوەیان لەچڵك داماڵدرابوو وسوورێکی تەڕی ئەنواند.

وردە وردە کات لەنیوەشەو نزیك دەبێتەوە، ئەبێ یەعقوب خۆی لەو کۆڕەی مام حەمەد قادر دەربازبکات‌و بگاتە گوندەکەی ماڵی دولبەر، هەرچی داخ‌وکەسەری چاوەڕوانی هەیە هەرهەمووی لەساتەوەختی بونکردنی سنگ‌و مەمانی مریەم بەباکات‌و تاسەی دووری بشکێنێت، دواتر تێرتێر لەباوەشی مریەم شەحن بێتەوە، ئەم گەنجە وانیازیەتی ئەم زستانەش وەکو ئەوەی پێشوو لەشەوژوانەکانی مریەم تەواوبکات، ئەوەتا ئەمشەو ئامادەیە بۆیەکەم ژوان لەدووەم وەرزەژواندا.

ئاخ بۆ دڵی هەرزەکار بۆ گەیشتن بەدولبەرەکەی هەرچەند سەرماو سۆڵەی زستان هەیە ئەیچێژێ، هەرچەند شاخ‌وداخ هەیە ئەیبڕێ، چەندین شەونخونی ئەکات لەپێناوی حەزێکی شێت، لەپێناو داخوڕپاندنی دڵێکی پڕ لەئازار لەکاتی ماچ کردنی دەست‌و پەنجە خەناویەکەی ئەو دولبەرە چاوڕەش‌و عەیارە.

*   *   *

هێلی گشتی بەردەوامە........

کات

نیوە شەو زۆر نزیکە

سەرەتای زستانی سالی ١٩٩٤ـە

لە گوندەکەی مالی یەعقوب

یەعقوب لەدوکانەکەی مام حەمەد قادر بەدوو دلی لەنێو هاورێکانی دانیشتووە، ئەیەوێ یارمەتی وەربگرێو بڕاوت بۆ مالەوەو تالەوێ سەرێکی دایكو خوشکە خەولێکەوتووەکەی بداتو کەمێکیش بچێتە لای باوکە پیرەکەی، کەلەسەلامەتی ئەو خێزانە بچکۆلانەی خۆی دلنیابوو سەرلەنوێ خۆی بپێچێتەوەو بەم سەرماوسۆلەو بەفرانبارە رێگای ژوانی مریەم گیان بگرێتەبەر.

یەعقوب// (لەنێو دوکانەکەی مامە پیرە هەلئەسێتەوە بۆ مالئاوایی کردن) بەیارمەتی خۆتان من ئەبێ بڕۆم.

مام حەمەد قادر// خوا حافیزت بێ کوڕی خۆم.

- خوات لەگەل بێت.
- خوا خافیز.
- شەوێکی شاد.
- خوا حافیز.

ئەویش کوڕەکەی ئەم دوکانە بەجێ ئەهێلێو بەمشەوە ساردە دێتە دەرێ، دوکەلو روونـاکی لەگەل کردنەوەی دەرگاکە خۆیان ئەخەنە بەر باوبارانەکە، ئەویش پالتۆی لەبەردانیە بۆیە سەروملی خۆی گرمۆلە ئەکاتو بەپەلە رائەکات بەرەو مالەوە، لەبەردەرگا سەرێکی باوکە پیرەکەی ئەدات کەلە

خانەی مەڕەکاندا لەنێو پاڵتۆ ئەستورەکەدا ئێشکگری ئەمشەوە بۆ پاراستنی ماڵاتەکانیان لەگورگە برسیەکانی ئەم زستانە.

یەعقوب وردە وردە ئەچێتە ژوورەوە بۆلای باوکی کەلەناو تاریکی ژوورەکە وەئاگایە، باوکی بەهاتنە ژوورەوەی کوڕەکەی کۆکەیەکی بۆ ئەکات وەك نهێنیەکی نێو لادێکانی کوردستان بەواتا من وەئاگامو ئەوەتا لێرەم، یەعقوب-یش لەگەڵ کۆکەکەی باوکی بزەیەك ئەپەڕێتە لێوانیو بەخۆشەویستیەوە لەباوکی ئەپرسێ:-

یەعقوب// بابە گیان سەرمات نیە؟

مەلا عەلی// نا کوڕم....ئەوە هەتائێستا لەدوکانەکەی حەمەد قادر بوویت؟

یەعقوب// (سەیرێکی باوکە پیرەکەی ئەکاتو بەزەیی پیادێتەوە چونکە دووکوڕی گورگ خواردوو بووەو کوڕە گەورەکەشی حکومەتی بەعس لەناویبردوە، ڕەحمو خۆشەویستی بەسەر دەموچاوی یەعقوب دیارە کە بۆ باوکەکەی بەپەرۆشەو بەسەر وەڵامی ئەداتەوە) ئم....باوکە گیان بێتاقەتی؟

مەلا عەلی// (قووت ئەبێتەوە وەك ئەوەی بڵێی هێشتا گەنجم) ناکوڕم....بڕۆ ژوورەوە باسەرمات نەبێ!

یەعقوب// قەیناکات بابە گیان....حەز ئەکەم کەمێك لەلات بوەستم.

* * *

یەعقوب درۆ لەگەڵ باوکی ناکات، بەراستی خۆشی ئەوێو هەواڵی ئەمشەوە ساردەی لێئەپرسێ، ئەیەوێ لەخۆشیو ناخۆشی ئەمشەوی باوکی

دڵنیا بێت، بۆیە کەمێکیتر لەو ژوورە تاریکەی مەڕەکان لەلای باوکی ئەوەستێو دووبارە پرسیاری لێدەکات:-

یەعقوب// بابە گیان حەزدەکەم بچیتە ژوورەوەو بخەویت، با ئەمشەو پشوویەك بدەیت.

مەلا عەلی// نا کوڕم دوێنێ شەو تۆ لێرە بوویت، ئەمشەو نۆرەی منە، چۆن دڵم ئەهێڵێت ئەمشەویش تۆ پاسەوانی ئەم مەڕانە بکەیت....بڕۆ ژوورەوە لای دایکتو خوشکت بخەوە....دەی کوڕم مەوەستە باسەرمات نەبێ.

یەعقوب بەدەم رستەی (بەڵی بابە گیان) وردە وردە ژوورەکەی بەجێ ئەهێڵێو بەرەو ماڵەوە ئەڕوات، بەڵام زۆریش دڵی لای باوکیەتی.

*        *        *

هێڵی گشتی بەردەوامە........

کات

نیوە شەو زۆر زۆر نزیکە

سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٩٤ـە

لەگوندەکەی ماڵی مریەم

لەدێکەی ئەودیودا....

خەڵکەکەی راکشاوی نێو جێگەن، لەمریەمو ترێ زیاتر کەس چاوەڕێی کەس ناکات، مریەم چاوەڕوانەو ترێش کەمێك چاو گەرم دەکاتو سەرخەوێك دەشکێنێ، رەنگە چەند شوانێکیان تابەیانی وەئاگابن بەڵام هیچیان لەسەر هێڵی گشتی دەقە ئەدەبیەکەی ئێمەدا نین، تەنانەت وابەستەی بەسەرهاتە لقیەکانیش نین بۆیە بەهیچ جۆرێك ناچم بەلایانداو باسیشیان ناکەمو چ کارم پێیان نیە.

هەرلەم دێیەو بەمشەوە لەماڵی مام خدری دوکاندار خوشکە مراوی بێدارەو چاوڕوانی یەعقوب-ی دڵداری ئەکات تائەونازو فیزەی کەماوەی ساڵێکە خەریکی کۆکردنەوەیەتی بیخاتە کۆڵی ئەو گەنجە ووڕوکاسە، نازەکانی ئەو کچە لادێییە زۆر خەست بوونەتەوە....ماوەی ساڵێکە کەس بۆی هەڵنەگرتووەو چاوەڕوانی حەماڵەکەی ئەکات ئەمشەو بگاتەجێ، ترێی خوشکیشی سەرخەوێکی نەرمی شکاندووە، مریەم لەو ژوورە نیمچە روناکەدا بەتەنها لەناو جێگەکەی دانیشتووە، ئەگەر درزی دەرگا دارەکە نەبێت هەوای بۆ نایێتە ژوورەوە، هەروەها بەبێ ئەم درزانە لەبەیانیانیشدا روناکی سەربەفری حەوشەکەشیانی بۆ نایەتە ژووری.

دوای کەمێك بێدەنگی....

مریەم سەیرێکی خوشکە بچکۆلەکەی ئەکات، خۆشی بریسکەی چاوەکانی دێت و میقدارێکی زۆریش عەیاری تیا شاردۆتەوە، تریێ هەربەپێکەنینە وردیلەکەی خەبەری ئەبێتەوە یەکسەر دەست دەکاتە ملی مریەم و رایئەکێشێتە نێو جێگاو تێر تێر ئەو دوو خوشکە یەکتری ماچ ئەکەن، دواتر تریێ هەواڵی نەخەوتنی لێئەپرسێ و حەزی دەکرد ئەویش وەکو خۆی سەرخەوێکی بشکاندایە بەڵام مریەم دەست دەکاتە ملی تریێ:-

مریەم// تریێ گیان دڵم نایەت بخەوم....چاوەڕوانی ئەو شێتەم.

تریێ// (بەپێکەنینەوە) وەرە بخەوە....وەڵڵاهی کەهات خۆم پێت ئەڵێم.

مریەم هەرلەناو جێگەکەوە دووبارەو چەندین بارە تریێی خوشکی ماچ ئەکات و دەست ئەکاتە ملی، بەو پێکەنینەوە لەتریێ ئەگەیەنێ کەنایەوێ بخەوێ، کەنایەوێ بێئاگا بێ، کەنایەوێ جگە لەچاوەڕوانی هیچیتر بکات.

مریەم// تریێ گیان خەوی چی؟! هێشتا ئەو شێتە لەوێ بەڕێنەکەوتووە، ئێستا سەرەتای چاوەڕوانیە، (بەپێکەنینەوە) تۆ دەمێکە خەوتووی، ئەگەر یەعقوب هات ئەبێ من خەبەرت بکەمەوە.

ئەو دوو خوشکە لەو شەوە ساردەدا لەسەر جێگا گەرمەکەیان لەژوورێکی لەقوڕ دروستکراودا بەدیار چرایەکەوە دانیشتوون و بەچاوەکانیان خۆشەویستی لەگەڵ یەکتر ئەگۆڕنەوە، خوشکە گەورەکەی لەساتێکدا سەدجار بەقوربانی تریێی ژیکەڵە ئەبێت، ئەو کچە بچکۆلەیەش:-

تریێ// منیش بەقوربانت بم، بەقوربانی کاکە یەعقوب-یش بم.

مریەم// وەیش تریَ گیان ناوی یەعقوب-ت هێنا، منیش بەقوربانی ئەبم، بەقوربانی دەستو پێ تەزیوەکەشی ئەبم، بەمشەوە سارده بۆ من دێتە دەرەوە.

تریَ// مریەم گیان....ئێستا دەرچووە؟!

مریەم// (هەردوو دەستی خستۆتە سەرسنگی خۆی، وەك لەچاوەڕوانی بێت وایە) رەنگە ئێستا لەماڵ دەرچووبێ....وەیش بەقوربانی بم.

تریَ بەپێکەنینەوە سەرسام بووە سەیری خوشکە گەورەکەی ئەکات چۆتە خەیاڵو ئەوەندەیتر ئەحەپەسێ! بەدیار ئەو چرایەوە دانیشتوون، دووکەڵە رەشەکەی ژوورەوە بەکوونە لوتی هەردووکیانەوە دیارە، تریَ دوای تێرامان لەخوشکە واقووڕماوەکەی، بەبێ دەنگی تێرتێر پێئەکەنێو دەست ئەگرێ بەدەمی خۆیو دەستەکەیتر درێژ ئەکات بۆ لووتی مریەم، مریەمیش بەپێکەنینو واقوڕماویەوە تێکەڵاوی پێکەنینەکەی تریَ ئەبێو....:-

مریەم// (بەنەرمە پێکەنینێکەوە) وەیش تریَ گیان بەقوربانت بم....ئەوە بەچی پێئەکەنی؟

تریَ// (نوقمی پێکەنین بووە) سەیری لوتی خۆت کردووە؟! بەدووکەڵ رەش بووە.

مریەم// (یەکسەر بەبێ دواکەوتن سەیری لووتی تریَ ئەکاتو نەرمە قاقا لێئەدات).

تریَ// (کەمێك گرژو مۆن ئەبێت) ئەوە تۆ بەچی پێئەکەنیت؟!

مریـەم-یـش باوەشـی پیائـەکاتو بەسـاقەو بـەقوربانی ئـەبێت، تونـد ئـەیگرێو ماچـی ئـەکات، بـەدەم سڕینی لووتـە بچکۆلەکەی دووبارەو دەبـارە ماچـی ئـەکاتو نازەکـانی ئەکێشـێ، چونکە بـراو خوشـکی‌تری نیـە تـەنها ئـەو تاقە خوشکە شك ئەباتو هیچی تر:-

مریـەم// قندیلـە گیـان بـەقوربانت بم، چۆن پێناکـەنم!

تۆ لووتی خۆتت دیوە هەمووی ڕەشیە؟!

ترێ یەکسەر تێئەگات....ئەمجارە هەردووکیان بەجووتە دەست ئەکەن بەپێکەنینو تاوێك نەرمە مەلەی نێو خۆشـی ئـەکـەن، دواتـر بیریـان ئەکەوێتـەوە نـەبادا دایـكو باوکیـان لەژوورەکـەی ئـەودیو گوێیـان لێیـان بێـت! بۆیـە هـەردووکیان بەیەکـەوە دەسـت ئـەگرن بـەدەمی خۆیـانو بەیەکـەوە پاڵئەکـەون....سـەرتاپا خۆیـان دائەپۆشـنو لـەژێرەوە کـەمێك قریوەیـان دێتـە دەرەوە....کەمێکیش دەستو قاچیان لەژێر پێخەفەکە ئەجووڵێ.

* * *

**هێلی گشتی بەردەوامە........**

**کات**

**نیوە شەو ە**

**سەرەتای زستانی سالی ١٩٩٤ــە**

**لە گوندەکەی مالی یەعقوب**

یـەعقوب بـاوکی بەجێهێشـتووە چـووەتە ماڵـێ، تاوێکـە لـەژوورەوە دانیشـتووە خـەریکی خۆکۆکردنەوەیـەو جلـی گـەرم لەبەرئـەکات، پـێلاوە قوڕاویەکانیشـی هەرلـەژوورەوە داکەنـدووەو لـەنزیك دەرگاکـە داینـاون، چەند پێلاوێکی‌تـری ئـەو خێزانەشـی لێیـە، سـەیرێکی دایکیو بـەیان-ی خوشـکی

دەكات لەشيرين خەودان، بەمشەوە يەعقوب لەژوورەوە بەدەم خۆئامادەكردن بەهۆی گێڕانەوەی بەسەرهاتەكانی مام حەمەد قادر بیری براكانی خۆی دەكات، دوانیان گورگ خواردبوونی و گەورەكەشیان حزبی بەعس خواردی، بیری مریەمی دولبەریشی دەكات.

لەدووڕیانی ناخۆشیو خۆشیدایە، یەكەمیان مردنی براكانی هاتۆتەوە یاد، دووەمیان ماوەی ساڵێكە لەمریەم دوورەو ئەمشەو بەدیداری شاد دەبێت، بۆیە نایەوێ ئەمشەو بخەوێ چونكە كاتی ژوانەكەی نزیك بووەتەوە، سەردانی گوندەكەی ئەودیو دەكات بۆ بینینی مریەمی چاورەش تاكو بەبۆنی مێخەكی ئەوكچە لادێییە تاسەی دووری دڵداریی بشكێنێ و نزیكەی ساڵێكیش ئەبێت دەستە سوورو جوانە لەخەنە هەڵكێشراوەكەی نەدیوەو ماچیشی نەكرووە.

بەمشەوە لەژوورەوە بەدیار دایكو خوشكەكەی وەستاوەو ئاوهاش بیر لەبراكانیو دولبەریش دەكاتەوە، بەئاواتی ئەخوازێ یەكێ لەبرا گەورەكانی بمانایەو ئەویش وەكو هاوڕێكانی لەبرایەتیدا پەنایەكی هەبوایە، لێرەدا زۆر بیر لەیوسفی برا گەورەی ئەكاتەوە، ئەوكاتەی یوسف لەلایەن حكومەتی بەعس گیرا ناوەڕاستی هەشتاكانی سەردەی رابردوو بوو یەعقوب-یش مناڵ بوو وتەمەنیشی نزیكەی هەر دە ساڵێك دەبوو، ئەم كوڕە عاشقەی ئێستامان لەدایك بووی ساڵی ١٩٧٥ە.

١-یوسفی برا گەورەی یەعقوب لەپێش راپەرین لەناوەڕاستی هەشتاكاندا لەلایەن حكومەتی بەعس بێسەروشوێن كراوە، یەعقوب چاكی لەبیرە ئەوكاتە تەمەنی نزیكەی (١٠) دەساڵێك دەبوو، لەنیوەشەوێكدا پیاوانی رژێمی بەعسی عیراقی چووبوون بۆ گوندەكەی ئەوانو دایان بەسەر ماڵیاندا، یوسف-ی برا گەورەیان بەجلوبەرگی پێشمەرگایەتی پێچایەوەو بردیان

تائێستاش کە کۆتایی ساڵی ١٩٩٤ هیچ سۆراخێکی نیە، خۆشیان تا ئاستێك دەستیان لێی شتووەو بەتەمای نین.

٢-ئەیوب-ی براشی لەساڵی ١٩٩٢ لەکاتی هاتنەوە بەرێگای قاچاغدا پاسدارەکانی سەر سنووری عیراق ئێران گرتیانو بەبەرچاوی خۆیان لەیەکێ لەرەبیەکان وەکو ئەسپ ناڵیان کرد، خوێن لەدەستو قاچەکانی ئەچۆڕایەوە، بەشەوی ساردو پڕ بەفر بەرەڵایان کرد، لەدەرەوەی رەبیەکەو لەنێو ئەوشاخەدا گورگ خواردی.

٣-هاوینی ئەمساڵیش کەساڵی ١٩٩٤ـە یەعقوب خۆیو کامەرانی برایو باوکی چوون بۆ سۆراخێکی یوسفی براگەورەی لەناوچەی کفری، کەحکومەتی بەعس هەندێ لەکوردە بەندکراوەکانی پێش راپەڕینی بەردابوو، بەڵکو ئەوە خوایە ئەو برایەی مابێو بەکەسوکاری شاد بێتەوە، بەڵام سەربازەکانی حکومەتی بەعس نەیانئەهێشت کەس لەخاڵی پشکنین بچێتە ئەودیو، چونکە ماوە ماوە خاڵی هاتوچۆکردنیان دائەخست، بۆ سوکایەتیکردن بەهاووڵاتیان ئەبوایە خەڵك بەسواری لۆریو پیکاب لەوخاڵەدا بپەڕنەوە.

* * *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر، دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

یەعقوبو کامەرانو مەلاعەلی باوکیان بەرەو ئەوێ رێگاکەیان ئەبڕی تالەنێو گیراوەکاندا دەنگوباسێکی یوسف-یان دەست بکەوێ، بەڵام هەرسێکیان هەناسە ساردبوون! بەرلەوەی گیراوەکان ببینن، بەرلەوەی

بەیوسف شادببنەوە سەربازەکانی ئەوێ ئەیانگرن، دوای پشکنین و سوکایەتی ئەزیەتی زۆریان ئەدەن.

لەناو بەندکراوە ئازاد بووەکاندا یوسف نەبوو، تەنانەت هەواڵێکیشی نەبوو، بەهیچ شێوەیەك بەندکراوەکان نەیان بینی بوو، ئەم دەنگ و باسە ناخۆشە لەبەندکراوەکانەوە پێیان دەگەیشت کاتێ ئەوان بەدەست سەربازەکانەوە لەخاڵی پشکنیندا گیرابوون و بەندکراوەکانیش بەبەردەمیاندا تێئەپەڕین ئەهاتن بەرەو سنووری کوردستان، ئەوانیش یەك یەك چاویان تێبڕی بوون و جارجار هەواڵی کوڕە گیراوەکەیان لێدەپرسین:-

مەلا عەلی// ئەرێ یەسف ئەناسن؟!

بەندکراو(١)// ناوی باوکی یوسف چیە؟

مەلا عەلی// یوسف علی عمر.... یان یوسفی مەلا عەلی عمر.

بەندکراو(١)// نەخێر....نایناسم.

یەعقوب// ئەرێ کاکە گیان یوسف مەلا علی عمر ئەناسی؟

بەندکراو(٢)// نەخێر ئەم ناوە لای ئێمە نەبووە، چی تۆیە؟

یەعقوب// برا گەورەمە.

بەندکراو(٢)// بەداخەوە.

*     *     *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

لەگــەڵ ووشــەی بەداخــەوە یــەعقوب دەموچــاوی گــرژ ئــەبێ، لــەو خەیاڵــە دەرئەچێ و ئەگەڕێتەوە نێو ژوورەکەی خۆیـان کەبەدیار دایكو خوشـکەکەی و خەریکی خۆ کۆکردنەوەیە بۆ ژوان.

بەمشەوە لەو ژوورەدا زۆر بێتاقەتە، زۆر خەفەت دەخوات، بۆ مردنـی براکانیو بۆ دووری دولبەریش، لەسەر جێگەکەی خۆی دائەنیشێ و خـەریکی خۆ ئامادەکردن دەبێ بۆ رۆیشتن لـەژێر بەفروبارانی ناوچەی حاجی ئۆمـەران بۆ دیداری دولبەر، بەتەنیا لەسەر جێگەکەی خۆی چاو ئەبڕێتـە دیـوارەکانو جارێکیتریش خەیاڵ ئەیباتەوە بۆ ئەوکاتەی لەخاڵی پشـکنینی شـاری کفری لەکاتی شەو لەلایەن سەربازەکانەوە گیراون:–

* * *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێلێکی باریکتر، دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

سەربازەکانی بەعس لەخاڵی پشـکنین بەمشـەوە ئـەم باوكو دوو کـوڕە لەلایـەنخۆیان ئەهێڵنـەوە! بەنـدکراوەکانیش هـەموویان بەبەردەمیانـدا دەڕۆنو لەوسەر دەست دەکەنە ملی کەسوکاریان کە بۆ پێشوازی هـاتبوون، ئـەوانیش زەق زەق سەیری ئەوانو سەربازەکان دەکەنو ناشزانن بۆچی گیراون.

بەهــەرحاڵ بەمشــێوەیە لــەوێ ئەمێننــە، دواتــر لــەدرەنگی شــەودا بــەرەلایان ئەکـەن، لەودەشــتە چــۆڵو تاریکــەش گورگیــان بــۆ پەیــدا ئــەبێت کامـەرانی برای ئـەخوات! ئێسـتا یـەعقوب تاقـە کـوڕی دایكو باوکیـەتی، تاقـە برای بەیان–ـە، بەمشەوە لەم ژوورەی خۆیان سەیری ئەم خوشکەی دەکات.

* * *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

بەیان کچێکی لادێییە، دایكو باكو تاقە براکەی زۆر خۆش ئەوێ، شەوو رۆژ لەماڵەوە یارمەتی دایکی ئەدات، سەرپەرشتی دۆشینی ئاژەڵەکانیش دەکات، هەموو کارێکی ناومال بۆ دایکی رائەپەڕێنێ، خزمەتێکی زۆری باوکە پیرەکەشی دەکات، لەگەڵ یەعقوبی برای وەکو دوو هاورێ هەڵسوکەوت ئەکەن.

ئەم برا تاقانەیە بەمشەوە سەیری خوشکەکەی ئەکاتو بەمشێوەیەش بیری لێئەکاتەوە هەرئاوها هەموو هەڵسوکەوتەکانی ئەو تاقە خوشکە بەسکرینی روئیای‌دا تێئەپەڕن.

یەعقوب بەمشەوە بەلانسی غوربەتی بەرزبۆتەوەو غەریبی هەموو شتێكو شەوانی ژوانەکانی مریەم-یش دەکات، بەهۆی بەسەرهاتو مردنی براکانی مام حەمەد قادر کەپێش کەمێك لەدوکانی گوندەکەیان بیستبووی، لەناوچوونی براکانی خۆی ئەهاتەوە یاد! هەربەمشەوە لەژوورەوە بەدیار دایكو خوشکە خەولێکەوتووەکەی دانیشتووەو چەند دیمەنێکی لەوجۆرە ئەهاتەوە بەرچاو، بەم شێوەیە بەردەوام ئەبێت تاکات ئەگاتە نیوەشەو.

دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر کاتی ئەوە هاتووە بەرەو ژوان بێتەوە بۆیە ئۆقرەی لێبڕا، دایکی خەوی لێکەوتووە، بەیان-ی خوشکیشی لەخەوێکی زۆر خۆشدا نوقم بووە، ژوورەکەش زۆر بێدەنگە، چراکەش بەسەر دیوارە قوڕەکە هەڵواسراوەو رەشی دووکەڵەکەی تابنمیچ هەڵکشاوە، باوکیشی لەژوورە گەورەکەی خوارەوەیە لەنێو مەڕەکان رۆژ دەکاتەوە.

ئەم گەنجە عاشقە بڕیاری رۆیشتن ئەدات بەرەو دێکەی ماڵی مریەم، ئەوەتا جارێ لەسەر جێگەکە دانیشتووە، کەمێك سەیری دایکی کرد هەناسەکانی چۆن یەك بوون، خوشکەکەشی دەمێکە چووەتە خەوی خۆی،

لەخەوەکانیان دڵنیا بوو، بەئەسپایی جلی گەرمترو پاڵتۆ بۆرەشی لەبەر کرد، جامانەیەکیشی کردە ملی تالەسەرما بیپارێزێ.

لەسەر جێگەکەی دەستی برد بۆ دەلاقەکەی خۆی کەبەپەردەیەکی بۆر داپۆشرابوو، بەدەستەکەیتری پەردەکەی لادا، ئەوشووشە عەترەی کەبۆ ترێ–ی کڕیبوو خستیە باخەڵی. کەمێك بێدەنگ بوو، دواتر رووی وەرگێڕا تێرتێر سەیری دایکی کرد کەبەو رۆژگارە بەبێ دەنگی ژیان بەسەر ئەبات، سێجار جەرگ سووتاو بووە، سێ کوڕی لەناوچووە، وەك سێجار مردبێ و زیندو بوبێتەوە، بۆیە زۆر بێدەنگ و زۆریش بێئاگایە لەژیان، یەعقوب زۆر بەزەیی بەو دایکە پیرەی دێتەوە بۆیە لەنێو خەوەکەدا هەرسەیری دەکات.

دوای تاوێك بیرکردنەوە لەدایکی و کەمێکیش لەتاقە خوشکەکەی، ئابەم شێوەیە هەڵسوکەوتەکانی ئەو پیرەژنە جەرگ سوتاوەو خوشکەکەی ئەهاتەوە بەرچاو، بەدەم سەیرکردنیانەوە لەدڵی خۆی ئەیووت:–

> یەعقوب// (لەدڵی خۆیدا) دایە گیان زۆرم خۆش دەوێی، دایە گیان خوا تۆمان لێنەسەنێ و ئێمەش لەتۆ نەسەنێ، ئەزانم سێجار جەرگت سووتاوە، سێ کوڕت مردوون و زۆر بیریان لێدەکەیەوە، بۆیە بەدرێژایی رۆژ هەربێدەنگیت.

لەوەزیاتر خۆی بۆنەگیراو بەچاوێکی پڕ لەفرمێسك هەڵسایە سەرپێ، چووە لای چراکە کەنزیکبوو لەدەرگای ژوورەوە، ئاوڕێکی بۆ دایك و خوشکەکەی دایەوە دواتر توزێك چراکەی کزکرد، پێڵاوەکانی کردە پێی و دەرگای ژوورەوەی کردەوە، هێندەی هەناسەیەك چووە دەرەوەو بەخێرایی دایخستەوە نەبادا هەوای ساردی دەرەوە بێتە ژوورەوەو ئەو دایك و کچە وەئاگابێن، لەدەرەوە ئەو بەتانیە ئەستوورەشی دادایەوە کە بەدەرگاکەوە

هەڵواسرابوو بۆ رێگەگرتن لەهەوای سارد، بەهەرحاڵ بۆ ژوانێکی نوێ وەکو زستانەکەیتر لەماڵ دەرچوو، بۆ راموسانێکیتر وەکو زستانی رابردوو، بۆ دووبارە هەڵگرتنی نازەکانی مریەم گیان.

*　　*　　*

ئەو شەوە دونیا زۆر سارد بوو، کە یەعقوب لەژوورەوە دەرچوو بەنزیك ژووری مەڕەکاندا نەڕۆیشت بۆ ئەوەی باوکی هەستی پێنەکات، بەلایەکیتردا خۆی گەیاندە کۆڵان، ئەرزی ناو دێ زۆر تەڕبوو، قوڕ پێڵاوەکانی داپۆشیبوو، تاوە بارانێکی وردیش ئەباری، بەبەردەمی دوکانەکەی مام حەمەد قادر تێپەڕی، لەوکاتەدا مامە پیرە خەریکی رشتنی سوتووی نێو مەقاڵیەکە بوو لەبەردەم دوکانەکەیدا، دیار بوو گەنجەکانیش تازە ئەوێیان چۆڵ کردبوو، دەرەوە تاریك بوو بەلام چرای ژوورەوە بەردەمی دوکانەکەی رووناك کردبووەوە، یەعقوب نەیهێشت مام حەمەد قادر بیبینێ، شەوەکەش تاریك وئاسان بوو بۆ خۆشاردنەوە.

گەنجە عاشقەکە لەدوکانەکە تێپەڕی، دوای چەند هەنگاوێك ئاوڕی بۆ دایەوە، مامە پیرەش لەسوتوو ڕشتن تەواو بوو، چووە ژوورەوە دەرگا دارەکەی داخستو رووناکی لەکۆڵان بڕی، تەنها چەند تاڵێکی رووناکی زۆر کز لەدرزەکانی دەرگاکەوە ئەڕژانە کۆڵان.

*　　*　　*

مامەی ریش سپی لەژوورەوە مەقاڵیە بەتاڵەکەی دەستی داناو سوباکەش کەمێك پشکۆی تیابوو، دواجار بەفویەك چراکەی کوژاندەوە، ئەگەر ئەو چەند پشکۆیەی نێو سۆباکە نەبوایە ئەوێش وەکو دەرەوە تاریك ئەبوو، جامانەکەی لەسەرملی ئالاندو چووە ژێر جێگاکەی، دوای خۆداپۆشین

لەبەرخۆیەوە دەمی ئەجولاند وەکو خوێندنی ئایەت و بسم اللهو شتیتری ئاینی.

* * *

یەعقوب بەردەوامە لەرۆیشتن، هەرئەوەندەشی باش بوو کەلەسنووری دێ رێی دەکرد، بەهۆی کۆلانەکانی ناو دێ زۆر هەستی بە باساردەکە نەدەکرد، بەلام دوای کەمێك لەئاوایی دەرچوو چەند سەگێکیش دوای کەوتن ئەویش زۆر بەناچاری جامانەکەی ملی داکەندو وەکو لەچك کردیە سەروملی تاخۆی لەسەرما بپارێزێت.

هەوایەکی زۆر ساردی هەبوو، سەگەکانیش تادەرەوەی دێ دوایکەوتن، پەلاماردان نەبوو بەڵکو هاودەنگی بوو، چونکە ئەوگیانداره بەوەفایە هەموو خەڵکی دێکەی خۆیان ئەناسی، دیارە هەربەبۆن لەگەڵ خەڵکانێکیتر جیایان دەکردنەوە بۆیە بەبێ ئازاردان لەدەرەوەی دێ تاماوەیەك لەگەڵ ئەو عاشقە سەرکێشەدا رۆیشتن و دواتر بەهۆی سەرماو بارانی ئەو شەوە دوای رۆیشتنی چەند هەنگاوێك بەپەلە گەڕانەوە ناو دێ.

* * *

هێلی گشتی بەردەوامە........

کات

دوای نیوە شەو ە

سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٩٤ـە

یەعقوب لە گوندەکەی خۆیان دەرچووە بەرەو ژوانی مریەم گیان ئەڕوات

یەعقوب چرکە دوای چرکە لەدێ دوور ئەکەوێتەوە.

ئەم عاشقە زیاتر هەنگاوەکانی درێژ دەکردەوە تازووتر لەخاکە قوڕەکەی ناودێ و چواردەوریدا رزگاری ببێ، تازووتر لەوبارانەش دەرباز ببێ و بگاتە سەرشاخ، چونکە ئەوێ بەفرەو زۆریشی پێخۆشترە، تاڵە جەنجاڵەکانی بیرکردنەوەشی بەهۆی تاریکی شەوەکەو چرپەی قاچەکانی بەناو خاکە فشەڵە تەڕەکەدا زیاتر ئاڵۆز ببوون، چەند هەنگاوێك ئەڕۆیشت و دواتر قاچەکانی دائەتەکاند لەقوڕ پاکی ئەکردەوە.

بەدەم رێگاوە هەموو بیرەکانی چڕکردبوونەوە تالەخاڵی گەیشتنی دێکەی ماڵی مریەمدا ئاوێزانی سنگ و بەرۆکی خۆشەویستەکەی بکات و هەرهەمووی هەڵڕژێت، یەعقوب لەبەرخۆیەوە پێئەکەنی و بیری لەوە دەکردەوە کەئەگاتە ناودێ دووبارە چەند سەگێك بەرەو رووی دێن، ئەویش بەدەست هەرەشەیان لێدەکات و جارجارەش دائەنوێتەوە بۆ بەرد هەڵگرتن تابترسن و رابکەن لێی دوور بکەونەوە، چونکە خەڵکی ئەوێ نەبوو ئەو گیانلەبەرانە زۆر نایناسن.

ناودێ شارەزایە، ئەوەندەی پێناچێت ئەگاتە بەردەمی دوکانەکەی مام خدر، لەوێش ئەوەندە ناخایەنێ مریەم لەژوورەوە دوای چاوەڕوانی گەیشتنی بۆی دێتە دەرەوە، یان ترێی خوشکە بچووکی دوای سەرخەوی خۆی هەر دەرەو ژوور دەکات کەپێی ئەزانێ بەخێرایی ئەچێت بانگی مریەم

دەکات، یان نیشانەکەی خۆیان بەکارئەهێنن ئەویش شێوە لێدانی دەرگای دوکانەکەی باوکی مریەم بەنینۆکەکانی و بەدوو لێدانی لەیەکتر دوور، مریەم-یش لەژوورەوە ئەیزانێ و بۆی دێتە دەرەوە، تێر تێر دەست لەملانی یەکتر دەبن و تێریش دەست ئەهێنێ بەسەروقژو بالای ئەو کچە لادێییە، بەم چەشنە لەباوەشی ئەگرێ و تاسەی دووری ئەو ماوەی پێشووی پێئەڕەوێنێتەوە.

گەنجێکی سەرهەڵگرتوو، عاشقێکی سەرکێش، دڵدارێك هەموو ئەقڵی وا لەناو دڵی دایە، لەهیچ ناترسێ، بێباکە لەباران، بێباکە لەبەفر، لەسەرما، لەکرێوە، لەماندووبوون تەنانەت لەژیانی خۆیشی، ئەو بۆیە دونیای خۆش ئەوێ چونکە مریەم-ی تیایە. بۆگەیشتن بەمریەم هەموو شتێك و هەموو ماندووبوونێك پشت گوێ ئەخات.

یەعقوبی گەنج لەچاوی مریەم-ەوە بریسکەی ئەستێرەکانی شەوانی هاوینی گوندەکەیان ئەبینێ، پەلکەزێڕینەی بەهاری گوندەکەشیان لەتاڵی قژە خەناویەکەی ئەو دولبەرە ئەدۆزێتەوە، هەموو دونیاش بەبێ مریەم عەدەمێکی حەتمیە، هەموو رێگاوبانە شاخاویە سەختەکەش بۆ گەیشتن بەمریەم چەند هەنگاوێکی سوکەڵەیە.

یەعقوب بەدەم رێگا لەشی زۆر گەرم داهاتبوو، هەرچەندە جلەکانی سەرەوەی بەباران تەڕبووبوو بەڵام بەهۆی خێرا رۆیشتنیەوە هەستی بەسەرما نەدەکرد، تەنها بینینی چاوەکانی مریم لەمێشکیدا ئەخولایەوە.

*  *  *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر،

## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

بەدەم ڕۆیشتنی خێراوە بیری لەزستانی ڕابردوو دەکردەوە، ژوانەکانی زستانی کۆتایی ساڵی ١٩٩٣ وسەرەتای ساڵی ١٩٩٤ی ئەهاتەوە بەرچاو، یەعقوب بەدەم ڕۆیشتنەوە ئاوەها بیری لەمریەم دەکردەوە:-

یەعقوب// مریەم گیان، بەوقوربانی چاوەکانت بم،
ئەزانی ئێستا دەرگای دوکانەکەی باوکتم ماچ کرد،
بەخوا مام خدریشم خۆش ئەوێ چونکە باوکی تۆیە.

مریەم زۆر بەو قسانە پێئەکەنی، دەستە خەناویەکانی ئەکردە ملی ئەو کوڕە، عەیاریو نازەکانیشی زیاتر خەست ئەکردەوە، ئەو گەنجەش هێندەیتر نوقمی نێو گێراوەی مەکربازیی ئەو کچە لادێییە ئەبوو، دواتر هەربەگاڵتەو پێکەنینەوە بەرۆکی یەعقوبی ئەگرتو ڕایئەتەکاند لەخۆشەویستیا بەنەرمی پێی ئەووت، هاواریشی نەدەکرد بەسەریا نەوەکو بەم شەوە کەسێك گوێی لەدەنگیان بێت:-

مریەم// کوڕە هەی حەیوان زۆرم خۆش ئەوێی نازانم
چیت لێبکەم، بەس ئەوەندە بموروژێنە، بەس
ئەوەندە نازم بدەرێ بازۆرم خۆش نەوێی، ئەزانم
لەبەر من دارو بەردی ماڵەکەشمانت خۆش ئەوێ،
هەموو گوندەکەشمانت خۆش ئەوێ.
یەعقوب// (بەپێکەنین) بەقوربانی گوندەکەشتان بم.

مریەم بەم شەوە خەریك بوو لەپێکەنینا ببورێتەوە، بەدەستێکی یەخەی یەعقوبی گرتبوو و دەستەکەی تری خستبووە سەردەمی بۆ ئەوەی دەنگی پێکەنینەکەی دەرنەچێ، هەندێ جاریش دەموچاوی ئەخستە

سەرسنگی یەعقوب تاکەمێك لەپێکەنینەکەی پێ کپ بکاتەوە نەوەکو لەژوورەوە گوێیان لێی بێت، دایکی یان باوکی بێنە دەرەوە، چەند چرکەیەك سەری ئەخستە نزیك ملی یەعقوب و لەژێرەوە قوڵپی پێکەنینەکەی بەئاستەم ئەهاتە دەرەوە.

بەم نزیکبوونەوەیەش یەعقوب مەستی بۆنی مێخەك و عەتری قژە لادێیەکەی ئەبوو، لەگەڵ هەموو چوونە پێشەوەیەکی مریەم-دا یەعقوب زیاتر حەیرانی چاوەکانی ئەبوو، لەهەموو چرکەیەکیشدا جارێك لەدەوری ئەگەڕاو بەقوربانیشی ئەبوو.

وەکو دوو درەخت لەبالای یەکتر ئالابوون، قژی مریەمیش بەسەر ناوشانی یەعقوب بەخشان بووبوو، گەر لەدواوە سەیری بکەی تاسەر پشتێنەکەی ئەو کوڕە دێهاتیە هاتبووە خوارێ، بۆنی عەترو کەمێك رەنگە خەنەییەکەی نەبوایە لەگەڵ شەوەکەدا جیات نەدەکردەوە، هەرچەندە وەرزەکەی زستان بوو بەلام ئەم دوو دڵدارە هەرزەکارە لەباوەشی یەکترو بەعیشقی یەکتری خۆیان گەرم دەکردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا گەنج زۆر کەم هەست بەسەرما دەکات.

ترێی خوشکە بچکۆلەشی لەولاوە وەستاوە بیانبینێ یان نا هیچ کاریگەری نابێت بۆیان چونکە یارمەتیشیان ئەدات و چاودێری هاتنی دایك وباوکیشی ئەکات، کەمێکیش خۆی کردبوو بەناویەکدا و کەمێك لەبەرسەرما خۆی و دەستەکانی لەیەکتر ئالاندبوو، جارجاریش فووی ئەکردە پەنجە بچکۆلەکانی و دواتر لەشانەکانی ئەخشاند تا تۆزێك گەرمی بێتەوە.

کچە شاخاویەکی چاو رەشی قژ درێژ ئاوەها کوڕە چیانشینەکەی شێت و حەیران کردبوو، بۆیە چەندین جار بەشەوی زستان، بەشەوی ساردو کرێوەو باران ئەو رێگە دوورو درێژە ئەبڕێ، وەرزە ژوانەکەی پێشووی مریەم و

یەعقوب لەشەوداو لە زستاندا بوو، چونکە لەو شەوانەدا کەس بەدەرەوە نیەو کەسیش پێیان نازانێ، هەرهەموویشی لەگوندەکەی ماڵی مرە گیانو لەبەردەمی دوکانەکەی مام خدری باوکی ئەوکیژە عەیارو چاوبازو مەکربازەدا بووە، بۆیە ئەیەوێ شەوانی ئەم زستانەش بەمێخەکی سەر سنگی مریەم موعەتەر بکاتو سەرلەنوێ ئەوێ بکەنەوە بەژوانگەی خۆیان.

یەعقوب زۆر کات دوای نیوەشەو لەزستانە بۆندارەکەی پێشوو رێگای ژوانی مریەمی ئەگرتە بەر چونکە لەوکاتەدا خوشکو دایکی ئەمیش خەوتوونو باوکە پیرەکەشی ئاگای لێنابێت، پێش بەرەبەیانیش ئەگەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان لەوێش کەس پێی نەئەزانی، بەڵام هەندێ شەو لەکاتی هاتنەوەدا باوکی لەنێو مەڕوماڵاتەکە ئەهاتە دەرەوە هاواری کێ ی زەلامی بۆ دەکرد، ئەویش لەسەرەخۆ ئەیووت:-

یەعقوب// باوکە منم....هاتووم سەیرێکی دەرەوە بکەم، ئەگەر ماندووی وەرە ژوورەوە بخەوە، خۆ من تازە خەبەرم بۆتەوە.

باوکە پیرەکەشی نەیئەزانی کوڕە گەنجەکەی تازە لەژوانی ئەو دێهاتانەی لای خۆیان گەڕاوەتەوە! نەشیئەزانی کوڕەکەی کەوتۆتە نێو تەلیسمی قژی رەشی کچەکەی خدری هاوڕێی! خۆ ئەگەر پێی بزانیایە لەوانەبوو خۆی بچوایە بۆ خوازبێنیو بیکردایە بەبوکێکی جوانو بۆی بهێنایەتە ماڵەوە چونکە لەچوار کوڕ تەنها یەعقوب-ی بۆماوەتەوە.

یەعقوب// باوکە....ئەزانم ماندووی خەویت، هەستە بچۆرە ژوورێو من تازە خەبەرم بۆتەوە ناخەوم.

مەلا عەلی....باوکە پیرەکەی یەعقوب چەندین شەو بەهۆی تەمەن زۆریو ماندوێتیەوە یەعقوبی لەشوێنی خۆی داناوەو خۆیشی چۆتەوە

ژوورەوە بۆ خەوتن، یەعقوب-یش لەگەڵ ئەوەی ماندووی ڕێگابوو وتازە لەو ژوانە دوورە گەڕابووەوە بەڵام بەهۆی خۆشەویستی باوکی ئەچوو لەنێو مەڕەکاندا بەیادی تامی ماچەکانی مریەم ڕۆژی ئەکردەوە، هەندێجاریش باعەی مەڕەکان خەیاڵەکانیان ئەپچڕاند دوای سەرهەڵبڕین‌و چاودێری دووبارە لەنێو پاڵتۆ ئەستوورەکەی شوانیدا خۆی گرمۆڵە دەکردەوە تاجارێکتریش بۆ مریەمی چاوڕەش خەیاڵەکانی لەیەك گرێ بداتەوە.

هەندێ شەویش لەهێرشی گورگەکاندا دوای ڕاونانیان ئەگەڕایەوە نێو کەپەنکە ئەستورەکەو بەخەیاڵی مریەم لەنێو مەڕەکان شەوگاری بەسەر ئەبرد، تابەرەبەیان لەگەڵ ئەندێشەکانی ئەو کچە لادێییەدا ئەدوا، دواتریش کەرۆژ ئەبۆوە زۆر چالاك‌و بەروخسارێکی گەش ئەچووە لای دایکی‌و بەیان-ی خوشکی، لەوێ لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی لەسەرخوانی بەیانی دائەنیشت‌و دەستی ئەکرد بەخواردنی چاو پەنیری پێستەو چەند خواردنێکی‌تری ناوچەکەیان.

بەڵام باوکە پیرەکەی هەندێ لەو شەوانەی کەنۆرەی پاسەوانیی خۆی بوو دڵی نەئەهات کوڕە تاقانەکەی ماندوو بکات، چونکە لەچوار کوڕ (یوسف‌و ئەیوب‌و کامەران‌و یەعقوب) تەنها یەعقوب-ی بۆ ماوەتەوە بۆیە هەندێ شەو ئەیووت:-

مەلا عەلی// ناکوڕم قەیناکە....بڕۆ بخەوە....باخەوت لێنەزڕێ.

یەعقوب-یش هەندێجار بەهۆی ماندوێتی زۆری ئەو شەوە، بەهۆی بەپێ ڕۆیشتن‌و گەڕانەوەی نێو ئەو ژوانە شاخاویە پڕ بەفرە، بەهۆی خاوبوونەوەی لەشی لەو سەرماو سۆڵەی ئەو ناوچەیە حەزی لەخەوتن دەکرد،

دوای چەند وتووێژێکی کەم لەگەڵ باوکیدا یەکسەر ئەچووە ژوورەوە بۆ لای دایكو خوشکی، ڕێك بۆ ناو جێگەو تابەیانی تەخت لێی ئەخەوت.

*　　*　　*

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

یەعقوب بەدەم ڕۆیشتنی خێراوە ئاوا بیری لەو باوکە پیرەی ئەکردەوە، ئاوا یادی ژوانەکانی پێشووی دەکردەوە، ئاوا یادی قسە خۆشەکانی مریەمی دەکردەوە، ئاواش یادی ئەو شەوانەی دەکردەوە کەلەزەماوەندێکی نێو گوندەکەی ماڵی مریەم-دا چۆن ئەو هەموو ڕێگەی بڕیوە تالەپێچێکی هەڵپەڕکێدا دەستی مریەم بگرێ و تاوێك شانیان بنێن بەیەکەوەو کەمێك کەف و کوڵی گەنجێتی پێدامرکێنێ.

ئەم گەنجە شێتە یادی عیشقبازیی خۆی دەکاتەوە، تەنانەت هەناسەکانیشی بۆنی مریەم-ی گرتووە، ئەم شێتە چەند چێژ لەسەختی ڕێگاکە ئەبینێ هەزاران هێندە تام لەیادەوەریەکانی پێشوو وەرئەگرێ بۆیە هەنگاوەکانی نێو ئەو سەرمایە پەیوەست بووە بەیادەوەری ژوانەکانی خۆیو دولبەرەکەی.

## خوێنەری بەڕێز........

بۆ ماندوو نەبوونی زەینت بە ڕۆیشتنی یەعقوب بەرەو ژوان کەنزیکەی یەك کاتژمێر لەهەشت کاتژمێرکەی نێو ئەم دەقە ئەخایەنێ و میحوەری قورسیو نیمچە قورسی ڕووداوەکانە، واتا کوشتنی کاتەکانی چاوەڕوانی تۆی خوێنەر لەم ڕێگەو ڕۆیشتنەدا بۆ سەرقاڵ بوونو پەیوەست بوونە بەگۆڕانکاریە یەك لەدوا یەکەکانی نێو ئەم بەسەرهاتە، جارجار لەکاتی ڕۆیشتنی یەعقوب-دا بشوویەك بەتۆی خوێنەر ئەدەمو بەچەند لقە جووڵەیەك

ئەتانبەستمەوە کە زۆر بابەتین لەگەڵ هێلی گشتیدا، دواتریش سەرلەنوێ تۆی بەرێز ئەگەڕێنمەوە سەر هێلی کارا، بەمشێوەیە لەنێو نەخشەسازی ئەم دارشتنەدا هێلکاری گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانتان بۆ تەواو دەکەم.

*        *        *

هێلی گشتی بەردەوامە........

کات

دوای نیوە شەوە

سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٩٤ـە

یەعقوب لە گوندەکەی خۆیان دوور کەوتۆتەوە بەرەو ژوانی مریەم ئەڕوات

ئەمشەو هێندەی نەماوە یەعقوب بەمریەم شادبێتەوە، ئەمشەو کەف وکوڵی دووری نێوان دوو زستان ئەڕژێو لەچرکەی بەیەکگەیشتنیان هەموو ئازارێکی دووری‌یان بیرئەچێتەوە، هەموو بەیەکگەیشتنەکانی ئەم دوو گەنجە لادێییە لێوانلێو بووە لەپێکەنین و خۆشی و دەست لەملان و هەڵمژین و هەڵگلۆفین.

ئەوەتا بەدەم ڕێگاوە یادی قسە خۆشەکانی مرە گیان ئەکاتەوە، پێکەنین ئەم دڵدارەی داگیری کردووە، زەردەخەنەش لێوەکانی بەجێناهێڵێ، بەردەوامە لەڕۆیشتن، هەندێجار چرپەی قاچەکانی بەناو قوڕەکەدا سەرنجی رادەکێشێ، جارجارەش زەینەکانی ئەڕەوێنێتەوە، لەکاتی ڕۆیشتندا دەموچاوی لەباران پاك دەکاتەوەو بەردەوامیشە لەڕۆیشتن بەرەو گوندەکەی ماڵی مریەم-ی خۆشەویستی.

هەربەدەم ڕۆیشتنی خێرا لەژێر باران و لەسەر ئەو خاکە قوڕەدا دێتەوە یادی لەیەکێ لەژوانەکانی زستانی رابردوودا کەبەیەکەوە لەبەردەم

دوکانەکـــەی مـــام خـــدر وەســـتابوون و تـــریّش لـــەولاترەوە دانیشـــتبوو چاوێکی کردبوو بەهەزار:-

* * *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر، دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

یەعقوب// (بەپێکەنینەوە) مریم گیان بەقوربانت بم.

مریـەمیش لەپێکەنینـدا هیچـی بـۆ نـاوترێ، بەمشـتە بچـووکەکانی ئەکێشـێ بەسـنگی ئـەوکوڕە گێـژە، جارجـار پێکـەنین رێگـەی هاتنـەدەرەوەی چەند ووشەیەکی پێئەدات کەبۆ خۆشەویستەکەی دەربڕێ.

مریـــەم// (بەپێکەنینـــەوە) بەســـە بـــەقوربان، ئـــیتر لەتوانامدا نیە....خۆمم بۆ ناگیرێ....بەقوربانی دڵت بم....بەسە ئیتر.

یـــەعقوب// (بەگاڵتـــەوە بـــۆ ئـــەوەی مریـــەم زیـــاتر پێبکـەنێ و دڵـی خـۆش بێـت) مرەخـان....بـەقوربانت بم.

مریەم// (دەمی خۆی گرتووەو لەژێرەوە پێئەکەنێ).

یـــــەعقوب// (ئەیـــــەوێ پێـــــی بڵـــــێ مـــــراوی) مررررررااااااا....(لەپڕ تەواوی ئەکات) وی.

مریەم// (لەپڕ لە پێکەنین ئەوەستێ و بەرئەبێتە سەرو گوێلاکی و لێئەدات) حەیوان...

ئـەویش دەسـتەکانی ئـەگرێ و ئەیکاتـە سـەرملی خـۆی، چـەندین جار لەسـەریەك بـەقوربان و بەساقەی ئـەبێت تـادڵی ئەوکچە لادێییـە نـازدارە ئاشت

بکاتەوە، ئەوکچە بەنازەش ئەم قسانەی یەعقوب-ی زۆر پێخۆشە، دووبارە دەست ئەکاتەوە بەپێکەنین، خەریکە سنووری پێکەنین ئەبەزێنێ و ئیتر لەتوانایدا نەماوە بەپێوە بوەستێت، یان ئەبێ دابنیشێت یانیش دەست لەملی یەعقوب توندبکاو خۆی پیا شۆڕبکاتەوە، هەرچەندە یەعقوب ئەوەی دووەمیانی زۆر پێخۆشە.

دواجاریش ناچار ئەبێ هەرەشەی لێبکات ئەگەر واز لەو هەموو لوتف و ناز هەڵگرتنە نەهێنێ ئەوا ئەچێتە ژوورەوەو بەمشەوە بەجێی ئەهێڵێ، بەڵام ئەوەندەی پێناچی لەبەر پێکەنین ناتوانێ سەیری ناوچاوانی یەعقوب بکات و یەك لەسەریەك پێکەنینەکانی ئەتەقێنێتەوە، ئەویش هەر بەدوای ئەودا یەك لەسەریەك بەساقەو بەقوربانی مراوی خان ئەبێت.

یەعقوب کورێکی قسە خۆشە، خۆش مەشرەفە، تەنها بۆ خۆشکردنی دڵی مریم ئەو هەموو قسەیە دەکات و بەو شێوەیەو بەمشەوە نازی هەڵئەگرێ، لەپێکەنین ئەوەستن و کەمێك سەیری یەکتر دەکەن، کەیەعقوب سەیری ناوچاوانی مریەم دەکات بەبیریدا دێت قسەیەك بدۆزێتەوە تادڵی خۆش بکات، هەر ئەوەندەشی زەحمەتە تاکو بەهەردوو دەستی مریەم ئەبەستێتەوە، ئەو گرتنەی گرتیە باوەش تادوا ساتەکانی ژوان بەرینادات، ئەو کچە لادێییەش رووپۆشی شەرم ئەکەوێتە سەر روخساری و ئەچێتە قووڵایی لەزەتی نێو باوەشی ئەو کوڕە گەنجە، هەندێ جاریش سوور هەڵئەگەڕێ، بەڵام تێنوێتی حەزەکانیی وای لێدەکرد بێدەنگ بێت، دوای کەمێك کپی و ئارامی نێو باوەش تەنانەت شەرم لەبێدەنگیەکەی خۆیشی دەکات و هەوڵی خۆڕاپسکاندن ئەدا.

یەعقوبیش دەستێك ئەخاتە پشتی سەری و دەمی ئەنووسێنێ بەناودەمیەوە، دەستەکەی تری ئەخاتە کەمەری و توند ئەیگرێ، لەگەڵ یەکەم مژێندا مریەم ئەو هەموو کرژبوونەی بۆ خۆڕاپسکاندن ئامادەیکردبوو شل

ئەبێتەوەو بێدەنگ لەباوەشی یەعقوبدا وەك تەسلیم بوونێکی سەرشێتانە خەریکە خەوی لێئەکەوێ.

زۆربەی ژوانەکانی زستانی رابردووی ئەم دوو عاشقە ماچی ئاوا دوورو درێژی تیابوو، بە شەوی ساردو پڕ مەترسیی دێهاتە شاخاویەکان موجازەفەی مەرگیان دەکرد بۆ تێربوونیان لەو حەزە شێتە، دوای بستێ دوور کەوتنەوە لەدەموو لێوی مریەم هەردووکیان لەخەندە نوقم ئەبوونو سەرتاپا گیانیان بەپێکەنین زاخاو ئەدرێ.

یەعقوب// مریەم گیان بەقوربانی پێکەنینەکەشت بم.

مریەمی بەنازیش لەخۆشی ئەو قسانەی یەعقوب گەزگەز بالا دەکاتو روومەتە بەرزەکانی سوور هەڵئەگەڕێن، ئەویش هێندەی ئەو خۆی دەکات بەقوربانی، لەساتێکدا سەد رجار لەدەوری یەعقوب ئەگەڕێو بەقوربانی چاوەکانی ئەبێت، دواتر خۆی دەکات بەقوربانی ئەو رێگا دوورە کەلەشەوانی زستان ئەیبڕێ بۆ بینینی چاوە لەکل هەڵکێشراوەکانی، هەندێجاریش ئاوڕ بۆ ترێی خوشکی ئەداتەوە:-

مریەم// ترێ گیان بەقوربانی بالات بم.

ترێ-ش مریەمی زۆر خۆش ئەوێ بۆیە بەشەورۆژ لێی دوور ناکەوێتەوە، هەمو کات بەیەکەوەن، تەنانەت شەوانیش بەیەکەوە ئەخەونو ژوورەکەیان جیایە، دایكو باوکیشیان لەژوورەکەیتر بەیەکەوە ئەخەون، براشیان نیە، ئەوان لەماڵەوە یەکتریان زۆر خۆش ئەوێ، هەر ئەو خۆشەویستیەی بنەماڵەکەیانە ترێ بەم شێوەیە یارمەتی مریەمی خوشکە گەورەی ئەدات، ئەوەتا کەمێك لەدووری ئەوان وەستاوە دوای ئاوڕدانەوەکەی مریەم بۆی....ئەویش خۆشەویستی خۆی بۆ دەرئەبڕێ:-

ترێ// مریەم گیان بەقوربانت بم، سەرمات نیە؟

مریەم// (بەپێکەنینەوە) دەی، دەی عەیار.

*   *   *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

یەعقوب-ی گەنج بەدەم ڕێگاوە زۆر بەخێرایی دەڕوات، دوای چەند بیرکرنەوەیەك هۆشی هاتەوە بەرخۆی دەستێکی خستە ژێر باڵەکانی یەك پارچە ئاو بوو، هەستێکی ئاراستەی قاچەکانی کرد هیلاك‌و ماندو بوون بەلاّم هەمووی دەکرد بەقوربانی تاڵێك لەقژی مریم.

ئەو بۆ گەیشتن بەمریەم هەموو ماندوبوونێك قەبووڵ دەکات، ئەم ڕێگایە بۆ یەعقوب زۆر سانایە چونکە دوای دە دەقیقەی‌تر ئەبێ ئەو شاخۆچکەی بەردەمیشی ببڕێ‌و بگاتە سەرتەپۆڵکەکان، ئینجا ڕووناکی چراکانی گوندەکەی ماڵی مریەمی لێوەدەر دەکەوێ، دوای ئەوەش نیو کاتژمێری تری ئەمێنێ.

یەعقوب شارەزای ڕێگەکەیە زۆرجار بەقەراخ چەمەکەدا گەلە گورگیان هەڵبڕیوە تائەودیو گوندەکەی ماڵی مریەم، ئەو گورگانەی بەنزمایی چەمەکەدا ئەهاتن بۆ دێکەی ماڵی یەعقوب بۆ خواردنی مەڕەکانیان، ئەو گورگانەی چەندینجار مەڕوماڵاتی ناوچەکەیان خواردووە، بێگوومان چەندجارێکیش پەلاماری مەڕەکانی نێو گوندەکەی ماڵی مریەم-یان داوەو چەندیشیان لەوان خواردووە.

ئەم گەنجە شێتە بەردەوامە لەڕۆیشتن، بەردەوامە لەبەرەو پێشوە چوون بۆ گەیشتن بەژوانێکی ترو چەندین ماچی غوربەت، چەندین باوەشی دووری، یەعقوب زۆر بەهەڵپەیە بۆ گەیشتن بەو کیژە لادێیە، بۆ شکاندنی

تاسەی دووری نێوانیان، بۆ دانانی بارە قورسەکەی سەرلێوی و هەڵگرتنی سەرلەنوێ باری نازەکانی دولبەری عەیار.

ئاخ مریەم....

تۆش ماندووبوونەکەی یەعقوب دەناسی، ترێش دەیناسێ، بەڵام ئەم گەنجە شێتە بەهیچ شێوەیەك لەماندوو بوون نازانێ و ناشیناسێ و هەموویشی ئەکات بەقوربانی هەناسەیەکی تۆی وردیلە. خۆ بەیان-یش هەستی پێدەکات بەڵام ناوەڕۆك و قوڵایی پەیوەندیەکە نازانێ، ئەویش بەهۆی عەیاری تۆوەیە، بەهۆی هەڕەشەی دەست و پەنجە سوورەکەتەوەیە کەبۆ یەعقوب بەرزیان دەکەیتەوەو ناهێڵیت ئەم گەنجە یەك وشە بدرکێنێت. ئەوەتا یەعقوب بەمشەوە سارده هەنگاو دوای هەنگاو لەگوندەکەی ئێوە نزیك ئەبێتەوە، دەمێکیشە دێکەی خۆیانی بەجێهێشتووە، خەریکە خاکە قوڕاویەکەش جێدەهێڵێ و لەسەر شاخ نزیك دەبێتەوە، ئەوێش بەفرەو هەرچۆنێ بێت بەفر لەباران و قوڕ پاکترەو پیارۆیشتنیشی خۆشترە.

خۆ یەعقوب-ی گەنج نازانێ ماندوو بوون چیە بەڵام لەچرپەی نێو خاکە قوڕەکە وەڕس ئەبێ، حەزی لێناکات، چونکە شەرواڵەکەی پیس ئەبێ و پێیەکانیشی یەك پارچە لەقوڕ هەڵدەکێشرێ، دواتر لەسەر خاکە بەفراویەکە ئەبێ بوەستێت و خەریکی پاککردنەوەی بێت، بەمجۆرەش کاتێکی زۆری لەدەست ئەچێ و درەنگتر بەبینینی تۆ شاد ئەبێت.

سەرکێشی گەنج لەزەمەنەکەی خۆیدا زۆر قورس و ترسناکە، بەڵام خۆی هەستی پێناکات، لێی تێناگات، بیریشی لێناکاتەوە، تائەوکاتەی ئەگاتە پاییزی تەمەن و وەك فلاش باك خۆی ئەخزێنێتە نێو ڕووداوەکانی رابردووی سەردەمی لاوێتی، ئینجا وردە موچڕکەو تەزووی ترس بەگیانیدا تێئەپەڕن و

هەست بەکەرێتی خۆی دەکات، جارجارەش پێکەنینی بەبێعەقڵیەکەی خۆی دێت.

*  *  *

### هێلی گشتی بەردەوامە........

### کات

### دوای نیوە شەوە

### سەرەتای زستانی سالی ١٩٩٤ـە

### یەعقوب خاکە قوڕاویەکەی بەجێهێشتو گەیشتە نزیک شاخ

یەعقوب بەدەم ڕێگاوە زۆر بەخێرایی دەڕوات، لەگەڵ گەیشتنی بەبەردەلانەکەی سەرەتای شاخەکە کەپڕبوو لەبەفر کەمێك وەستاو قاچە قوڕاویەکانی بەبەفر پاك کردەوە، بارانەکەش وەستاوەتەوە بەلام باکەی کەمێك ساردە، کەمێکیش دلی خۆش بوو چونکە لەخاکە قوڕاویەکە دەرچوو گەیشتە سەربەفرە سپیو پاکەکە.

کەمێك وەستا، سەیرێکی چواردەوری خۆی کردو تۆزێکیش ڕوانیە بەرزاییەکەی بەردەمی کەمێشتا سەرنەکەوتووە بۆ سەرتەپۆلکە شاخەکە، ڕوانینی بەرزایی شاخ لەشەودا جیاوازە لەگەڵ ئەوەی ڕۆژ، لەتاریکیدا دووسێ هێندەی خۆی بەرزترو سەختر دەردەکەوێ، پیاو ترسێکی زۆری لێئەنیشێ، ئەو گەنجە شێتە لەوێ کەمێك جلەکانی توندوتۆڵ کردەوە، جامانەکەشی کردەوەو دەموچاوی سڕیەوەو جارێکیتر پێچایەوە سەروملی، دووبارە بەتۆپەڵە بەفر قاچە قوڕاویەکانی پاکتر کردەوە، دەستەکانیشی بەجلەکانی ووشك کردەوە، کەمێك لەیەکتری خشاند بۆ ئەوەی گەرمیان بێتەوە، دواتر فووی تێکرد بۆ گەرمتر بوونیان، جارجارەش ئەیخستە ژێربالێ.

ئێستا ئامادەیە بۆ تەواوکردنی ڕێگای ژوان، لەزستانی پارەوە تاکو ئێستا تەنها یەکجارو لەم بەهاری ١٩٩٤ـەدا ئەم ڕێگایەی دیوە، بەلاّم شارەزاییەکی چاکی تیا هەیە، دڵیشی زۆر خۆشە کەنزیکەی چل خولەکی‌تر ئەگاتە لای خوشکە مراوی، لەوێ تامەزرۆی ووشك بووی ساڵێکی پێ تەڕ ئەکاتەوە، ئێستا مرە گیانیش چاوەڕوانی ئەکات، ئێستا ترێی ژیکەڵەش چاوەڕوانی دەکات، ئەم کچە مناڵەش ساڵێکە چاوەڕێی ئەو شووشە عەترەیەو ئەشزانێ ئەمشەو پێیئەگات.

هەڵبژاردنی ئەمشەوە سارده بەرەو دووەم وەرزی ژوان لەخۆڕا نەبووە، بەڵکو لەپاییزی ئەمساڵی١٩٩٤ کەماڵی مریەم بەخێزانی بۆ جاری دووەم بەهۆی لەناوچوونی کامەران-ی برای یەعقوب هاتبوون بۆ ماڵیان، دوای دانیشتنیان بەیەکەوەو لەکاتی ڕۆیشتنەوەدا، هەموو لەنێو حەوشەکەی ماڵی یەعقوب بەکۆمەڵ وەستابوون لەکاتی خواحافیزیاندا:-

مریەم// (بەیان ماچ دەکات و بەگوێچەکەیدا ئەچرپێنێ).

بەیان دوای ڕۆیشتنیان بۆ کاکە یەعقوب-ی ئەگێڕێتەوە، ئەویش بەمشەوە سارده بەدەم ڕۆیشتن ئەهاتەوە بەرچاوی کەبەیان-ی خوشکی بانگی کرد بۆ لایەکی حەوشەکەو ئەم هەواڵە خۆشەی پێڕاگەیاند:-

بەیان// کاکە یەعقوب...مریەم ووتی یەکەم شەوی ئەم زستانە لەبەردەمی دوکانەکەی باوکم چاوەڕی دەکەم.

لەگەڵ تێکەڵ بوون و سەرقاڵ بوون بەوهەموو بیرکردنەوەیە بەدەم ڕۆیشتنی خێراوە شووشە عەترەکەی ترێی دەرهێناوە، سەیری دەکات و چەند جارێك ماچی دەکات، دووبارە ئەیخنێتەوە بەرباخەڵی و ئەیەوێ هەنگاو

بنێ بۆ دووباره رۆیشتن بەرەو ژوانی کچه شۆخه لادێییەکە، ئەم گەنجه زۆر شێتانه هەڵپه ئەکات بۆ ماچێکی مریەم، بۆ لەباوەشگرتنی ئەوکچه چڵکنه گوندنشینه، ئای لەئەقڵی کاڵی گەنج چەند سەیره جگەلە لەرزەتی هەرزەکارانەی خۆی هیچ شتێك لەپرۆسەی هاوسەر گیری نازانێ، دوای بەیەکەو ژیانیان روونتر بڵێم دوای زەواج کردنیان بەخت دەورێکی گرنگ‌و کاریگەری هەیه کەئایا تووشی چ جۆره خەسوویێك ئەبن یابڵێین تووشیچ جۆره خەسووه دەعبایەك ئەبن، بەلام پلکه هەیبەتی دایکی مریەم ژنێکی زۆر چاکه لەوه ئەچێ بەختی یەعقوب لەمەیاندا زۆر جوان بێت، ئایشێ خانیش ژنێکی زۆر بێدەنگ‌و باشه، دیاره بەخت یاوەری مریەم-یشه کەشوو بەیەعقوب بکات ئەوا ژیانی زۆر خۆش دەبێ بەدەست ئەم خەسووه چاك‌و کەم دوو بێدەنگه.

یەعقوب چەمایەوه چنگیکرد بەبەفرەکەداو خستیه دەمی بۆئەوەی تۆزێك قورگه ووشك بووەکەی پێتەربکاتەوه، تالەچەند ورێنەیەکیتری خەیاڵەکانی باوەشی مریەم وشك ئەبێتەوه ئەگاته ناو دێ، لەوێش مریەم جامه ئاوەکەی بۆ ئامادە کردووه بەدەست‌و پەنجه خەناویەکەی ئەیکات بەدەمی ئەو گەنجه سەرهەڵگرتووه، ئەویش تێنوێتی رێگای ژوانی پێئەشکێنێ‌و لەسەرپێ ئەبێ بۆ ماچەکانی مره گیان.

ئەم گەنجه شێته بەدەم بەفر خواردن بەردەوامه لەرۆیشتن، بەسەر بەردەلانەکەدا ئەرۆیشت‌و بیری لەهەموو هەڵسوکەوتێکی زستانی رابردووی مریەم دەکردەوه، زۆری پێخۆش بوو بەمشێوەیه ئەڕۆیشت‌و تێکەلاوی خەیاڵەکانی دولبەرەکەی ئەبوو. ماوەیەکی باش بەمشێوەیەو بەمشەوه بەسەر بەفرەکەدا ڕۆیشت، هەرچەنده رۆیشتنەکەی بەرزونزمی‌و ورده هەڵبەزو دابەزی تیابوو بەهۆی بەرده جۆراوجۆرەکانی ژێر بەفرەکە، بەلام زۆر لەخاکه

قوڕاویـە فشـەڵەکەی پێخۆشتر بوو، بەمشێوەیەو دواتـر ئەوێی بـڕی گەیشـتە هەورازەکە. لەوێ کەمێك وەستاو ڕوانینەکانی چڕکردەوە بۆ ئـەو سـەرکەوتنە، دووبارەو جارێکی تر چووە نێو خەیاڵەکانی دولبەرەکەیو تێر تێر بەقوربانی باڵای بوو، هەنگاویـنا بەرەو سەرەوە، لەبەر خۆیەوە ئەیوت: -

یـەعقوب// مریـەم گیـان ئـەوا ئەمسـاڵیش هاتـەوە،
بەدرێـژایی ئـەم زسـتانە ئەتکەمە باوەشـم، بەقوربانت
بم کەمێکیتر ئەگەمە لات.

ئەم گەنجە شێتە وردە وردە بەرزاییەکە ئەبڕێ، چرکە دوای چرکەش لـەژوان نزیـك ئەبێتـەوە، هـەنگاو دوای هـەنگاو بـەرزتر ئەبێتـەوە، بەمشـێوەو بەمشـــەوە ســـاردەو دوای چـــەند خولـــەکێك ســـەرکەوت، دووبـــارە هەڵوەستەیەکیتری کردەوەو سەیرێکی تری ئەملاو ئەولای خۆی کردو بەپەلە دیراسەیەکی شوێن پێکانی خۆی کرد.

یەعقوب-ی سەرکێش گەیشتە سـەر تەپۆلکە شـاخەکە، ئەوێ بـەفری زیـاتری لێبـوو، قوڵـەپێی تیـا نـوقم ئـەبوو بـەڵام بەلایـەوە خـۆش بـوو چـونکە ئاسمان ساف بوو، کەمێکیش هـەوای ساردی هەبوو، خۆ ئەویش بەتـەواوی خۆی پێچابووەوەو لەسـەرماش نەئەترسا چونکە کوڕی نێو ئەو شاخانەیەو ڕاهاتووە.

ســـەر تەپۆلکەکـــەش ماوەیـــەکی باشـــی ئەویســـت تـــابیبڕێ، ئـــەو سـەرەوەیەش وردە وردە ئـەو شـێتە بـەکێش دەکـات بـەرەو ژوان، بـەڵام دوای چـەند دەقیقەیـەك ڕۆیشـتنو چـەند بیرکردنەوەیـەکی تـری عاشـقانە ئەوەنـدەی نـەبرد ئاسمـانی شـاخەکە شـێت بـوو ودەسـتی کـرد بـە بـەفربارین، دواتـر لەوبەرزاییـە (بـا) بەهێزەکەشـی هـەڵکرد، ئـەویش بەلایـەوە ئاسـاییە چـونکە لەئێسـتاوە تابـەردەمی دوکانەکـەی مـام خـدر هەرتـەنها نیـو کاتـژمێری ماوەو

لەوێش دەستو پەنجە تەزیوەکەی لەنێو دەستە بچکۆلەکانی مریەم-دا گەرم دەکاتەوە.

تامەزرۆی راموسانەکانی زستانی پێشوو بوو، بیری باوەشە نەرمەکەی مراوی گیان هۆشیان لەسەری ئەو کورە نەهێشتووە، کاتێ ئەم عاشقە بەرەو ژوان ئەبێتەوە هەست بەسەرمای زستان ناکات، خۆشیش لەوەرزی بەهار نابینێ بەهۆی دووری مریەم گیان.

باو بەفرەکە ئەوەندە بەهێز بوو تەنها چەند مەترێك بەرچاوی خۆی ئەبینی، سات لەدوای سات سەرماکە بەهێزتر ئەبوو، ئەوەندەی نەبرد کڕێوەی بەدوای خۆیدا هێناو توانای رۆیشتنی ئەو عاشقەی کەمتر کردەوە. یەعقوب لەژێر ئەوبەفرو کڕێوەیەدا جارێکیتر جامانەکەی توند کردەوەو خستیە سەردەموچاوی تالەبەفروبای سارد بیپارێزێ، بەردەوامیشە لەرۆیشتن، شەوەکەی زۆر تاریکە بەردەمی خۆی بەباشی نابینێ بەڵام بەهۆی رۆشنایی بەفرەکە رێگاکە ئەناسێتەوەو خۆیشی شارەزای ناوچەکەی خۆیانە. کەمێك خێراتر دەڕوات بۆئەوەی بگاتە سەرووی بەرزاییکەی پشتی رەبیە کۆنەکەی زەمانی حکومەتی بەعس، لەوێش رووەو نشێوە ئاسانترو خۆشتر دائەبزێتە دێکەی ماڵی دولبەر، ئەم گەنجە عاشقو سەرکێشو شێتەش کەئەگاتە ئەوێ تەلسمی چاوەکانی ئەو کیژە چلکنە هەموو ماندووبوونێکی لەبیر ئەباتەوە، کڕێوەکە کەم بووەوە ئەوەندەی پێنەچوو بەفربارین وەستایەوە، هەوا ساردەکەش کەمتر بووەوە، یەعقوبیش زۆر دڵی خۆش بوو هەرچەندە ئەو لەبەفرو باران سڵ ناکاتەوە بەڵام هەرچۆنێ بێت بیرکردنەوەکانی ئاڵۆز ناکەنو زووتریش رێگاکە ئەبڕێو زووتر بەدولبەرەکەی شاد دەبێت.

بەردەوامە لەهەنگاونان، بەدەم رۆیشتنەوە زۆر ماندوو وشەکەتە، کەچی ئەم گەنجە شێتە بیری لەو زەماوەندە دەکردەوە کەلەگوندەکەی ماڵی

مریەم سازکرابوو، ئەویش بانگهێشت نەکرابوو بۆ ئەو ئاهەنگە، بەلاّم مریەم هەواڵی ئەو هەڵپەڕکێیەی بۆ ناردبوو تالەگەڵ کوڕانی ناودێ تاوێك هەڵپەڕکێو ساتێکیش چاوبڕکێ بکەن، خۆ هیچ نەبێ کەمێك تامەزرۆی گەنجێتیان پێ ئەشکێو شەویش لەباخەڵی خەیاڵدا تابەیان خەویان لێئەکەوێ، سپێدەش چەند فرمێسکێك نوقمی نێو سەرینەکەیان ئەکەن دواتریش بەهۆی سەرقاڵیئیش وکارەوە لەوخەیاڵە ئازاراویە دوور ئەکەونەوە.

هەربەمشێوەیەو بەبێ دەنگی جارجار پانتایی هەڵپەڕکێکەی ئەهاتەوە بەرچاو، دەنگی قاچەکانی خۆی لەم شەورۆیشتنەدا ڕۆڵی موزیکی گوزارشتیان ئەبینی، گیزەی هەوا کەمەکەش دەوری دەنگی دەهۆڵ و زوڕناکەیان بەرجەستە دەکرد، لەروئیای ئەم شێتەوە دەنکە بەفرەکانی بەردەمی تێکەلاّوی زەردەخەنەو تریقانەوەکەی مریەم ئەبوو، چونکە بەرۆح تێکەلاّوی هەستەکانی ئەم کچە لادێییە بووبوو هەروەکو دولبەرەکەی لەبەردەمی بێت ئاوها بەدەم رۆیشتنەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکردو بەردەوام وێنەی لەبەرچاو بوو.

عاشقە شێتەکە ماوەی ساڵێکە بۆنی مریەم-ی نەکردووە، لەویش زیاتر کەسیتر بەم بەفرو کرێوەیە نایەتە دەرەوە، تێنوێتی ساڵێکی دووری بەکێشی دەکات بۆ نێو سەرماو سۆڵەو شاخ وداخ، بەهۆی تاسەی دووری ساڵێك بەدەم رۆیشتنەوە یادەوەریەکانی مریەم یەك لەدوای یەك لەسەر سکرینی بینیندا ئەکەوتە بەرچاوی، یەکێ لەیادەکانی:-

*　　*　　*

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێلێکی باریکتر،

## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێلی گشتی.........

لەوەرزی بەهاردا ئەو ناوچەیە سەوزەو گوڵاڵە سوورەکانی دەرەوەی دێ لەنێو کەروێشکە گیادا سەرەتاتکێ لەگەنجان دەکەن، جارجار لەگەڵ کزبادا خۆیان نوقم دەکەن‌و دواتر سەر دەردەهێنن دیمەنێکی زۆر دڵرفێن بەناوچەکە دەبەخشن، مژدەی لەبەرکردنی کراسە ڕەنگاورەنگەکانی کیژان بەگەنجان ئەگەیەنن، هەواڵی هاتنەدەرەوەی کچە لادێییە دەست‌وپێ خەناویەکان ئەدەن بەگوێی جحێڵانی گوندنشین.

کۆبوونەوەی کوڕانی ئەم ناوچەیەو کردنەوەی ڕازەکانیان بەرووی ئەم بەهارە سەوزەدا خۆشی ئەخستە دڵی ئەوانەی خاوەنی سێوە سوورەی خۆیانن، لەنێو ئەوانیشدا خاوەن دۆستە جوانەکان سوڵتانی هەموو جحێڵانی ئەم گوندە خنجیلانەیەن.

کۆبوونەوە بازنە بەستووەکەی کوڕانی ناودێ لەبەردەم دوکانەکەی مام حەمەد قادرو هاتوو چۆی بەعیشوەی کچە کراس بریسکەدارەکان‌و چاوبڕکێیان لەگەڵ یەکتردا دڵی کوڕانیان ئەخستە نێو مشتیان، خۆشیان بەو عەیاری‌و مەکربازیەوە بۆ داخورپاندنی دڵی کوڕانی عاشق هاتووچۆی لەو جۆرەیان ئەکرد.

گەربمانەوێ ئاوازێکی گوزارشتی گونجاو بۆ زەینی کچانی مەکربازی ئەم گوندە بکەین بەبەرگی ئەم دیمەنە دڵرفێنەی وەستانی کوڕە عاشقەکانی بەردەمی دوکانەکەی مام حەمەد قادر ئەبێ دەنگە بەسۆزەکەی حەسەن زیرەك لە گوێچکەی ئەو کیژە سەوزو سوورانە بەرزبکەینەوەو بڵێ:-

خۆزگەم بەوەی دۆستی جوانە

لەنێو جحێڵان سوڵتانە.........

چـاوە بریسـسکەدارەکانی نێـو ئەڵقـە بەسـتووی کـوڕانی بـەردەم دوکانەکـەی مامـە پـیرەش لـەنێو زەینـی خۆیانـدا بـەدەنگی حەسـەنی نـەمر گوزارشـتیان لـە هاتووچـۆی کچـانی عەیارباشـی کـراس ئـاڵ وواڵا دەکـردو چریکەی لەگوێچکەیان هەڵئەساند:-

کیژان دەچنە مێرگولان ئەیوەی مێرگینان

تێکڕا دەچنن وەنەشان.........

یەعقوب-یش لەوێ لەنێوی هاورێکانیدا مەست بووە، بەڵام دڵی ئەم گەنجە لەگەڵ ئـەوانی‌تر جیایـە، دڵێکـی باڵـداری هەیـەو بـەردەوام بـەئاسمانی گوندەکـەی مـاڵی مریـەم-دا ئەسـوڕێتەوە، تـەنها لـەکاتی خـەوتندا ئەکەوێتـەوە نێو سنگی خۆی، لەزۆربەی شەوانیشدا ئەبێتە سوارچاکی خەونەکان و لەگەڵ خوشکە مراوی-دا لەفیلمێکی خەون ئامێزدا تاسەرکەوتن ئەجەنگن.

بـۆ ئـەم دیمەنـە دەنگـە بەسـۆزەکەی زیـرەك بەردەوامـە، کەموزیکـە گوزارشـتیەکەیەو کـراوە بەبـەرگی ئـەم جوولـەو هاتووچـۆی کچـان و وەسـتانی کوڕانی بەردەم دوکانەکەی مام حەمەد قادرو چاوبڕکێیان لەگەڵ یەکتر.

خوێنـەری بـەڕێز لـەزەینی خۆتـدا کـەمێك گۆرانیەکە کزبکـەو سـەیری بەیانی خوشکی یەعقوب بکە چۆن بانگی براکەی دەکاتەوەو چی پێ ئەڵێ.

بەیان هاتۆتە نزیك دوکانەکەی مامە پیرەو سەیری یەعقوب-ی دەکات کەلـەنێو کوڕگـەلی دێ وەسـتاوە، بـەردەوام تێیـدەڕوانێ تاگۆشـەی چـاوەکانی بگـرێ و دواتـر بەدەسـت بـانگی کـرد بـۆ بەرماڵـەوە، ئـەویش یارمـەتی لەهاوڕێکانی وەرگرت و ئەوەندەی نەبرد گەیشتە بەردەمی ئەو تاقە خوشکەی، دوای ئـەوەی هاتـە بـەردەمی بەرلـەوەی دەم بکاتـەوە بـەیان بەسـووکی تێیگەیاند:-

بەیان// یەعقوب گیان مریەم هەواڵێکی خۆشی بۆ ناردووی.

یەعقوب// توخوا چیە زوو پێم بڵێ.

بەیان // ئەڵێ لەم ماوەیەدا لەدێکەی ئێمە بووك ئەگوازنەوە، هەڵپەرکێیەکی گەورە ئەکەن.

یەعقوب// ئێ....جا ئەیەوێ من بچم؟!

بەیان // ئەرێوەڵڵا وتبووی بەو مەیمونە بڵێن بابێت.

یەعقوب// (بەپەرۆشەوە) تووسەری بابە؟! نەیووت کەی؟!

بەیان // با (بەدەم رێکخستنی کراسی براکەی) وتبووی بامالی زاوا کاتەکە دیاری بکەن، خۆم خەبەری بۆ ئەنێرم، کاکە ئەوە بۆچی مریەم پێت ئەڵێ مەیمون؟

یەعقوب// (بەپێکەنینەوە) چونکە ئەویش وەکو تۆ مەیموونە.

بەیان // (پێئەکەنێ).

یەعقوب// چونکە زۆری خۆش ئەوێم.

بەیان // (بەپێکەنینەوە) دەباشە کاك مەیموون برۆرەوە ناو هاورێکانت.

یەعقوب هەر بەپێکەنینەوە بەیان بەجێ ئەهێڵێ، لێرەدا بادەنگە خۆشەکەی زیرەك کەمێك بەرزتر بکرێتەوە تائەو عاشقە ئەگەرێتەوە نێو هاورێکانی، تادووبارە بەشداری لەگێرانەوەی بەسەرهاتە شێتانەکەی گەنجێتی خۆیان بکەن، بەڵام یەعقوب لەوانەیتر جیابوو، هیچ نهێنیەکی بۆیان

نەئەدرکاند، دوای چوونە ژوورەوەی بەیان-ی خوشکی و دوای تاوێکیش وەستان هاوڕێکانی هەریەکەو باسی کچە حەیرانەکەی خۆی ئەکات، ئەگەر تۆ وەك خوێنەر زوومی روئیای خۆت بخەیتە سەر دەموچاوی یەعقوب کەلەنێو هاوڕێکانی وەستاوە، ئەبینی وردە وردە خەیاڵەکانی ئەفڕن بەرەو دێکەی ماڵی مریەمو دەموچاویشی کەمێك لەسەر سکرینی خوێندنەوەت لێڵ ئەبێت.

* * *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

دواتر هەمان دەموچاوە خەیاڵاویەکەی یەعقوبی نێو بەهارە روناکەکەی گوندەکەیان ئەگەڕێتەوە نێو شەوە تاریكو ساردەکەی ئەم زستانەی سەرشاخ، بەدەم ڕێگاوە بەسەر تەپۆلکە شاخەکە زۆر بەخێرایی دەڕواتو ئاواتی گەیشتن بەدڵدارە جوانو وردیلەکەی بەکێشی دەکات، یادەوەری ژوانەکانی پێشووش ساردیی ڕێگاکەی لەبیر ئەباتەوە.

دوای ئەوەی کەمێك هاتەوە سەرەخۆی، بەمشەوە لەنێو ئەو شاخەدا خۆی بینیەوە، کەمێك چاوەکانی بەچواردەوری خۆیدا گێڕا هەرهەمووی بەفربوو، بۆ ئەوەی هەست بەسەختی ڕێگاکە نەکات یان هیچ نەبێ ڕێگاکەی بۆ کورت ببێتەوە بەردەوام باوەشی ئەکرد بەیادەوەریەکانی مریەم، بەدەم زەردە خەنەوە، بەدەم ڕۆیشتنەوە، بەدەم سەرماوسۆڵەوە، جارێکیتریش گەڕایەوە نێو خەیاڵە گەنجیەکەی خۆیو خۆی تێهەڵکێشی ژوانەکانی پێشوو کردەوە، یەعقوب بەدەم ڕێگاوە بیری لەو عەسرە دەکردەوە کەدەمەو بەهاربوو:-

* * *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر،

## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

لەگوندەکەی ماڵی مریەم هەڵپەڕکێ زۆر گەرمە، مریەم لەگەڵ کچانی ناو دێ خەریکی هەڵپەڕینەو جارجاریش نیگا ئەکا بۆ یەعقوب، ئەویش هەموو دونیا لەچاوو برۆکانی مریەمەوە ئەبینێ و دڵیشی زۆر خۆشە چونکە پشتی داوەتە دیواری دووکانەی مام خدری باوکی مریم.

گەنج زۆر شێتە، زۆر سەیرە! لەزستانە ژوانێکی ئاوادا بەم شێوەیە بیر لەخۆشەویستەکەی دەکاتەوە، گەر بتوانین خۆمان بخزێنینە نێو زەین و بیرەکانی یەعقوب-ی گەنج کەلەوێ وەستاوە، مریەم-یش لەگەڵ کچانی هاوڕێیدا بەشێوە سلۆیەکی خەیاڵی هەڵئەپەڕێ، چاوە رەشەکانی ئەو کچە لادێییە یەك لەسەر یەك تیری عیشق ئەگرێتە دڵدارەکەی، ئەویش بەدەم ئازاری دڵ لەبەردەم دوکانەکەی باوکی دولبەر ئەتلێتەوە.

ئەم دوکانەی مام خدر جێی چاوبڕکێ ی گەنجانی گوندەکەیە، تاکە دوکانە لەم دێیە، مام خدریش زوو زوو شتەکانی تەواو ئەبێ، بەهۆی سەختی شوێنەکەیان زۆر درەنگ ئەچێ بۆ شارو کەل وپەلی نوێ ئەهێنێت، هەچۆنێ بێت کەمێك پێداویستیەکانی ئەو خەڵکەی پێدابین ئەکرێ، بەلام قورسایی هێڵی درامی ئەم دوکانە تەنهاو تەنها لەشەودا جێی ژوانی ئەم دوو عاشقەیەو هیچی‌تر، بۆیە چۆنیەتی جوڵەی رۆژانەی تیا نابینرێت.

ئەم دوکانە بەهەمان شێوەی دوکانەکەی مام حەمەد قادر لەقوڕو بەرد دروستکراوە، بەردەمەکەشی کەپرێکی خنجیلانەی هەیە تالەزستاندا باران نەیگرێتەوەو بۆ هاوینیش سێبەرێکی چاکە بۆ وەستانی پیاوانی ناودێ لەئێوارانـدا، بەهەمان شێوەی کۆبوونەوەی نێو دوکانی گوندەکەی خۆیان یەعقوب ئاشنایەتی لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی ئەم گوندەی ماڵی مریەم هەیەو

یەکتری باش دەناسن بەڵام کەسیان بەنهێنی پەیوەندی نێوان ئەم دوو عاشقە نازانێ.

* * *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

جارێکی‌تریش یەعقوب لەخەیاڵ دەرچوو، بەمشەوە بەردەوامە لەرۆیشتن بەرەو گوندەکەی دولبەر، هەربەنێو بەفرەکە وردە وردە سەرئەکەوت تاگەیشتە سەر تەپۆلکەیەکی‌تر، کەمێك کرێوەو بەفربارین وەستاوە بەڵام ساردە، چەند تارماییەکی بینی لەچواردەوری ئەخولانەوە! بەڵام زۆر گرنگی پێنەدا هەرچەندە بەبیریدا ئەهات کەلەوانەیە گورگ بێت! بەڵام ئەم گەنجە کوری نێو شاخ و بەفرە بەهیچ شێوەیەك ترسی لەوجۆرە گیانلەبەرە نیە، یەك لەدوای یەك تەپۆلکە شاخەکان ئەبرێ و بۆ کورتکردنەوەی رێگاکەی دووبارە خۆی خزاندەوە نێو خەیاڵی ژوانەکانی مریەم.

* * *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێلێکی باریکتر،
## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

ئەوکاتەی هەڵپەرکێ گەرم بوو، دوای نانخواردنی ئێوارە دووبارە گەنجان دەست ئەکەنەوە بەهەڵپەرکێ، تاشەویش کچان و کوڕان لەخۆشی یەکتر ئەو ناوەیان بەرنەئەدا، لەچەندین شوێنی جیاجیا چرای گەورەو بچووکیش داگیرساوە بۆ روناککردنەوەی شوێنی هەڵپەرکێ کەلەبەردەمی دوکانەکەی مام خدری باوکی مریەم دابوو، چەند چرایەکیش بەکەپری دوکانەکەدا هەڵواسرابوو.

کاکــه یــەعقوب-ی دڵــدارو ســەرکێش، کاکــه یــەعقوب-ی گــەنج لەبەردەمی دوکانەکەی باوکی ئەوکچە عەیارە وەستابوو بۆیە بەهۆی رووناکی چراکانەوە دەموچاوی بەتەواوی لەمریەم دیاربوو، ئەو دولبەرەش لەگەڵ هەموو سوڕانەوەیەکی نێو هەڵپەڕکێکەدا شنەشنی بۆ ئەکات و ئەو کوڕە گوندیە شێت ئەکات.

دوای پێکەنینی دوور بەدوریان لەگەڵ مریەم-دا یەعقوب هەڵێك وەرئەگرێ ئەچێتە نێو دووکانەکەی مام خدر، مریەم خانیش لەوچراخانەی نێو هەڵپەڕکێکەدا کەمێك لەولاتر نیگای تێبڕیوە، گەنجە شێتەکەش ئەگاتە لای مام خدرو داوای پاکەتێك جگەرەی لێدەکات، مام خدریش وەکو پیرەکانیتر بەوێنەی گەنج توانای هەڵپەڕکێیان نیە بۆیە لەنێو دوکانەکەی خۆی دانیشتبوو خەریکی شت فرۆشتن بوو چونکە ئەمە بژێوی ژیانیان بوو، چەند پیرەمێردێکی تریش لەدوکانەکە دانیشتبوون، دیار بوو لەگەڵ مام خدر بەقسەکردنەوە سەرقاڵ بوون.

* * *

## راچڵەکین و گەڕانەوە بۆ سەر هێڵی گشتی بەهاوکاری لقەجووڵە

یەعقوب لەو جۆرە خەیاڵانەدابوودووبارە تارماییەکان بەبەرچاویدا هاتوو چۆیان کرد! یەعقوب-یان لەگێژاوی خەیاڵ دەرهێنا و خستیانەوە نێو شاخە بەفرینەکە! ئەویش هەڵوەستەیەکی کرد لەبەرخۆیەوە ئەیووت:-

یەعقوب// لەوانەیە گورگ بێت.

دوای کەمێکی‌تر ڕۆیشتن، کەمێکی‌تر بیرکردنەوە، کەمێکی‌تر ڕوانین بەچواردەوری خۆیدا، سەرلەنوێ ئەیەوێ قەناعەت بەخۆی بکات کەلەم ڕێگای ژوانەدا نەترسێ، بۆیە لەبەرخۆیەوە ئەڵێ:-

یەعقوب// باگورگیش بێت.

بەمشەوە دەستی خستە سەر خەنجەرەکەی‌و بەردەوام بوو لەڕۆیشتن، زەردەخەنـەی نێـو زەماوەندەکـەی ئـەم بـەهارەی ١٩٩٤یـش بەرینـەداوە، پێکەنینەکەی تێکڵاوی ڕۆیشتنەکە ئەکرد بەڵام دەنگی لێوە نەئەهات، دواتر ئەهاتەوە بەرچاوی کە بەهەمان زەردەخەنە لەنێو دوکانەکە وەستاوە، مام خدر خەریکی ئامادەکردنی پاکەتە جگەرەکەیە، ئەویش بەمشەوە بەبێ‌دەنگ بەسەر ئـەو شـاخەدا ئـەڕوات‌و سـەیری بـەردەمی خـۆی ئـەکات، زەردەخەنـەش لـەلێوەکانی نابڕێـت، بەتێکـەڵاوکردنی هـەردوو دیمـەنی نێـو دوکانەکـەو ڕۆیشتنی سەرشاخ سووک سووک لەدڵی خۆیدا لەگەڵ خۆی ئەدوا:-

یـەعقوب// خـۆ مـام خـدر ئـەزانێ مـن جگـەرە نـاخۆم!
ئەشزانێ کە شەو گەڕامەوە بۆ دێکەی خۆمان ئەیـدەم
بەباوکم، ناشتوانم شەو لەوێ بمێنمەوە، چونکە بـەم
بەهارە خەڵك لەسـەربان‌و حەوشـەدا ئەخـەون مریـەم-
یـش ناتوانـێ بێتـە دەرەوە....ئـاخ....گـرنگ نیـە، مـن
ئەمەوێ چاوەکانی مریەم ببینم‌و پاکەتە جگەرەکەش
خۆش ئەوێ.

یەعقوب دووکانەکەی باوکی مریەمی زۆر خۆش دەوێ، مام خدریشی زۆر خـۆش دەوێ، هـەمووجار بەیـەعقوب-دا سـڵاو بـۆ بـاوك‌و دایکـی ڕەوانـە دەکـا، قسـەکانی مـام خـدر-یشـی خـۆش دەوێ، تەنانـەت ڕێگـا دوورو درێـژە ساردەکەشی خۆش دەوێ کەبەرەو دێکەی ئەوان دەڕوات، بۆیە یەعقوب ژیانی

خۆش ئەویٚ چونکە خوشکە مراوی تیایە، بۆیە چاوەکانی خۆیشی خۆش ئەویٚ چونکە خوشکە مرای پیٚ ئەبینیٚ، بۆیە تریٚ-شی خۆش ئەویٚ چونکە خوشکی مریەم-ە.

یەعقوب لەنێو دوکانەکەدا وەستاوە ئەیەویٚ پاکەتە جگەرەکە لەمام خدر وەربگریٚ بەلاٚم هەموو هەستو گوێچکەکانیشی داخستووە، هەرچەند مام خدری دوکاندار قسەی بۆ ئەکات، بەلاٚم تەنها گویٚی لەدەنگی دەهۆلٚو زوڕنای دەرەوەیە بەتێکەلاٚو بوون لەگەلٚ دەنگی قاچەکانی لەکاتی رۆیشتندا بەنێو شاخە بەفرینەکەدا، یەعقوب-ی گەنج دەورووبەرەکەشی نابینیٚ، کاتیٚ پاکەتەکە لەمامە گیانی دوکاندار وەرئەگریٚو پارەکەی ئەداتە دەست....ئەلٚێی بەسەر دونیاوەنیە.

* * *

مرۆڤی گەنج زۆر سەیرە، چاوو گوێچکەیەکی زۆر سەیریشی هەیە، هیچ ئەندامێکی لەشی لەژێر کۆنترۆلٚی خۆی نیە، هەرهەمووی وا لەژێر جادوی چاوە سیحراویەکەی مریەم-دا چاوڕیٚی فەرمانن، لەنێو دوکانەکەدا جارجار ئاور بۆ دەرەوە ئەداتەوە ئەبینیٚ مریەم لەگەلٚ کچانی هاوڕیٚی لەنێو هەلٚپەرکێکە هەلٚئەپەریٚ، شنۆی هاوڕیٚی بەردەوام شانی لەگەلٚدا جووت کردووەو لێی جیانابێتەوە، بەهۆی چرا رووناکەکانەوە زۆر بەجوانی دەموچاوە ووردیلەکەی مریەم-ی لێوەدیارە، جوولٚەی سنگو ملوانکەکانی زیاتر ئەقلٚی ئەو گەنجە لادێیە سست ئەکەن، کاتیٚ پاکەتە جگەرەکە لەم پیاوە پیرە وەرئەگریٚ ورد ورد لەنەشئەی چاوەکانی مام خدردا هەناسەکانی مرە گیان ئەخواتەوەو پاکەتەکەش ئەخاتە گیرفانی.

* * *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

جارێکیتریش بەدەم ڕێگاوە تارماییەکان دەوری ئەم گەنجە ئەگرن و سەرلەنوێ ون ئەبنەوە، ئەویش ترسی گورگەکانی بەلاوە گرنگ نیە بەڵکو زۆری پێناخۆشە بەراچڵەکاندنێکی ئاوا جارێکیتریش لەوخەیاڵە ئیشق ئامێزەی دەرئەهێنن و ئەیخەنەوە بەرئەوسەرما و سۆڵەی نێو بەفری ئەو شاخانە. بۆیە بەدەم ڕێگاوە هەوڵ ئەدات هەرچی سەرمای ئەوشەوە هەیە بیچێژێ بەلام بۆ تەنها ساتێك بگەڕێتەوە نێو خەیاڵی کچە چاوبازەکەی ئەو گوندە یان هیچ نەبێ دیمەنەکانی باوکی مریەم-ی عەیاریش بێتەوە بەرچاوی هەر پێی خۆشە، یەعقوب-ی گەنج هەربەدەم ڕێگاوە دوای وون بوونی تارماییەکان دیسانەوە خۆی خزاندەوە نێو خەیاڵەکانی گەنجێتیی، ئەوەتا بیر لەمام خدری باوکی مریەم ئەکاتەوە، بەدەم ڕۆیشتنەوە لەگەڵ خۆی ئەدوێ:-

یەعقوب// (وڕێنەی گەنجێتی ئەکات و لەدڵی خۆیدا ئەدوێ) مام خدر پیاوێکی زۆر لەسەرەخۆو تێگەیشتووە، لەچاوەکانی دیارە منی زۆر خۆش دەوێ....ئم....بەخوا بەس داوای مریەم بکەم بەکراسەکەی خۆی پێشەکەشم دەکات....ئم....لەم ماوەیە هەر ئەبێ داوای بکەم....ئم....سەبرم نەما....مریەم گیان بەقوربانی بالات بم لەم نزیکانە دەست لەملانت دەبم و ئەتکەم بەبووکێکی جوان....بەخوا لەیەکەم شەودا هەزاران جار لەدەورت ئەگەڕێم....بەقوربانت بم مەیمون گیان، بەساقەت بم مراوی گیان.

ئـەم گەنجـە دڵ تـەڕە لـەو جـۆرە بیرکردنەوانـەدا بـوو، لەسـەر شـاخە بەفرینەکەدا بەخێرایی دەڕۆیشت، بەفرباریـن و کڕیوە نـەمابوو بـەڵام هەوایـەکی سـاردی هـەبوو، هـەمووگیانی گـەرم داهـاتبوو وهەسـتی بەسـەرما نـەدەکرد چونکە زۆر بەخێرایی دەڕۆیشت، بزەش لێوەکانی بەجێ نەدەهێشت، زڵلەکەی مریەمی بیرکەوتبووەوە لەگەڵ هـەموو هـەنگاوێك قاقایـەکی لێدەداو خەندەش لەگـەڵ دەنكـە بـەفرە بەسـتووەکاندا بەسـەر دەموچـاویدا بـڵاو ببـووەوەو کەمێکیش لەسەر سمێڵە تەنکەکەی وەستا بوو.

یـەعقوب// (بەپێکەنینـەوە بەدەم ڕۆیشتنەوە) بـەخوا

مریەم گیان شەقە زڵلەکەشت هەر خۆشە.

کـەمێك لەشـوێنی خـۆی وەسـتاو هەربـەدەم پێکەنینـەوە سـەیرێکی دەوروبەری خۆی کردو کەمێك لەپێش و پشـتی خـۆی ڕامـا، بـەڵام هـیچ شـتێکی بەدی‌نـەکرد، هـەنگاوی بـەرەو پێشـەوە نـاو بـەدەم ڕۆیشـتنەوە جـارێکی‌تریش گەڕایەوە نێو خەیاڵەکانی زستانی پارو بەم شێوەیە ئەهاتەوە بەرچاوی.

*   *   *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر،
## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

لەزستانی رابوردو لەشەوێکی درەنگ وەختدا یـەعقوب لـەژوانێکی‌تردا لەگـەڵ مریـەم لـەژێر کـەپری دوکانەکەیانـدا بەجووتـە وەسـتا بـوون، خوشـکە بچووکەکەشی (ترێ) گیان بەئاستەم دەرگای دوکانەکەی ترازاندبوو بۆ ئەوەی چاوی لـەوان‌و ماڵـەوەش بێـت نـەبادا لـەپڕ بـاوکی یـان دایکـی بێـت بـۆ لایـان، یـەعقوب لەگـەڵ مریـەم کـەمێك لـەترێ دوور بـوون‌و هـۆش‌و ئاگایـان لـەخۆیان نەمابوو! یەعقوب مەست‌و حەیرانی بۆن مێخەکەکەی مریەم بووبوو ومریـەم-

یش سەرخۆشی نێو باوەشەکەی یەعقوب بووبوو، لەپڕ لەناو دوکانەکەدا خوشکە بچووکەکەی هاواری لێهەستا:-

تریێ// مریەم خێراکە گوێم لەدەنگی باوکمە!

مریم بەهۆی شپرزەیی خۆیو ترسی باوکی خۆی لەنێو باوەشی یەعقوب بیرچووبووەوە، بۆیە بۆ ماڵئاوایی دەستێکی کردە ملی یەعقوبو ماچێکی ناو دەمی کرد، ئەویش لەخۆشیا ئەقڵی پێنەما هەرئەوەندەی خۆش بوو دەستی کردە ملی مریەمو تێروپڕ ناو دەمی مریەمی ماچ کرد، مریەمیش وەکو نازی هەموو کچێك خۆی رادەپسکاندو لێ دوور دەکەوتەوە، ئەیویست بەر لەوەی باوکی بگاتە ئەوێ، بەزووترین کات بچێتە نێو دوکانەکەیانو دواتر بۆ ژوورەوە، بەڵام یەعقوب توند ئەو کچە لادێییەی گرتبووو بەرینەئەدا، تاوێك بەم شێوەیە راکێش راکێش مانەوەو دواتر یەعقوب گازێکی بچووکی لەلێوەکانی مریەم گرت، ئەویش بەزریکەیەکی نزم یەك دانە شەقەزللەی گرتە پەنا گوێی یەعقوبو رایکردە ژوورەوە.

یەعقوب لەدواوە هەرسەیری دەکردو دەستیشی گرتبوو بەبن گوێی خۆی، کەلەچاو وون بوو تریێ-ش بەسووکی دەرگای دوکانەکەی داخست، ئەویش لەدەرەوە سوپاسێکی گەرمی خوای کردو دەستی بەروومەتو شوێنی شەقەزللەکەی مریەم ئەهێناو ماچی دەکرد، دواتر بەخێرایی ئەو ناوچەیەی بەجێهێشتو گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆیان.

*　　*　　*

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

یەعقوب لەسەر شاخەکە زۆر بەخێرایی ئەڕۆیشت، دەستی گرتبوو بەپەنا گوێی‌و لەو شەوە ساردو پڕبەفرەدا بەپێکەنینەوە لەبەر خۆیەوە ئەیووت:-

یەعقوب// (بەپێکەنینەوە) خوایە گیان من زۆر سوپاسی تۆ دەکەم کەمریەمت بەمن بەخشی، من هەرگیز لەیادم ناچێت، مریەم گیان توڕەبوونەکەشت خۆشە....مراوی گیان شەقە زللەکەت زۆر بەتامە.

*        *        *

یەعقوب ئەمشەو بەرەو ژوان ڕێگەی چەمەکەی نەگرتبوو بەڵکو ناو شاخەکەی بەلاوە خۆشتر بوو، چونکە هەرئەوەندە قوڕس بوو کە بگەیشتایەتە بەرزاییەکە زووتر روونـاکی چراکانی ناو دێی لێوەدەر دەکەوت‌و زووتر بەمریەم شاد دەبوو، لەلایەکی‌تر ئەمشەو دەمانچەشی پێنیە تەنها یەک خەنجەری هەڵگرتووە، سەرلەئێوارە باوکی داوای لێکردبوو کەدەمانچەکەی بداتێ چونکە عەسر باوکی خەریکی هەڵوەشاندنەوەو پاککردنەوەی تفەنگەکەیان بوو، جائەگەر لەچەمەکەوە تووشی گەلەگورگ بێت بەتەنها خەنجەرێك دەرەقەتیان نایەت. هەروەها ئەمشەو بارانەکەی لەشەوانی پێشوو زۆرترەو چەمەکەش ئاوێکی زۆری هەستاوە، لەهەندێ شوێن ڕێگەی رۆیشتنی لێگیراوە ئەبێ دووبارە سەرکەوێ بۆ سەر شاخەکە، بۆیە بەیەکجاری ڕێگای ناوشاخەکەو ڕۆیشتنی ژێر بەفری هەڵبژارد.

یەعقوب بەمشەوەو بەمشێوەیە لەگەڵ خۆی ئەدوا، بەردەوامیش بوو لەڕۆیشتن بەسەر ئەو شاخە بەفرینەدا، دەستیشی گرتبوو بەپەنا گوێی، ئاواش یادی لێدانەکەی مریەم گیانی دەکردەوە، هەربەمشەوە سارده بەدەم ڕۆیشتنەوە دەستی لەسەر روومەتە ساردەکەی ئەخزاندە نێو دەمی‌و بەیادی

شەقەزللەکەی دولبەر تێر تێر ماچی دەکردو لەبەر خۆیەوە وەکو شێت پێئەکەنی.

عاشقە شێتەکە بەسەر شاخەکەدا ڕێئەکات، خەریکە بەفروکڕێوە دووبارە بەهێزتر ئەبێت! تاقووڵە پێی لەناوبەفردایە، ریش و سمێڵە تەنکەکەشی کەمێك بەفری گرتووە، ئەمەیان قەیناکە کەگەیشتە ئەوێ مرەخان هەمووی بۆ ئەتەکێنێ و ماچیشی دەکات، قسەی خۆمان بێت ئەم گەنجە عاشقەش زۆری پێخۆشە. شێتەی دڵدار هەست بەسەرما ناکات چونکە بەرەو ئامانجێك ئەڕوات، لەوێش مراوی خان لەبالای دەئالێ و هەموو گیان و هەستی گەرم دەکاتەوە، ئەم گەنجە لادێییەش بەشی خۆی ئەزانێ بۆیە گوێ بەسەرما نادات چونکە گەرمی لەشی مریەم-ی پێخۆشە.

* * *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر،

## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

بەدەم ڕۆیشتنەوە هاتەوە یادی لەناو هەڵپەڕکێکەدا لەگەڵ مریم دەستی یەکتریان گرتووەو بەجووتە هەڵئەپەڕین، خۆ ناشوێرن هیچ قسەیەك لەگەڵ یەکتردا بکەن تەنها دەستی یەکتر ئەگوشن، شان لەشانی یەکتر ئەخشێنن، ئاخ هەڵئەکێشن، دواتر بەتێڕامانێك لەبیرکردنەوەیدا لەسەر تەنیش بەقووربان بوونێك ئاڕاستەی چاوەکانی مریم دەکاتو ئەویش بەدەم هەڵپەڕکێوە لەبەردەمی چراکان لەدڵەوە پێی ئەڵێ:-

مریەم// (بەدەم هەڵپەڕکێوە) یەعقوب گیان لەدەورت

گەڕێم....ئۆخەی ئەوە تۆیێ!

*   *   *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

ئاخ....گەنجێکی ئاوا سەرەڕۆ، عاشقێکی ئاوا شێت، تەنها چەند شەوێك لەزستانی رابردوو دولبەرەکەی گرتۆتە باوەش، ئەوەتا ئەیەوێ ئەم زستانەش بەهەمان ئاوێزان بوونی پار تامو بۆی مرە گیان بکات، بەڵام ئەگەر گەلە گورگ ڕێگەی بدەن. ئەوەتا جارێکیتریش تارماییەکان لەیەعقوب نزیك بوونەوەو خەیاڵەکانیان پچڕاند، سەرلەنوێ لەخەیاڵی باوەشی کچە وردیلەیەك دەریانهێناو دووبارە خستیانە سەر ئەم شاخە ساردو پڕ بەفرە، خۆی کوڕی ئەوشاخانەیە ترس لەگیانیدا نەچێندراوە، ئەو چەندین شەو بەتەنها ئەو گورگانەی راوناوە تابەتەواوی دووری خستوونەتەوە، ئەو لەهیچ ناترسێ بەڵام بەفروبا ساردەکە نەیاندەهێشت تارماییەکانی بۆ روون بێتەوە! دوای تاوێکی کەم هەر بەدەم ڕۆیشتنی خێراوە تەنافی زەینی تێکرتن بەتەواوی بۆی

دەرکەوت چەند گورگێکن! رۆیشتنەکانی خێراتر کرد! خەریکە ترس سیمای دائەپۆشێ! لەبەر خۆیەوە پرتەو بۆڵەی ئەهات:-

یەعقوب // (لەبیرکردنەوەیدا) لەوانەیە ئەم شەو لەکاتی دیاریکراودا نەگەمە ماڵی مریەم، خۆ ئەشزانم ئێستا مریەم چاوەڕێمە، کاتی گەیشتنەکەشم ئەزانێ، بەخوا گەر زیاتر دوا بکەوم شێت ئەبێ.

*　　*　　*

**هێلی گشتی بەردەوامە........**

**کات**

**دوای نیوە شەوە**

**سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٩٤ـە**

**یەعقوب بیر لەڕاکردن دەکاتەوە تا خۆی لەو گورگانە رزگار بکاتا**

یەعقوب ئەمشەو تەنها یەك خەنجەری پێیە، ئەگەر تەنها گورگێکیش بێت بەهەرحاڵ ئەتوانێ زاماری بکات، بەڵام نەدانەیەك‌و نەدووان! رەنگە ئەستەم بێ ئەمشەو لەدەست ئەم گورگانە دەرچێت! لەوانەیە نەتوانێ بەبالآی مریەم بگات! ئایا ئەمشەو ئاواتی ساڵێکی دووری بێتە دی‌و تێر تێر چاوەرەشەکانی مریەم ماچ دەکات؟

بیرەکانی چڕکردبۆوە! بەدەم رۆیشتنی خێراوە بەهەرچواردەوری خۆی ئەیڕوانی‌و ئەخولایەوە، هەندێجار بەپشتا ئەڕۆیشت بۆ ئەوەی دواوەی لێوە دیاربێت! چەند هەنگاوێکیش بەخێرایی رووەو پێشەوە هەڵمەتی ئەبرد. تارماییەکانی ئەبینی! زۆر ئەترسا! هەردوو دەستی رووەو تەنیشت‌و پێشەوە

لەجوڵە دابوون! خەنجەرەکەشی لەمشتدا بوو! بڕیاری دابوو ئەگەر ئەو گورگانە زیاتر لێی نزیك ببنەوە ئەویش هیچ دەستیان لیٚ نەپاریٚزیٚ.

یەعقوب بەردەوام بوو لەڕۆیشتنی خێرا، بەردەوام بوو لەئاوڕدانەوە، بەردەوام بوو لەخولانەوە بەچواردەوری خۆیدا، بەڵام بێسوود بوو، ووردە ووردە تارماییەکان لێی نزیك بوونەوە! بەتەواوی پشتو پێشیان لێگرت! تاکا گەیشتە ئەوەی پەلاماریانداو کەمێك برینداریان کرد! هەرچەندە یەعقوب زۆر بەخێرایی خەنجەرەکەی ئەوەشاند، لەگەڵ ئەوەشدا دەستی کرد بەڕاکردن. کوڕی پەروەردەی نێو شاخان لەو جۆرە گیانلەبەرە ناترسیٚ، بەڵام گورگەکان ژمارەیان زۆر بوو! زۆریش تەنگیان پێهەڵچنیبوو! بۆیە ڕێگەی چوونە ناو گوندەکەی ماڵی مریەم-یان پێگۆڕیو سەرلەنویٚ گەڕایەوە بەڵام بەلای ڕاستدا بەرەو خواربووەوە.

* * *

ئەگەر پشت بکەیتە گوندەکەی ماڵی یەعقوبو لەدواوە سەیری ئەو گەنجە بکەیت کەرووەو دێکەی ماڵی مریەم ئەڕوات، ئەوا چەند ڕەزو باخێك لەنێوان هەردوو گوند هەیەو ئەکەونە بناری شاخەکان بەلای دەستە ڕاست.

* * *

قەپگرتنی گورگەکان لەگەڵ ڕاکردنو وەشاندنی خەنجەری یەعقوب لەسەر تەپۆلکە شاخەکە بەرەو ڕەزوباخەکانی نێوان هەردوو گوندەکە دابەزین، یەعقوب لەترسی گوگەکان بەقاچەکانی ڕادەکات، بەدەستەکانی خەنجەر دەوەشێنیٚو برینداریان دەکات، بەهۆشو زەینیش بیرلەگەیشتنی یەکیٚ لەخانووە گڵەکانی نێو ڕەزەکان دەکاتەوە کە هەر ڕەزەوانێك لەناو ڕەزەکەی خۆیدا دانەیەکی بۆ پێداویستی خۆی دروست کردووە، ترپەی دڵیشی لەگەڵ تیژ ڕۆیشتنەکەیدا تەریب ئەبێت، ئەم گەنجە لەتاو مەرگ هەست بەسەرمای

بەفرو با ناکات، ئەو بیر لەدەربازبوونیی دەکاتەوە، بەدەم ڕاکردنەوە ئەیوب-ی برای دێتەوە بەرچاو کەلەشەوێکی سەرماو سۆڵەی بەفراویدا لەساڵی ١٩٩٢ لەکاتی گەڕانەوەیان بۆ گوندەکەی خۆیان بۆ باشووری کوردستان پاسدارەکان لەسەر سنووری ئێران ئەیانگرن‌و لەنێو ڕەبیەکەیاندا بەبەرچاوی خۆی‌و دایك‌و باوك‌و کامەران‌و بەیان-ی خوشکی....هەروەکو ئەسپ ناڵی ئەکەن‌و ئازاری زۆری ئەدەن! یەعقوب ئاوا لەدەست گورگەکان ڕائەکات‌و ئاواش بیر لەبراکەی دەکاتەوە کەچۆن‌و بەچ شێوەیەك ئازاریان داو دواتر دەرخواردی گورگەکانی سەر سنووری عیراق ئێرانیان داوە:-

ئەو خێزانە هەژارە لەساڵی ١٩٩٢ دوای ئەوەی بڕیاری گەڕانەوە لەرۆژهەڵاتی کوردستانەوە بەرەو باشوور ئەدەن! لەشەوێکی زۆر سارددا ئەیانەوێ لەسنوور بەرەو ناوچەی حاجی ئۆمەران بێنە ژوورەوەو لەوێشەوە بۆ گوندەکەی خۆیان، بەڵام لەکاتی کەمینی پاسدارەکان هەرشەشیان ئەگیرێن‌و بەرەو رەبیەکانی سنوور ئەیانبەن! لەوێ زۆر شتیان لێ ئەپرسن، لەهەموو وتووێژەکانیان ئەکۆڵنەوە دواتر بۆیان دەرئەکەوێ خێزانێکی عیراقین‌و ئاوارەی ئێرانن، دوای ڕاپەڕینیش ئەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان.

یەعقوب بەدەم ڕاکردنەوە ئاوا بیر ئەکاتەوە، بەڵام تەنها جووڵەی وێنە ڕابردووەکان وێنا ئەکات، دەنگەکانیش بەدەم ڕاکردنەوە تەنها هات‌وهاواری گەلە گورگەکەی چواردەوریەتی کەگوێچکەیان پڕکردووە، یەعقوب بەمشەوە بەدەم ڕاکردن بەرەو خوار ئەبێتەوە بۆ نێو ڕەزەکان، هەوڵ ئەدات بەزووترین کات بگاتە نێو یەکێ لەژوورەکانی رەزەوانەکان، لەکاتی ماندوو بوون‌و ڕاکردندا دێتەوە بەرچاوی:-

*   *   *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر،

## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

ئەندامانی خێزانەکەی هەرشەشیان لەوشەوەدا لەنێو ئەو رەبیەیەدا دەستبەسەرن و پاسدارەکان لێیان کۆبوونەتەوە، ئەو خێزانە شەشە کەسیە بێ دەسەڵاتە لەشەوێکی ئاوادا لەژێر دەستی دژمنێکی ئاوادا زۆر ئەترسن! ئەیوبی برای بەهۆی دەستێ جلی کوردی پێشمەرگانەوە سەرنجی شۆڤینیەتی ئەوان رائەکێشێ! زۆریش رقیان لێیەتی بەبەردەوامی لەنێو ئەندامانی خێزانەکەیدا بەقینەوە سەیری ئەکەن و مۆڕەی لێئەکەن.

* * *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

یەعقوب بەدەم راکردنەوە ئەو دیمەنانەی نێو رەبیەی پاسادارانی لەبەرچاوە بەڵام دەنگەکان لووڕەو هاتەهاتی گورگەکانی چواردەوریەتی کەبەبێ ئاڕەزووی خۆی بەرەو خوارەوەو نێو ڕەزەکان ئەیبەن، راکردنەکەشی زۆر ناخۆشە، چونکە سەربەرەو خوار رائەکات ئەبێ ئاگای لەخێرایی خۆی بێت کەلەژێر کۆنترۆڵی خۆیدا نیە، ناشتوانێ خاوبێتەوە چونکە گورگەکان بەچەند قەڵەمبازێك ئەیخەنە ژێر خۆیان. یەعقوب بەم شێوە راکردنە بیر لەو شتە جەرگبڕانەی پێشوو ئەکاتەوەو بەدەم خەنجەر وەشاندنیشەوە زۆر بەخێرایی رادەکات! هەرچەندە رۆیشتن بەرەو نزمایی هەوای ساردی کەمتر ئەبێ، لەو تیژ رۆیشتنەشدا گورگێك قەپێکی چاکی لێگرت! ئەویش زۆر ئازاری پێگەیشت، هاوارەکەی تێکەڵ بەهاواری ئەیوب-ی برای بوو.

* * *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێلێکی باریکتر،
## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

ئەهاتەوە بەرچاوی لەنێو پاسدارەکان لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی دەست بەسەر بوون و ئەیوب–یش لەدەرەوەی رەبیەکە بەچوارپەل ناڵکراوی و خوێناوی هاواری بۆ باوکی دەکرد:–

ئەیوب// باوکە گیان، دایکە گیان، فریام بکەون!
گورگ خواردمی!

ئەوانیش هەر پێنجیان لەژوورەوە بەدە پەل هەڵدەپەڕین، بەدە چاو ئەگریان، بەپێنج دەم لەپاسدارەکان ئەپاڕانەوە، بەڵام دوژمن زۆر قین لەدڵە، دوژمن زۆر بێ ویژدانە، دوژمن زۆر دڕندەیە، زۆریش بێئەخلاقە نە ئەیانهێشت کس وکارەکەی بچنە دەرەوە بۆلای، نە خۆیان ویژدانیان ئەجوڵا تا ئەیوب لەدەست ئەو گورگە هارو برسیانەی دەرەوە رزگار بکەن! وەهەرگیز رزگاریشی ناکەن چونکە ئەوە پیشەی دوژمنانی کوردەو تاهەتایەش لەسەری بەردەوام ئەبن.

*　　*　　*

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

یەعقوب تاگەیشتە ناو ڕەز بەتەواوی خوێنی لێئەچۆڕا، سات لەدوای سات جلەکانی زیاتر بەخوێن تەڕ ئەبوون، بەتایبەتی قاچی چەپی زۆر بریندار بوو وشەڕواڵەکەی سوور کردبوو، گورگەکانیش بەبۆنی خوێن زیاتر هەڵمەتیان بۆی ئەبرد! هەموو قەپگرتنێکی گورگەکان! یەعقوب هاوارێکی لێهەڵئەستا و لەزەینی برایەتیەکی دڵسۆزانەوە تێکەڵاو بەهاوارەکانی ئەیوبی برای ئەبۆوە کەلەساڵی ١٩٩٢دا لەدەرەوەی رەبیەی پاسدارەکان لەسەر سنور

داوای یارمەتی لەباوك و دایك و برای ئەكرد بۆ ئەوەی بێن بەدەنگیەوەو خەریكە گورگ ئەیخوات! یەعقوب بەدەم راكردنەوە ئاوا بیری لەبرا گورگ خواردووەكەی ئەكاتەوەو ئاواش دێتەوە بەرچاوی.

یەعقوبی گەنج بەردەوامە لەگەڵ راكردن و خەنجەر وەشاندن! گورگەكانیش لەقەپ گرتن هیچ قصوریان نەدەكرد! ئەوگەنجە هێشتا بەپێوە رادەكات و هێزو تینی تیاماوە بۆ بەرگریكردن لەخۆی، بۆ بەرگریكردن لەچاوەڕوانی مریەم، بۆ بەرگریكردن لەشووشە عەترەكەی تریێ، بۆیە هەموو هەڵمەتێك بەكار دەهێنێ بۆ گەیشتنە ناو ژووری رەزەوانەكان كەلەناوەڕاستی هەر ڕەزێك دروستكراوە.

ئاخ....ئەگەر ئەوگەنجە نەتوانێ بگاتە ئەوژوورە كەباخەوانەكان بۆ پێداویستی رۆژانەیان دروستیان كردبوو ئەوا كار لەكار ئەترازا! هەموو خەیاڵ و خەونەكانی یەعقوب بەرامبەر بەمریەم لەناو سكی گورگەكان قوڵپیان ئەدا! لەوانەیە بەتەنها كەللەی سەرو چەند لولاقێكی لەوێ بمایەتەوە، ئەویش ئەگەر رەزەوانەكان بۆ بەیانی یان چەند رۆژێكیتر بەدیانبكردایەو بانگەوازێكیان بەناو ناوچەكەدا بكردایە، دواتر بەهۆی جلە خوێناویەكان ئەوگنجە سەرشێتەیان بناسیایاتەوە، جا ئیتر ئایشێ خانی دایكی و مەلا عەلی باوكی دوای ئەو هەواڵە یەكسەر دڵیان ئەوەستێ و ئەمرن.

یەعقوب بەناو بەفرەكەدا بەخێرایی رایدەكات گورگەكانیش بەبۆنكردنەوە بەدوای خوێنە رژاوەكەو قاچە بریندارەكەی گوڕیان بەستبووەوە، جارجارە پێش و پشتیان لێئەگرت! ئەویش سات لەدوای سات لەژووری نێو ڕەزەكە نزیك ئەبووەوە. ئەو گەنجە بەدەم راكردنەوە سەری هەڵبڕی، هەرچەندە شەوەو بەفریش كەمێك ئەباریێ بەڵام بەتەواوی ژوورەكەی لێوەدەركەوت، چواردەوری ژوورەكە بەپانی چوار پێنج مەترێك چۆڵەو بەبەفر

داپۆشراوه، هیچ بنەدارێکی لێنیه، کانیوئاوێکی بەتەنیشتەوەیە کەیەك پارچە بەبەفر داپۆشراوه، بەڵام ئاوی کانیەکە نەیبەستووەو لەسەرەخۆ لەژێر بەفرەکەوە ئەڕوات و بەهێمنی خوڕەی دێت، یەعقوب-ی گەنج لەبەرزاییەکەوە بەدەم راکردن سەیری تەواوی رەزەکە دەکات و ئەوەتا گەیشتە نێو چڕی بنەدارەکان لەبەردەم گورگەکان رادەکات و بەهۆی تیژ ڕۆیشتنیەوە جارجار خۆی بەدرەختەکان دەگرێتەوە بۆ ئەوەی نەکەوێت! چونکە گورگەکان دەگەنە سەرسەری و کارلەکار دەترازێ.

زۆر بەخێرایی گورگەکانی بەجێهێشت و گەیشتە ئەوبۆشاییەی ناوەڕاستی رەزەکە کەخانووەکەی تیا دروستکرابوو، بەتەنیشت کانیاوەکە تێپەڕی و گەیشتە بەردەمی ژوورەکە، دەرگاکەی کردەوە کەبەزنجیرێکی باریك وەك داخستنێکی کاتی جووتکرابوو، هەر بەو تەوژمی راکردنەوە بەبریندار ی خۆی پیاکرد.

*   *   *

## هێلی گشتی بەردەوامە........

## کات

## دوای نیوە شەوە

## سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٩٤ـە

## یەعقوب گەیشتە ژووری باخەوانەکانی نێو رەز

لەژوورەوە پشتی نووساندبوو بەدەرگاکە، دواتر بەخێرایی چاوی دەگێڕا بەنێو ژوورەکە، چەند کەلوپەلێکی بینی و هەرهەمووی خستە پەنا دەرگاکە بۆ ئەوەی لەدەرەوە گورگەکان نەتوانن بیکەنەوە یان بەهۆی پاڵنان و کۆبوونەوەیان لەودیو دەرگاکە بکرێتەوە.

یـــەعقوب// (کەئەگاتـــە ژوورەوەو هەناســـەیەك هەڵئەکێشێ) ئاخخخخخ.......

عاشـقی برینـدار لـەژوورەوە دەرگاکـەی داخسـتو خۆیشـی بـەپێوە وەسـتا....پشـتی نووسـاند بەدەرگاکـە، زۆریـش ئەترسـا! لـەکاتی راکردنـدا لەترسی گورگـەکان ئاگـای لەهەڵتـەك هەڵتـەکی ناوسـکی نـەبوو! بـەڵام ئێسـتا هەست بەووشك بوونی ریخۆڵەکانی دەکات، هەست بەگوێزانێك دەکات بەنێو قوڕقوڕاگەیدا ئەچێتە خوارەوە، هەست بەتێنوێتی ئەکات، هەست بەماندوێتی قاچەکانی دەکات.

لەگەڵ قایمکردنی دەرگاکە لەسەرخۆ بیری لەبرینداریو مردنی خۆیی دەکـردەوە، بـیری لـەمردنی ئـەیوب-ی بـرای دەکـردەوە کەپاسـدارەکان زۆر بەناهـەق کوشـتیان، زۆر دوور لەخواپەرسـتی ئەوگەنجـەیان لـەناوبرد، زۆر بەشێوەیەکی دڕندانە کوشتیان، زۆر بێشـەرمانە بەبەرچاوی کەسوکارەکـەی هەر بەزۆرەملێ شەهیدیان کرد.

دوژمنانمـان لەشـەهید بوونمـان تێـر نـاخۆن، شەهیدلووشـانی ئێمـە هێندەی دەریا لووشێك لێی قووت داوین، لەچوار کوڕی خێزانەکـەی مـەلا عـەلی یەعقوب-ی گەنج خۆی وەکو تاقە کوڕی خێزانەکـەی ماوەتـەوە، زۆر ئەترسێ ئـەویش لەناوبچـێ! بۆیـە بیرلـەخوا دەکاتـەوەو لەپشـتی دەرگاکـە وەسـتاوەو لەگەڵ خۆی ئەدوێ:-

یـەعقوب// (لەپشـتی دەرگاکـە وەسـتاوە لـەزەینی خۆیـدا قسـە دەکـات) خوایـە گیـان تـۆی گـەورەو میهرەبان ئێمەت بۆ گـورگ دروسـت کـردووە؟! بۆچـی ئێمـە هـەموومان گـورگ خـواردوو ئـەبین؟! ئـەیوب-ی بـرام پاسـدارەکان بەبەرچـاوی خۆمـان دەرخـواردی

گورگیان دا! کامەرانی برام بەبەر چاوی خۆمو باوکم
ســـەربازەکانی عــیراق دەرخـــواردی گورگیــان دا!
لەوانەیــە بەعسـیەکان یوسـف-یشـیان دەرخـواردی
گـورگ دابێـت! ئـەویش هـیچ سـۆراخێکی نیە، ئێستا
خۆشــم بــەگورگ چــواردەورم گــیراوە! نــازانم ئــەم
چارەنووسەی ئێمە چیەو چۆنە؟!

گورگـەکان گەیشـتنە بـەردەرگاو خەیاڵـەکانی یـەعقوب-یـان شـڵەقاند! رایانچڵەکاند! لـەدەرەوە بەنینۆکـەکانیان دەرگاکـەیان ئەڕنیـەوە! بەچواردەوری ژوورەکـەدا ئەسـوڕانەوە! هاتوهـاوارو لـوورە لووریـان ئـەو نـاوەی هێنـابووە لەرزین.

تـەنها بەگێڕانـەوە سـانایە....ئەگـەر یـەعقوب کـوڕی ئـەو شـاخوداخو بەفرە نەبوایە یـان هەرکەسێکیتر لـەجێی ئەوبوایە بێدواکەوتنو دەستبەجێ لەترسی ئەو گورگە هارو برسیانە دڵـی لەلێدان ئەکـەوتو مریـەم-یـش بەتـەنیا دەمایەوە.

ئەو گەنجە عاشـقە لەژوورەوە پشـتی نووساندبوو بەدەرگاکـە، بەداخو ترسـێکی زۆرەوە سـەیری دارودیـواری ژوورەکـەی دەکـرد! لـەزەینی خۆیـدا هەرلەرەبیـەی پاسـدارەکان ئەچـوو، هەرچـەند یـەعقوب سـەیری دیوارەکـانی ناوەوەی دەکرد چاوە گێژەکانی بەسەر ناوەوەی رەبیەی پاسداران دەنیشتەوە کەدووسـاڵ پـێش ئێسـتا لەسـاڵی ١٩٩٢ لەسەرسـنوری عیراق ئێران گیرابوون، ئەهاتەوە بەرچاوی چۆن:-

* * *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر،
## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

خێزانەکەی یەعقوب هەر شەشیان لەنێو پاسدارەکان دەست بەسەربوون! بەرپرسی ڕەبیەکە سەیری ئەیوب-ی دەکردو لەگەڵ ئەوانی‌تر ئەیانچرپاند! ئەوان زۆر بەرقەوە سەیری ئەیوب-یان دەکرد، زۆر مۆڕەو خێسەیان لێدەکرد، زۆریش رقیان لەجل‌وبەرگەکەی بوو کەلەهی پێشمەرگە ئەچوو، ماوەیەك بەم شێوەیە بەبێ دەنگی لەنێو ئەو ڕەبیەیە مانەوە هەر ئاواش بەرقەوە سەیری ئەیوب-ی داماویان دەکرد، ئەو خێزانە هەژارە بەردەوام ڕوانینەکانیان لەگەڵ یەکتردا ئەگۆڕیەوەو بەچاو پرسیاریان لەیەکتر دەکرد ئاخۆ ئەبێ چارەنووسمان چی بێت؟! ئایشێ خانی دایکی یەعقوب سەری هەڵدەبڕی‌و لەخوا دەپاڕایاوە کەرزگاریان بکات بەڵام بەبێ دەنگ ئەو داوایەی دەکرد تەنها لێوەکانی دەجووڵانەوە، پاسدارەکانیش سەیری ئەوانیان دەکرد، دواتر سەیری یەکتریان دەکردو پێدەکەنین وەك گاڵتەپێکردن بەو خێزانە کوردە، لەپڕ لێپرسراوی پاسدارەکان هاواری کرد بەسەریانداو ڕووی کردە ئەیوب:-

لێپرسراو پاسداران// (ڕوو دەکاتە ئەیوب زۆر بەتووڕەییەوە قسەکانی ئاراستە دەکات) تۆ پێشمەرگەیت.

ئەیوب// نەخێر ئێمە ئاوارەین‌و ئەگەڕێینەوە بۆ گوندەکەی خۆمان.

لێپرسراو پاسداران// (هاوار ئەکات بەسەریدا) کوری سەگ، ئەوەتا جلی ئەو خائینانەت لەبەردایە، تۆ پێشمەرگەیت.

سەرجەم پاسدارەکان قۆنداخەی تفەنگەکانیان ئاراستەی سەرو ملی ئەیوب ئەکەن‌و بەبەرچاوی دایك‌و باوك‌و خوشك‌و براکانی زۆر بێشەرمانە بەلێدان دایئەگرنەوە، خوێن لەسەرو دەم‌ولوتی دێتە خوارێ، پاش لێدانێکی زۆرو هاوارو قیژەی دایك‌و خوشکی‌و گریانی باوك‌و براکانی سوکایەتیەکی بێ وێنەیان پێئەکەن. کابرای لێپرسراو بەسەرسەری ئەیوب وەستاوە، بەسەریا هاوار ئەکات هەروەکو قەرزی باوکە گەماڵەکەی لەلابێت، بەدەم مشتە کۆڵەوە ئەیشێراند بەسەریا هەروەکو بەسەر دایکە دەڵە قوڕەکەیەوە گرتبێتی، بەبێ ئەوەی شەرم لەکەس‌وکارەکەی بکات تێروپڕ بەبۆکس‌و لەقە کوتای تائارەقی دەرکرد.

ئەیوب-یش زەلیلی دەستی دوژمنەو لەهاوارو گریان زیاتر هیچی‌تری پێناکرێت، دواتر ئەوەتا کابرای سەرۆك دوژمن بەسەرسەریەوە وەستاوە، بەهۆی لێدانی زۆری هەناسە برکێی پێکەوتووە، بەدەم ئارەق سڕین سەیرێکی پاسدارەکان دەکات، کۆکین رێگەی قسەکردنی نادات، ئەو پیاوە ئەوەندە رق‌وقینی هەیە بەرامبەر بەو کوردانە لەکاتی تووڕەبووندا ئەکۆکێ، بۆیە بەدەم کۆکینەوە بەدەست ئاماژە بۆ کاتژمێرەکەی دەستی خۆی دەکات، هەربەدەم کۆکینەوە بەئاماژە پێیان ئەڵێ شەو درەنگەو دوای نیوەشەوە، دەست بۆ بنمیچی رەبیەکە درێژ دەکات! پاسدارەکان لێی تێئەگەن چونکە ئەوە پیشەی چەندین جارەی پێشوویانە! یەکسەر هەرچوار ناڵە هەڵواسراوە خوێناویەکەی بۆ دائەگرن‌و ئەیدەنە دەستی.

لێپرسراوی پاسدارەکان// (لەکۆکین تەواو ئەبێت، ناڵەکان بەرز دەکاتەوەو سەیری خێزانەکە ئەکات‌و پەنجەش ئەخاتە سەر کاتژمێرەکەی دەستی) کات دوای نیوەشەوە، ئێستا کاتەکە لەبارە.

خێزانەکەی ئەیوب بەیەعقوب-یشەوە ئەگرین، هیچ سودێکی نیە بۆ رزگاربوون و هیچ لەمەبەستی ئەو کابرایەش تێناگەن، باوکی و دایکی و بەیان و کامەران و یەعقوب، هەرپێنجیان بەکوردی و کەمێکیش بەزمانی فارس لەکابرا ئەپارێنەوەو دەستی ئەگرن بۆ ئەوەی واز لەئەیوب بهێنێ بەڵام بێ سودە، دواتر کابرای دوژمن پڕ جنێویان ئەکات، سوکایەتی زۆریان پێئەکات، کەپاڵیان پێوە ئەنێ بۆ دوور خستنەوەیان پاسدارە بێگانەکانیش ئەڕواننە دەست و دەمی لێپرسراوەکەیان و بەقۆنداخە تفەنگ بەرئەبنە گیانی ئەو خێزانە بێکەس و بێدەسەڵات و بێگوناحە.

لێپرسراوی پاسداران// (لەبەردەم ئەیوب وەستاوە، قژی گرتووە دوای ئەوەی ناڵەکانیان لێوەرئەگرێ) کوڕی سەگ ئائەم ناڵە کراوەتە دەستی چەند کوردێکی وەکو تۆ، ئەمشەو قیسمەتی تۆیە! دوای مردنی تۆش بۆیەکێکیتر، (قژی بەرەو خوارەوە رادەکێشێ و بەریدەدات).

سەرجەم خێزانەکەی ئەیوب بەگریانەوە واقیان وڕمابوو، ئەوەندە سەیری لێپرسراوەکەیان کرد تاڵەگریان کەوتن، ئەوەندە سەیری هەڵسوکەوتی ئەو پاسدارە دوژمنە بێگانانەیان کرد تاگریانیان لەبیر چووەوە، تەنها فرمێسکەکانیان چڵکی سەر رووومەتەکانیانی بەرێچکەیەك و دوان داماڵی بوو تاسەر چەناگەیان، هەرچەند سەیری چوارناڵەکەیان ئەکرد باوەڕیان نەدەکرد لەدەست و پێی کوڕەکەیانی گیر بکرێ!

گەر خوێنەر لەسکرینی روئیای خۆیەوە سەیری واق وڕمانی ئەو خێزانە بکات تووشی سەرسوڕمانی زەینی ئەبێت! لەهیچ (زەمان و مەکانێکدا) ئازاردانی نامرۆڤانەی وا نەبووەو ناشبێت! تەنها وتەنها دوژمنە بێگانە قین

لەدڵەکانی کورد بیر لەشتی وا ئەکەنەوە، لەوانەیە لەسەردەمی فتوحاتیشدا ئیسلامە شمشێر بەدەستەکان بەمشێوەیە ئازاری جەستەیی کافرە خوا نەناسەکانیان نەدابێت. بەڵام دوژمنانی ئێمە سەرەڕای داگیرکردنی خاك و ئاومان! لەسەر پانتایی زەوی خۆشمان داگیرو دەستبەسەری کردووین، هەمیشە دەست پێشکەر بوون لەهێرشی دوژمنانەیانداو ئێمەش هەمووکات لەسۆنگەی بەرگریکردن لەخۆمان سەیری دوژمنانمان کردووە. ئەوە دوای ئەوە بەرپەرچدانەوە بووە بەپیشەی رۆڵەکانمان، هەرگیز ئازاری هیچ کەس و دەستەو تاخمێك و میلەتێکمان نەداوە، بیگوومان هەموو سەردەمێکیش رای گشتی و نێودەوڵەتی و رێکخراوە ماف پەروەرەکانیش لەگەڵ دوژمنانماندا لەسەر هاوبەرژەوەندییان هاوڕان و کۆکن.

*　　*　　*

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

### نیمچە تاریکیەکەی نێو ژووری رمزە ئەکەوێتە سەر سکرینی بینین

یەعقوب نوقمی نێو دەریای خەیاڵی براو حەبیبەی رۆحی بووەو حەپەساوە!

بەهۆی دەنگە دەنگی گورگە هارو برسیەکانی دەرەوە هاتەوە هۆش خۆی، سەیرێکی‌تری ژوورەکەی کرد، تاکە چرایەك بەتەنیشت چەند شڕکەو پڕکەیەك هەڵواسرا بوو، بەڵام لەترسی گورگەکانی دەرەوە نەیوێرا دایبگیرسێنێ! زۆریش دڵی بەو تۆزە خۆشاردنەوەیەی نێو ئەو تاریکیە خۆش بوو، هەچۆنێ بێت ناوژوورەکە جۆرە روونیەکی تیابوو بەهۆی سپێتی بەفرەکەی دەرەوە لەهەردوو پەنجەرە بچووکەکەو درزی دەرگاکە ئەهاتە ژوورێ، هەرچەندە ئەوێ زۆر رووناك نەبوو بەڵام لەهیچ باشتر بوو.

گورگەکان لەدەرەوە مڕەیان دەهات، بەچواردەوری ژوورەکە ئەسوڕانەوە، ئەویش لەو ژوورە نیمچە تاریکە چاوەکانی کەمێك شتەکانی لەیەکتر جیا دەکردەوە، ورد ورد چاوی ئەخشاند بەنێو دیوارەکاندا، زەینی بوبوو بەدوو بەشی جیا، یەکێکیان بەگورگەکانی دەرەوە خەریك بوو وئاگای لەهەموو هاتووچۆکانیان بوو، بەڵام بەشەکەیتر بە بیرەوەری کوشتنی ئەیوب-ی برای خەریك بوو، بۆیە کەچاوی ئەگێڕا بەنێو تاکە ژوورەکە بەسەر چرا کوژاوو هەڵواسراوەکە نیشتەوە.

*　　*　　*

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر،
## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

دووبارە لەنێو رەبیەی پاسدارەکان بەبێ دەنگی تەنها بەوێنە ئەو دیمەنەی هاتەوە بەرچاو کەلەکاتی ئازاردانی ئەیوب-ی برایدا چراکەیان هێنابووە بەرچاوی، ئەویش بەهۆی لێدانو ئازاردان لەهۆش خۆی چووبوو، بەبۆکسو شەق لەبوورانەوە هەڵیانساند، تیشکی چراکە زۆر لێی نزیك بوو، سوورایی خوێنی سەردەموچاوی ئەبریسکایەوە، هاتەوە هۆش خۆیو چی بینی؟!

*　　*　　*

## گەڕانەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

یەعقوب لەم ژوورە بەگورگ دەورە دراوەو لەوخەیاڵەی کوشتنی ئەیوب-ی برای زۆر ئەترسا! کەمێك سەری راوەشاندو سەیرێکی تری ژوورەکەی کرد:-

ئەیویست هەموو گورگەکان سەرببڕێ بەڵام نەیئەتوانی.

ئەیویست هاواربکات بەڵام نەیئەتوانی.

ئەیویست خۆی رزگار بکات بەڵام نەیئەتوانی.

نەیدەزانی چی بکات! خەمی چاوەڕوانی مریەم-یش سەربای هەمووان بوو.

سەیرێکی چراکەی کرد؟! بەرلەوەی پێڵوەکانی بکەوێو چاوە بێهێزەکانی دابخات ئاگای لەوە نەبوو جارێکیتریش گەڕابووەوە بۆ خەڵوەتی خەیاڵو لەنێو رەبیەی پاسدارەکان سەیری چۆنیەتی ئازاردانی ئەیوبی برای دەکرد، هەرلەوێ لەگەڵ هاواری ئەیوب-ی برای وەئاگاهاتەوە کەبینی:-

*　　*　　*

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێلێکی باریکتر،

## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

هەردوو دەستو هەردوو پێی ئەیوب لەباوەشی پاسدارەکانەو بەبزمار ناڵیان پیادائەکوترێ! خوێنیان پیا ئەهاتە خوارێ! لەتاو ئازار ئەیزریکاند! هاوارو قیژەی ئەیوب لەسەر ئەو سنوورە شاخاویە پڕ بەفرو کپانە دەنگی ئەدایەوە! لەدەرەوەی رەبیەکە هاوارەکانی ئەیوب ئەبیسترا. خۆیی و دایكو باوكو کامەرانو بەیان خۆیان کوشتبوو قژیان لەسەر خۆیان ئەڕنیەوە! زۆریش لێیان ئەپاڕانەوە بەڵام سوودی نەبوو، لەگەڵ هەموو چوونە پێشەوەیەکی ئەم خێزانە بۆلای کابرای لێپرسراو، چەکدارەکانیتر بەپاڵنان ئەیانگەڕاندنەوە بۆ دواوە، ئەیوب کەوتبوو نەیئەتوانی هەڵسێت، ئەگریاو ئەپاڕایەوە بەڵام سوودی نەبو، جارێك هاواری بۆ باوکی ئەکردو جارێکیش بۆ

دایکی، سەیری براکان‌و خوشکەکەشی ئەکرد کەبێن رزگاری بکەن بەڵام بەهیچ شێوەیەك سوودی نەبو.

* * *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

جارێکی‌تریش یەعقوب لەنێو ئەو تاکە ژوورەدا بەهات‌وهاواری گورگەکان لەخەیاڵ دەرچوورو گەڕایەوە بۆ نێو زەینی خۆی! ئەوەتا لەترسا خەریکە گوێچکەکانیشی کپ ئەبێت، جارجارە دەنگی گورگەکان ئەبیستێ! دواتر گوێی لەهیچ دەنگێك نابێت! چاوەکانی ئەچێتە قوڵایی خەیاڵ‌و دەست ئەبات بۆ گوێچکەکانی بەڵام هۆکارەکەی بۆ دەرناکەوێ‌و لەهیچ شتێکیش ناگات، دواجار سەرلەنوێ بەکزی دەنگی گورگەکان دێتەوە بەرگوێی ئەو گەنجە عاشق‌و بریندارە. هەرلەوێداو بەم شێوەیە بیر لەچۆنیەتی مردنی ئەیوبی برای دەکاتەوە! هەموو ئەو دیمەنانەی دێتەوە یاد بەڵام بەبێ دەنگ، بێ ورتە، دەنگە دەنگی گورگەکانی چواردەوری زۆر بەکزی ئەبێتە موزیکی گوزارشتی بۆ دیمەنەکانی ئەو بەسەرهاتانەی لەنێو زەینی خۆی هەڵیگرتوون‌و ئێستا بەهۆی نزیك بوونەوەی مەرگ بیریان لێدەکاتەوە.

جارجارەش دیمەنە یەك لەدوا یەکەکان هێمنتر لەجوولەی ئاسایی، خاوتر لەهەڵسوکەوتی مرۆڤ، لەسەرەخۆ لەنێو هەگبەی یادەوەریەکانیی دێنە دەرێ‌و هێواش هێواش بەسکرینی روئیای دڵە لەرزێکەیدا تێئەپەڕن‌و ئاودیو ئەبن، دواتر جارێکی تر خۆیان ئەخزێننەوە نێو ئەلبوومی یادشتەکانی‌و بەدرێژایی ژیان کوشتنی براکانی خۆی‌و براکانی مام حەمەد قادری لەیاد ناچێ‌و بەردەوام لەگەڵیاندا ئەژی.

* * *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێلێکی باریکتر،
## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

ئەو کابرا دوژمنە بێگانەیە کەلێپرسراوی ئەو ڕەبیەیە بوو زۆر بێ ڕەحمو بێئەخلاق بوو، ئەیوب-ی پاكو بێگوناح، ئەیوب-ی گەنج کەلەدوای وون بوونی یوسفی برایان ئەم برا گەورەی خوشكو براکانیەتیو کوڕە گەورەی خێزانەکەی مەلا عەلی-یە، کەوتۆتە بەردەستی ئەم بەدرەوشتە، دوای تەواو بوون لەناڵکردنی ئەوەتا وەکو سەگ پێی ئەوەڕیو کەوتۆتە جنێودانی، بەشەق تێیبەربووەو دواتر دەمانچەکەی خستە سەرسەریو پێی ووت:-

لێپرسراوی پاسدارەکان// (بەدەمانچە هەڕەشەی لەئەیوب ئەکرد) کوڕی تۆ ئازادی کوڕی سەگ، لەم ژوورەوە بمێنیتەوە ئەتکوژم! دەی خێراکە بڕۆ دەرەوە.

خێزانەکەی ئەیوب-یش بەم هەڕەشەیە تۆزێك دڵیان خۆش بوو، چونکە نەیانئەزانی ئەیوب لەدەرەوە چی بەسەردێت؟

نەیانئەزانی دەرەوە چۆنە؟

نەیانئەزانی دەرەوە چی لێیە؟

نەیانئەزانی لەوێ گورگ فێری خواردنی مرۆڤ بووە؟

نەیانئەزانی پاسدارەکان کورد دەرخواردی گورگ ئەدەن؟

ئاخ....بۆ بێکەسی خۆمان.

ئاخ....بۆ شوانێکی دڵسۆز هەموومان لە گەلەگورگ بپارێزێ.

خۆیو گۆچانەکەی دەستی، خاوەن جەرگێکی بەهێز بن،

لەپێشەوەی ئەم میللەتەدا دوور لەخۆ ویستی پاریزگارمان بن.

مەرگیان لەپێش خۆیانو گەل دا بێت.

بۆ پاراستنمان‌و پێشکەوتنمان پێشمەرگەیەکی ڕاست بن.

بەڵام....!!!!؟؟؟؟

خێزانەکەی مەلا عەلی لەنێو ڕەبیەی پاسدارەکان بەدیار کوڕە ناڵکراوەکەیان سەرسام بوون! سەیری دەمی بەرپرسەکەشیان دەکەن ئەوەتا بەجنێودان هەڕەشە لە کوڕە چوارپەل خوێناویەکەیان دەکات بچێتە دەرەوەی ڕەبیەکە! کەیەك پارچە بەبەفر داپۆشراوە! هەرچۆنێ بوو ئەوان ڕازی بوون بەم کارە، چونکە کوڕەکەیان لەبەرچاوی خۆیان ناکوژن‌و گوایە لەدەرەوە هەرچۆنێ بێت ڕزگاری ئەبێت، گوایە لەدەرەوە فریای کوڕەکەیان ئەکەون، دواتر لەگەڵ خۆیاندا ئەیهێنن بۆ گوندەکەیان کەلەوێ نزیکەو دواتریش چارەسەری دەکەن.

ئایشێ‌و مەلا عەلی‌و یەعقوب‌و کامەران‌و بەیان بەگریانەوە بەدیار هەڕەشەکەی کابرای لێپرسراو وەستاون! ئەویش ئەوەندە بێ‌ئەخلاقە، ئەوەندە بەد ڕەوشتە، ئەوەندە دژ بەخوایە گوێ بەپاڕانەوەو داواکاری کەسیان نادات، تەنانەت ئیحتیرامی قورئانیش ناگرێت کەئەو دایك‌و باوکە پیرە چەندین جار داوایان لێکرد:-

ئایشێ خان// بۆخاتری قورئان واز لەکوڕەکەمان بێنە، خۆ پەڕینەوەی سەر سنوور هیچ زەرەرێکی لەئێوە نەداوە.

مەلا عەلی// (چەند ووشەیەکی فارسی فێربووبوو، بەزمانی ئەوان قسەی دەکرد) بۆ خاتری خواو ئیمامی عەلی واز لەکوڕەکەم بێنن، توخوا وازمان لێبێنن بابڕۆین.

ئـەم هـــەموو پاڕانـــەوەی ئایشـــێ خـــانی دایکـــی یـــەعقوب یـــەکێك لەپاسدارەکانی ئەوێ بۆ کابرای بەرپرس تەرجومەی دەکرد، ئەوەی مەلا عەلی-یش خۆی تێدەگەیشت، بەڵام کابرای دوژمن زیاترو زۆرتر رقی هەڵدەستاو پەلەی زیاتری دەکرد بۆ چوونە دەرەوەی ئەیوب، ئەو ئەیزانی ئەیوب لەدەرەوە چی بەسەردێت، چونکە ئەمە پیشەی چەندین جارەی پێشوویەتیو خیبرەی چاکی تیا کۆکردۆتەوە.

ئـــەیوب بـــەگریانو بەهـــەر چـــوارپەلی خوێنـــاوی لـــەژێر هەرەشـــەی دەمانچەی دوژمنە بێگانەکە کرایە دەرەوەی رەبیەکە، لەکاتی چوونە دەرەوەدا پاســدارە بێگانــەکانیتر بەلوولــەی چەکەکانیان پاڵیــان پێوەئــەنا، بــەدەمیش هەرچــی جنێــوی ناشــرینو ســووك هــەبوو ئاراســتەیان ئــەکرد. ئــەو گەنجــە نـاڵکراوەش لـەتاو ئـازارو گریـان ئاگـای لـەهیچ نـەبوو! هەرچـەند بـەگریانو ئازارەوە ئاوڕی ئەدایـەوە بۆ دایكو باوكو خوشكو براکانی بـەڵام هەڵمـەتی پاڵپێوەنـان نەیدەهێشـت زۆر بمێنێتـەوە، هـەر بـەجنێوو شـەقو بۆکس کرایـە دەرەوە، تالـەژوورەوە دەرچـوو چـەندین جـار خـۆی بۆنەئـەگیراو کـەوت، چـەك بەدەســتە دوژمنــەکانیش هەڵیانســاندەوەو پاڵیــان پێوەنــا، زیــاتریش بــە سەرمەقولاتو گرمۆڵە بوون کرایە دەرەوەی رەبیەکە چونکە نەیئەتوانی لەسەر پـێ بوەسـتێ، لـەوێش بـەهۆی سـەرمای دەرەوە زیـاتر هـاوارو قیـژەی لێبـەرز بووەوە! زیاتر هەستی بەنزیك بوونەوەی مەرگ دەکرد.

* * *

**گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........**

**تاکە ژوورەکەی نێو ڕەز وەکوخۆی نیمچە تاریکە**

**گورگەکانیش بەردەوامن لەهەوڵدان بۆ چوونە ژوورەوە**

یەعقوب-ی گەنجی بریندار لەو ژوورەو لەنێو ڕەزەکەدا ئاوا بیری لەکوشتنی براکەی ئەکردەوە، بەلاَم گورگە هارو برسیەکانی دەرەوە خەیاڵەکانی یەعقوب-یان تێکشکاند! ئەویش لەژووریَ گوێچکەکانی کەلەوەپێش کپ بووبوون کەمێك کرایەوە، پشتی دەرگاکەی بەجێهێشت و رایکرد لەهەردوو پەنجەرەکەی ئەمدیوو ئەودیوی ژوورەکە سەیری گورگەکانی دەکرد! ئەوانیش بەدەست هەڵمەتیان بۆ ئەبرد! دووبارە رایدەکرد بۆ پەنجەرەکەیتر تالەوێوە تێیانبگات چیئەکەن و ناکەن! ئاخ....ئەگەر پەنجەرەکان بچووك نەبوونایە بەدڵنیاییەوە گورگە برسیەکان لێی ئەچوونە ژوورەوەو ئەیانکرد بەخواردنی ئەمشەویان و کەمێك ناوسکی خۆیان پیَگەرم دەکردەوە.

یەعقوب زۆر بیَهێزە، بەمشەوە ساردە لەژوورەوە لەگەڵ سەیرکردنی گورگەکان لەنێو پەنجەرە بچووکەکاندا ئەهاتەوە بەرچاوی کەلەگەڵ خێزانەکەی لەدواوە سەیری پاسدارەکانیان دەکرد چۆن چاودێری ئەیوب دەکەن و چاوەڕێی گورگەکانیش دەکەن بێن بۆ خواردنی ئەیوب.

* * *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێلێکی باریکتر،

## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

پاسدارەکان لەنێو کون و پەنجەرەی ڕەبیەکە سەیری دەرەوەیان دەکردوو بەئەیوب-ی ناڵکراو پێئەکەنین! ئەوخێزانە کوردەش لەدواوە سەیری ئەو دوژمنە چەکدارانەیان ئەکردو ئەگریان، هەرچەند یەعقوب و دایک و باوکی و بەیان-ی خوشکی و کامەرانی برای هەڵمەتیان دەبرد بۆ ئەوەی بچنە دەرەوە بۆ رزگارکردنی کوڕەکەیان بەڵام پاسدارەکان نەیاندەهێشت لەشوێنی خۆیان بجووڵێن، هەڕەشەیان لێدەکردن و جنێویشیان پێئەدان.

خێزانەکە// (ئەیانویست هەڵسن و بچن بۆ لای ئەیوب-ی کوڕیان، ئەگریان و ئەپاڕانەوە)

پاسدارەکان// (بەتوڕەییەوە) دانیشن، کوڕی سەگ....ئەتانەوێ وەکو ئەمتان لێبکەین؟! (پەنجە بۆ ئەیوب ڕائەکێشن کەلەدەرەوەی ڕەبیەکەدایە).

لەدەرەوەی ڕەبیەکەش بەمشەوە ساردو کپە بۆنی خوێنی دەست و پێی ئەیوب گەیشتبووە لوتی گورگەکانی ئەوناوچەیە! ئەوگیاندارانەش فێربووبوون هەرکاتێ بۆنی خوێن بهاتایە بێدواکەوتن بەرەو ڕەبیەکانی ئەو سنوورە ڕایاندەکردو بەمشەوە ساردە هەریەکەو چەند پلە گۆشتێکی گەرمی مرۆڤی کوردی بەرئەکەوت.

ئەیوب-یش لەدەرەوە ئەو ناوچە شاخاویەی بەهاوار پڕکردبوو! بەرامبەر بەهەموو هاوارو گریانێکی ئەوگەنجە بێتاوانەی دەرەوە پاسدارەکانی نێو ڕەبیە گەرمەکە زیاتر قاقایان لێئەداو بەردەوام لەکونەکاندا سەیریان ئەکردو لەخۆشیا هەڵئەپەڕین. ئەندامانی خێزانەکەشی لەژوورەوە ئەگرین و شیوەن دەکەن، لەهەمان کاتدا هێندەی ئەیوب ئازاری ساردی و برینداری

ئەچێژن، پێکەنین و خۆشی لەنێوان پاسدارەکان دابەشکراوەو لەکونەکانی دیواری رەبیەکە سەیری ئەیوب دەکەن چۆن لەدەرەوە هەڵئەپەڕێ و هاوار دەکات، بەڵام خەم و پەژارە بەرۆکی ئەو خێزانەی گرتووە بەدەم گریانەوە لەتاو کوڕەکەیان هەڵئەپەڕن.

هەڵپەڕینە گاڵتەجاڕیەکەی پاسدارەکان کەلەکونەکانی رەبیەکەوە سەیری دەرەوەیان دەکردو هەڵبەزودابەزی ئەو خێزانە کوردە وەك شیوەن بۆ کوڕەکەیان لەگەڵ گریان و هاوارکردنی ئەیوب بۆ مەرگی خۆی لەو سەرمایەی دەرەوە، هەمووی لەیەك کات و تێکەڵاو بەیەکترن، تاوێك بەم شێوەیە کات بەڕێکرا، دوای چەند خولەکێك ئەو گەنجە بەمشەوە ساردە لەدەرەوە لەسەر بەفرەکە کەوتبوو، وردە وردە برینەکانی سارد ئەبۆوەو هێزی لێئەبڕا! لەسەر ئەژنۆ کەوتبوو، نەیئەتوانی دەستە ناڵکراوەکانی بخاتە سەرئەرزەکە، سەری دانەواندبوو وسەیری دەستەکانی ئەکرد، نەشیئەتوانی پێیەکانی بخاتە سەر بەفەرو لەسەریان بوەستێ. چەند چرکەیەکی پێچوو دواتر لەدوورەوە چەند گورگێکی بەدیکرد بەخێراییەکی بێوێنە بەرەو رووی ئەهاتن! ئەویش هاواری بۆ خوا ئەکرد....بۆ پێغەمبەران....بۆ پیاوچاکان....بۆ شێخ و سەیدو مەلاو قورئان و هەموو شتە پیرۆزەکانی‌تر، بەڵام گورگەکان خێراتر رایان ئەکردو زیاتر لێی نزیك ئەبوونەوە! ئەویش لەترسا هاواری ئەکرد:-

ئەیوب// (لەدەروە لەتاو سەرماو ئازارو گورگ) دایکە گیــــان....فریامکـــــەون، وەرن گـــــورگ خواردمیییییییی.

دواى هاوارەکەی ئەیوب لەدەرەوە دەمووچاوی دایکی لەنێو رەبیەی دوژمنە بێگانەکان واقوڕمانێکی وای لەسەر دروست بوو ئەگەر خوێنەر بیبینێ تووشی شۆك ئەبێت! ئەو خێزانە کوردە لەنێو رەبیەکە سەیری سەرسوڕمانی

سەردەموچاوی دایکیان دەکرد! ئەوان بەنیازبوون کوڕەکەیان لەدەرەوە ڕزگاری بێتو خۆشیان بگەنە لای، دواتر چارەسەری دەستو قاچیشی بکەن، وایان ئەزانی سزای خۆیانو کوڕەکەیان هەر ئەو ناڵکردنەیەو بەس، بەڵام ئەوەی ئەوان گوێیان لێیبوو لەگەڵ بیرکرنەوەیاندا هاوتەریب نەبوو! نەدەگونجا! بۆیە لەبێ ئومێدیدا ئایشێ خانی دایکی تووشی ڕاچڵەکینی دەماغی بوو تائێستاش کەساڵی ١٩٩٤ هەروایە، بەدرێژایی ڕۆژ لەماڵەوە دوو قسە ناکات.

*　　*　　*

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

چاوی کامێراو ڕوئیای خوێنەر بەیەکەوە لەسەر دەموچاوی دایکە (ئایشێ) ئەگوازرێتەوە بۆ سەر دەموچاوی یەعقوبو ئەوەتا لەو ژوورە تەنهایە بەگورگ دەورە دراوەو چواردەوریشی ڕەزێکی چڕوپڕە، لەپێشدا گۆشەی بینین کەمێك لێڵو تەڵخە، وردە وردە خۆت لەدەمو چاوی یەعقوب دوور بکەوە ئەبینی ئەویش لەژوورەوە بەهەمان حەپەساویەوە زەینەکانی ئاڵۆز بوون، بەتایبەتی زۆر خەفەت بۆ دایکی دەخواتو زۆر دڵی پێی دەسوتێ، ئێستاش واقوڕمانەکەی دایکی لەبەرچاوە کەلەناو ڕەبیەکە تووشی بوو، ئەو ژنە داماوە تا ئێستا پێوەی دەتلێتەوە، بۆیە یەعقوب لەم ژوورە بەگورگ دەورە دراوە لەبەرخۆیەوە ئەڵێ:-

یەعقوب// دایکە گیان بەقوربانت بم.

ئەم گەنجە عاشقە جارێکی تریش بەهۆی دەنگی گورگەکانی چواردەوری ڕاچڵەکی، بەو شەوەو لەو ژوورە تەنهایە ئەیڕوانیە دیوارەکان، زۆریش ماندووو شەکەتە، ئەشزانێ گورگی نێو زستانو شاخە بەفرینەکان

هــەردەم بــەهۆی برســیەتیەوە درن، برســیەکی سەرشــێت، برســیەکی هــار،
• برسیەتی چەندین ڕۆژانەیان بەقەپ گرتن لەیەکتر ئەبەنە سەر، چونکە هەرچی نێچیری ئەوناوە هەیە لەژێر ئەرزن، لەترسی بەفرو سەرما دەرناکەون بۆیە گورگـەکان لـەو وەرزەدا ناوسـك بـەتاڵو برسـیو شـێتن لەهیچـیش ناترسـن، جارجـار چـەند دانەیـەکیان بەرئەبنـە گیـانی گـورگێکی هاوڕێیـانو ئـەیخۆن، یەعقوب–یش ئەیزانی گەر گورگەکان بێنە ژوورەوە یان خۆی بچێتە دەرەوە! چارەنووسـی ئـەمیش ئەچـێتە پـاڵ مردنەکـەی ئـەیوبو کامـەران–ی بـرایو هەردوو براکەی مام حەمەد قادر–یش.

یەعقوب بەهۆی لوورەی گورگەکانو سوڕانەوەیان بـەدەوری ژوورەکە، خۆشی پێبەپێی ئەوان لەژوورەوە ئەم پەنجەرەو ئەوپەنجەرەی دەکرد، زۆر مانـدوو بـوو برینەکەشـی سـات لـەدوای سـات سـارد ئـەبۆوەو هێـزی لێ کـەم دەکـردەوە. ئـەو کـوڕە عاشـقە بریـنـدارە مانـدوو شـەکەت بـوو، گورگـەکانیش دەنگیـان نـەما، یـەعقوب لـەژوورەوە بـەدەم ئازارو تلانـەوەی برینـەکانی بـەپێوە خۆی خزاندۆتە سوچێكو نازانێ چۆن دەرباز ببێت؟!

بـەم شـێوەیە وەسـتاوە بـیر لەمریـەم دەکاتـەوە، بیرلـە چاوەڕوانی ئـەو کیـژە لادێییـە دەکاتـەوە، بیر لـەمردنی خـۆی دەکاتـەوە، بیر لـەترێی خوشـکی مـریم دەکاتــەوە کەکچـێکی هــەرزەکاری ئێسـك سـووکە، بـیر لەوچرکەســاتە دەکاتەوە کەمریەم هەواڵی مردنەکەی ئەزانێ:–

یەعقوب// (لە ژوورەوە لەو سوچە بەپێوە وەستاوەو لەبەرخۆیـەوە) ئەگـەر مریـەم هـەواڵی مردنـی مـن ببیسـتێ خـۆی ئـەکوژێ! لەگـەڵ دایکـمو بـەیان–ی خوشــکم دێتــە ســەر گۆڕەکــەم! لەدواییــدا خــۆی ئەکوژێ! بەخوا خۆی ئەکوژێ!

سەیرێکی برینەکانی خۆی دەکاتو دەستیان پیائەهێنێ، هێزی زۆری تیا نەماوە بەلاّم زەینو بیرەکانی زۆر تیژن بۆیە تەنها بەچاو هەلّبڕین هەستەکانی ئەگرێتە دەرەوەی ژوورەکە تابزانێ گورگەکان چی ئەکەنو ناکەن؟! ئەی بۆ دەنگیان نەما؟!

لەم بیرکردنەوەیەدا بوو، ئەیویست خۆی رازی بکات کەگورگەکان رۆیشتوونو ئەوێیان بەجێهێشتووە، بەلاّم نەشیئەوێرا بەم شەوە بێتە دەرەوە! ئەی چی لەچاوەڕوانیی مریم بکات؟! تاکەی مریەم چاوەڕوان بێت؟! ئەگەر ئەمشەو ئەم بەزمەی بەسەرنەهاتایا چەند خولەکێك بوو لەباوەشی مریەم-دا ئازاری دووری نێوان دوو زستانی بەتالّ کردبووەوەو تێریش بۆنی مێخەکەکەی سەر سنگی ئەوکچە شێتەی کردبوو، لەبەرخۆیەوە ئاوا بیری دەکردەوە، زۆریش حەزدەکات دوای برینداریش بەمریەم شاد بێت وەك لاولاو لەبالاّی خۆی بئالّێنێو برینەکانی پێ سارێژ بکات، بەم شەوە سارده لەسوچی ژوورەوە وەستاوە:-

یەعقوب// (لەبەرخۆیەوە) زۆر دواکەوتم، ئەزانم
مریەم زۆر بێتاقەت بووە، ئەزانم لەگەلّ ترێ دەست
ئەکەنە ملی یەکترو کەروێشکە خەو ئاسا
سەرلەسەرین رووەو یەکتر ئەخەون.

لەپڕ دەنگو لوورەی گورگەکان خەیالّەکانی یەعقوبیان هەلّوەشاندەوە، لەگەلّ راچلّەکیندا هەستی بەئازارێکی زۆری برینەکانیکرد، ئەمجارە لەهەردوو پەنجەرەکەی ئەمدیو ئەودیوی ژوورەکە دەستو هەلّمەتی گورگەکانی ئەبینی! سەرنجیشی ئاڕاستەی دەرگا دارەکە دەکرد چۆن بەنینۆکەکانیان ئەیانکڕاندەوە! موچڕکە بەمێشكو برینەکانیشیدا ئەچوونە

خواریّ! نازانیّ چیبکات....خەمی رزگاربوونی خۆی بخوات یان دووری مریەم؟!

پەیوەندی نێوان یەعقوب و مریەم عیشقێکی خواییە، عیشقێکی بێهاوتایە، بەلاّم نەیانئەهێشت لەناوچەکەدا کەس پێیان بزانێ بۆیە زۆر دڵیان بەدونیا خۆش بوو، زستانی پێشوو لە دوا (شەوژوان)ـەکانیدا ناودەمی مریەمی ماچکردبوو تائێستا تامەکەی لەژێر دانەکانی ماوەو لەبیری ناچێتەوە، بەلاّم ئەمشەو ئەم گورگانە نایەڵن ئەوتامە لەزمانی بئاڵێنێ تا رێگاژوانەکەی پێبڕێ، لەوێشەوە سەرلەنوێ بەباوەشە گەرمەکەی مرە گیان شاد بێتەوە.

ماوەی ساڵێکە مریەم-ی نەکردۆتە باوەش، ماوەی ساڵێکە تێر بەسیەکانی هەناسەی هەڵنەکێشاوە، ماوەی ساڵێکە رەنگ و رووی پەرپوەو زۆریش بێتاقەتە، ئەیویست ئەمشەو تێنوێتی دووری بەماچەکانی ئەو کیژە چاورەشە بشکێنێ، ئەویویست تێر تێر هەناسەکانی هەڵمژێ و ئۆخەی نێو باوەشی بچێژێ.

دوای بیستنی دەنگی گورگەکان یەعقوب لەژوورەوە گوێچکەکانی قوت کردەوە، بەتەواوی کرانەوەو گوێی لەهەموو شتێك دەبێت، زەینەکانی رەوانەی دەرەوە کرد، ئەمجارە هەستیکرد ژمارەی گورگەکان زیادیکردووە! زیاتر هەستەکانی ئاراستەی دەرەوە کرد لەکاتی سوڕانەوەیان بەچواردەوری ژوورەکەدا سیرەی قاچیان کەبەسەر بەفرەکەدا هاتووچۆیان دەکرد زۆرترو زیاتر بوون.

لەو سووچە وەستاوەو جوڵە ناکات، دواتر سەری بەرزکردەوەو هەستی راگرت لەسەربانی ژوورەکە خشپەخشپێك دێت! زیاتر بیرەکانی چڕکردەوە، وێنای چنگی گورگەکانی کرد کەلەسەربانە گڵەکە گیری دەکەن!

سات لەدوای سات خێراتر خۆڵی سەربانەکەیان هەڵدەکۆڵی! دەنگەکانیش گەورەترو ناخۆشتر دەبوو! تاوایلێهات لەچەند شوێنێك کونی بچووك بچووك دروستبوون، بەفربارینیش وەستابووەوە، بەڵام هەوای سارد لەهەردوو پەنجەرەکە بەبەردەوامی ئەهاتە ژوورێ.

یەعقوب بەسەرسوڕمانەوە سەیری کونەکانی دەکرد! دەیزانی کەوا گورگەکانن ئەیانەوێ بۆی بێنە ژوورێ! لەگەڵ هەڵکۆڵیندا وردە خۆڵ ئەکەوتە خوارێ بۆ نێو ژوورەکە! گەنجە بریندارەکە بەترسەوە یەك بەیەك سەیری کونەکانی دەکرد! هەناسەکانی خێراتر دەبوون، دواتر چاوی بەسەر یەکێ لەکونەکان نیشتەوە کەکەمێك لەوانیتر گەورەتر بوو! بەهۆی چنگو هەڵپەی گورگەکە بەفری سەربانەکە لەگەڵ خۆڵەکە ئەکەوتە نێو ژوورەکە! لەئاستی کونەکە بۆ خوارەوە تۆپەڵێك خۆڵو بەفر کەوتبووە سەریەك، ئەویش بەپێوە وەستابوو بەترسێکی زۆرەوە سەیری نێو ژوورەکەی دەکرد! لەگەڵ هاتنە ژوورەوەی چنگی گورگێك لەسەربانەکەوە کەمێك بەفری سەربانەکەی لەگەڵ خۆیدا خستە خوارەوە.

چەند گورگێك لەسەربانەکەن و خەریکی هەڵکۆڵینن! ئەوانەی چواردەوری ژوورەکەش سەریان بەرزکردۆتەوە سەیری سەرەوە دەکەن، یەعقوب ئەم چاوەڕوانیەی گورگەکانی لەپەنجەرەکەوە ئەبینی کەجارجار بەچواردەوری ئەو تاکە ژوورە ئەسوڕێنەوە! چاوەڕێی کونکردنی بنمیچەکە ئەکەن تائەوانیش خۆیان هەڵبدەن و بۆ کوڕەی عاشق بچنە ژوورەوە! ئەو گورگە هارو برسیانە چاوەڕێی چەند پلە گۆشتێکی مرۆڤ ئەکەن تاکو بەم شەوزستانە کەمێك ناوسکە بەتاڵەکەی خۆیانی پێ جۆشبدەن.

دیمەنێکی زۆر ترسناکە....!....!...کەبەمشەوە ساردە تاکە ژوورێك لەنێو ڕەزێکدا بەبەفر داپۆشراوە! عاشقێکی بریندار تیایدا خۆی مەڵاس داوە!

چـەندین گـورگ بەسـەر بەفرەکـەدا بەچـواردەوریدا ئەسـوڕێنەوەو چـەند دانەیەکیشیان لەسەربانەکە خەریکی کون تێکردنی ژوورەکەن.

یەعقوب بریندارە، هێزێکی زۆر کەمی پێماوە بەڵام ئاواتی گەیشتنی بەمریـەم جـارێکی تـریش گـوڕوتینی پێبەخشـیەوە، دوای ئـەوەی دەسـتی گورگەکە لەبنمیچی ژوورەکە وەدەر کەوت، دیمەنی گرتنی قورگی گورگەکەی گـەرمیان لەلایـەن مـام حەمـەد قـادردا زۆر بـەخێرایی بەبیریـدا گوزەریـانکرد، کەلـەوەپێش بـۆ ئـەمو بـۆ گەنجـەکانیتری باسـکردبوو، وەك شـێر راپـەڕیو پەلاماری داو گرتی، بەدەستەکەی تری خەنجەرەکەی ئەچەقاندە نێو دەستیو هەڵیئەدڕی! کەگورگەکە ئازاری پێئەگەیشت زۆر بەتوندی دەستی ئەجووڵاندو یەعقوب-ی لەگەڵ خۆی ئەهێناو ئەبرد! لەوکاتـەدا ئەوشووشـە عـەترەی کـەبۆ ترۆی کڕیبوو لەباخەڵیدا کەوتـە خـوارەوە، گەنجە بریندارەکەش هەرخـەریکی هەڵدڕینی دەستی گورگە هارەکە بوو! چونکە کونەکە گـەورە بووبوو دەسـتی گورگەکە تانزیك شانی هـاتبووە ژوورێ، ئەویش بەخەنجەرەکەی نێو دەسـتی برینەکەی بۆ درێژ کردەوە تانزیك سکی.

یـەعقوب بەخەنجـەر خـەریکی هەڵـدڕینی دەسـتی گورگەکـە هـارە بـوو کەچـی چـنگەکرێی گورگـەکانی تـریش لەسـەربانەکە بـەردەوام بـوو! هـەموو جووڵەیـەکی خەنجەرەکـەی نێـو دەسـتی ئـەم گەنجـە تێکـەڵاو بەچـەند خشـپەو رنینـەوەی سـەربانەکە ئـەبوو کەگورگـەکان ئـەیانکردو هـەوڵیان ئـەدا بێنـە ژوورەوە! بۆیە بەدەم کوشتنی گورگەکەوە جارجارە بەچاوەکانی لەناو ژوورە نیمچە تاریکەکەدا سەیری کونە بچووکەکانیتری ئەکرد وردە خۆڵی لێدەهاتـە خوارێ.

لەوکاتـەدا چـنگو نینۆکـەکانی گورگەکـە چـەقیبووە نێـو دەسـتی یـەعقوبو خـوێنی بـەربووبوو، ئـەویش هـەردو دەسـتی بـەرزکردبووەوە بـۆ

بنمیچەکەو لەئەژمەت مەرگ ئاگای لێنەبوو، لەتاو خۆرزگارکردن ئاگای لێنەبوو، بەهۆی زاڵ بوونی بەسەر هەڵمەتی ئەو گورگە لەخۆشیا ئەوەندەیتر بەخێرایی دەستی هەڵئەدڕی، دڵۆپە خوێنەکانی دەستی یەعقوب تێکەڵ بەخوێنی گورگوکە بووبو بەتەوژم ئەچۆڕایەوە سەر دەمووچاوی، چاویشی لەکونکردنی کونە بچوکەکانیتر نەئەبڕی، دواتر هەستیکرد دەستێکی بێگیان لەناو لەپیدایە! هیچ جووڵەو بەرەنگاریەکی تیا نەماوە! دیقەتیکرد گورگەکانیتریش دەنگیان نەما.

یەعقوب// (دوای ئەوەی هەستی کرد دەستی گورگەکە لەناو لەپیدا شل بووە لەدڵی خۆیدا بەترسەوە) بەدووری نازانم دڵی ئەم گورگە هارو برسیەم لەت کردبێت....!....!

بۆیە دوای بێهێزیو شل بوون دەستی گورگەکەی بەردا، ئەوەندەی نەبرد تەپەیەك لەدەرەوەی ژوورەکە هات، زانی گورگە بریندارەکەیە هێزی لێبڕاو کەوتە خوارەوە.

خشپەو ترپەی گورگەکانیتر لەسەربانەکە نەما، بەڵام لەچواردەوری ژوورەکە مرەمرێکی زۆر ترسناکیان لێوە ئەهات! ئەویش لەپەنجەرە بچووکەکەی لای چەپی ژوورەکە کەبەریزی دەرگاکەوەیە سەیریکرد سەرجەم گورگەکان کەوتوونەتە سەر گورگە بریندارەکە، کار لەکەوڵکردنیش نەماوە دادڕ دادڕیان کردووە، دەنگە دەنگیان بەسەر لاشەی گورگەکەی هاوڕێیاندا ئەوەندە ترسناك بوو موچڕکە بەدڵی یەعقوب دائەهاتو لەتاو ترس خۆی بۆ نەئەگیرا! زیاتر تێبڕوانین، بەهۆی رووناهی بەفرەکەی دەرەوە سەروگوێلاکی گورگەکان دیار بوو بەخوێنی گورگە خوراوەکە سوور هەڵگەڕابوون.

هەرلەنێو ژوورەوە لەپەنجەرەکەوە دیقەتی لرفەلرفی ئەو گورگە هارو برسیانەی دەکرد چۆن بەهۆی خوێن بەربوونیی بەربوونەتە گورگەکەی هاورێیان‌و چۆن لەت‌وپەتی دەکەن، لەژوورەوە ئەوەندە ئەترسا تاوایلێهات کەوتە لەرزین، چونکە ئەمە جارانی پێشوو نیە بەلەشێکی ساغ‌و بەدەمانچەوە گورگ هەڵبڕی تائەودیو چەمەکان‌و لەوێش بەسەربەرزی بێتەوە نێو مەڕومالاتی خۆیان، ئەمجارە زۆر بریندارەو تەنها یەك خەنجەریشی پێیەو ژمارەی گورگەکانیش هێجگار زۆرە.

هەرلەنێو پەنجەرەکەوە سەیری ئەو ئاژەڵە دڕندانەی دەکرد، لەپڕ چەند دانەیەکیان لەو (شەوداوەت)ـە جیابوونەوەو پەلاماری یەکتریان دا! ئەوەندەی نەبرد ورگ‌و ریخۆڵەی یەکتریان هەڵدڕی! ئەم گەنجەش لەژوورەوە لەنێو پەنجەرە بچووکەکان بەردەوام سەیریان دەکات، ئەو گورگانەی بەلاشە بچووکتر بوون زووتر ئەبوونە خۆراکی گورگە زلەکان! گەورەکانیان بەهۆی بەهێزیان خێراتر پەلاماری بچووکەکانیان ئەدا.

یەعقوب زۆر ترسا! رایکرد بۆ لایەکی‌تری ژوورەکە! سەیری بنمیچی ژوورەکەی دەکرد چەند کونێکی تیاکراوە بەلام ئەو کونەی کەدەستی گورگەکەی لێوە هاتبووە خوارێ لەوانیتر گەورەتر بوو! ئەویش بەهۆی هەوڵدانی گورگەکە بوو کەخێراتر هەڵپەی هاتنە ژوورەوەی کردبوو.

یەعقوب لەوێوە ئەیڕوانیە ئاسمان، لەوێوە دەنکە بەفرەکانی سەربانەکە ئەهاتنە ژوورێ، لەتاو سەرماش خۆی کرژ کردبوووەوە، گورگەکانیش لەدەرەوە خەریکی یەکترخواردن بوون! ئەوەی زیاتر یەعقوب-ی بێزارکردبوو دەنگ‌و مڕەمڕە ترسناکەکەی گورگەکان بوو لەکاتی یەکتر خواردندا بەناخ‌و ئیسقانی ئەم گەنجەدا ئەچووە خوارێ، عاشقی بریندار چووە سوچێکی ژوورەکەو لێی دانیشت، تاماوەیەکی کەم گورگەکان بێدەنگ

بوون، ئەم گەنجەش لەژوورەوە لەترسا وڕێنەی دەکردو لەبەرخۆیەوە قسەی بۆ خۆی دەکرد، ئەیویست باوەڕ بەخۆی بهێنێ کەلەمەترسی ئەم گورگانە رزگاری بووە:-

یــەعقوب// لەوانەیــە تێریــان خواردبــێ! یــان رەنگــە رۆیشتبن! خۆ ئەبێت فێڵی خۆیان بخەنە گەڕ! چونکە گــورگیش هێنــدەی ڕێــوی فێڵبــازە! مــن شــارەزای فێڵەکانی گورگم.

ماوەیەك لەبێدەنگی گورگەکانی دەرەوەو گەنجە عاشقەکەی ژوورەوە لەم شەوە ساردە تێپەڕی، دەرەوەو ناوەوەی ژوورەکە بەبێدەنگی سواخ دراون، کاکەی عاشق دوای هاتنەوە سەرخۆی لەژوورە کپەکەدا بیری لەناو جێگە گەرمەکەی خۆی دەکردەوە کەئەمشەو تیایە نەخەوت، لێیهاتە دەرەوەو ملی ڕێگای گرت بۆ گوندەکەی ماڵی مریەم، چەند جارێك ناوجێگەکەی خۆی ئەهاتەوە بەرچاو، دایکی و بەیانی خوشکیشی لەبەرچاو بوو کەلەشیرین خەودا بوون، یەك لەسەریەك دیمەنی ناوجێگەکەی خۆی بەسکرینی خەیاڵیدا تێدەپەڕین، لەهەمان کاتدا بیریشی لەمریم دەکردەوە:-

یــەعقوب// ئــاخۆ ئێســتا مریــەم چــەند بێتاقــەتی چاوەڕوانی بێت و چی بکات؟

لــەو سووچــی ژوورە دانیشــتووە، دوای کــەمێك بێــدەنگی و کــپ بوونــەوەی ژوورەکــە هەســتی بــەبۆنێکی زۆر خۆشــکرد، چــەندجارێك لــووتی جوڵاندو هەڵمژ هەڵمژ هەناسەکانی ئاودیوی سیەکانی کرد، دواتر دیقەتیکرد شووشــە عەترەکــەی تــرێ لەلایــەکی ژوورەکــە لــەرێکی کونــە گەورەکــەی بنمیچــەکەدا کــەوتووەو لــەژێر قاچــی وورد بــووە! بۆیــە ژوورەکــەی پڕکــردووە

لـەبۆن، کـەمێکی‌تر بۆنەکـەی هەڵمـژیو دووبـارە سـەیرێکی‌تری شووشـە شکاوەکەی کرد لەبەرخۆیەوە ووتی:-

یەعقوب// ئاخۆ ئێستا دەم‌وچاوە وردیلەکەی مریـەم چەند تـورە بێـت؟! ئـەی تـریێ؟....ئـەبێ چۆن دەست بکاتـە ملـی مریـەم؟....نزیکـەی سـاڵێکە چـاوەڕێی ئەمشەوە عەتری بۆ بەرم.

*      *      *

## هێلی گشتی بەردەوامە........

**کات**

**دوای نیوە شەو ە**

**سەرەتـای زستانی ساڵی ١٩٩٤ـە**

**مریەم لەدێکەی خۆیان چاوەڕێی یەعقوب دەکاتو**

**یەعقوب-یش لەنێو ژووری رەزەوانەکان بیردەکاتەوە**

بـالێرەدا سکرینی روئیـای خوێنـەر بـەرم بـۆ گوندەکـەی مـاڵی مریـەم، باچەند دیمەنێکی‌تر لەچاوەڕوانی ئەو کچە دولبەرە بگەیەنمە زەینی خوێنـەر، هەڵوێستە وردیلانەکـەی تـریێ دەربخـەم، بـەفرە سـپیە بێگەردەکـەی بـەردەمی ژوورەکـەی ئـەو دوو خوشـکەش بـەهۆی هـەوا ساردەکەوە چـرکە دوای چـرکە ساردترو رەقتر ئـەبێ، لـەتاو سـەرما هـەردووکیان لـەژوورەوە ئەچـنە باوەشـی یـەکتر تاماوەیـەك خۆیـان لەچـاوەڕوانی هەڵئەکێشـن‌و بێـدەنگیش ئەپۆشـن، یەعقوب-یش لـەژووری نێو رەزەکـان زەینـەکانی ئاراسـتەی دەرەوەی ژوورەکـە کـردووە بـۆ چـۆنیەتی هـاتووچۆی گورگـە هـارو برسـیەکان، دواتـر چـاوەڕوانی هەردوو عاشقەکە لە رێگەی موخاتەبەکردنی ئەقڵیەوە تێکەڵاو بەیەکتر دەکەم.

تریێ// مریەم گیان بەقوربانت بم....دوو دڵ مەبە، من یــەعقوب ئەناســم....بــەخوا ئێســتا ئەگاتــە جــێ، (بەپێکەنینــەوە دەســتەکانی بەرزدەکاتــەوە هــەروەك شووشــە عەترەکــەی بەدەســتەوە بــێ) عەترەکــەی منیشی هێناوە، تۆش ئەوەندە ئەیبینی تالێی بێزار ئەبیت.

یەعقوب لەو جۆرە خەیاڵانەدا بوو لەکونە گەورەکەوە سەیری ئاسمانی دەکــردو هەستیشــی کردبــوو بەدوولــەتی نــەگونجاو، بەشــێکی لــەدەرەوەی ژوورەکە بــوو چاوەڕێ بــوو مــڕەی گورگــەکان دەســت پێبکەنــەوە ئەویتریشــیان لەبەر خۆیەوە ئەیووت:-

یــەعقوب// (هــەروەکو دڵــی دڵــدار پێــی راگەیەنــدرابێ یــان هەســتەکانی لــەمرۆڤی ئاســایی بــەهێزتر بێــت و لەودیو شاخەکەوە وەڵامی تریێ بداتەوە بەکزی لەبــەر خۆیــەوە ئــەیوت) نەبــەخوا تــریێ گیــان....مریــەم قــەت لــەمن بێــزار نابێــت، منــی خــۆش ئــەوێ، هــەموو دونیاشی لەبەر خاتری من خــۆش ئــەوێ، تۆشــی زۆر خۆش ئەوێ.

عاشــقە خــەیاڵ قووڵــەکان لەنەستیشــیانداو لــەدووری چــەندین کیلۆمــەتریش توانــای بڕینــی بەربەســتەکانیان هەیــە بۆلەیــەکتر گەیشــتنیان، توانای ناردنی کارو کاردانەوەی هەستە کاریگەریەکانیان هەیە بۆ یــەکتر، جاچ جای لەساتەوەختێکدا دڵدارو دولبەر لەسەر یەك هێڵــی خــەیاڵ رووەو یــەکتر هــەوڵی بەیەکگەیشتن بدەن....رەنگە رێك و بێکــەم و زیــاد لــەودوورەوە بتــوانن وەڵامی رازەکانی یەکتریش بدەنەوە.

ئەو دڕندانەی دەرەوە نایەڵن ئەو گەنجە عاشقە تێر بەدڵی خۆی لەگەڵ خەیاڵەکانیدا تێکەڵ ببێت و منیش وەك نووسەر کەمێك وێنەکانی چاوەڕوانیی مریەم-تان بۆ بەرجەستە بکەم، ئەوەتا جارێکیتریش لورەو دەنگ و پەلاماری گورگەکانی دەرەوە یەعقوب-یان ڕاتەکاندو هێنایانەوە سەرخۆی! ئەویش بەدەنگی گورگەکان زۆر پەست ئەبوو، زۆر بێزار ئەبوو، زۆریش ئەترسا! بەڵام نەیئەزانی چۆن دەرباز ببێت.

دوای سەرلەنوێی دەنگی گورگەکانی دەرەوە لەنێو ژوورەکەدا سەیری شووشە عەترە شکاوەکەی دەکردو لەبەرخۆیەوە نیمچە وڕێنەیەکی دەکرد، ئاواتی ئەخواست جارێکیتریش ڕۆژبێتەوەو گورگەکان ئەوێ بەجێبهێڵن، ئەویش بگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی خۆیان، لەوێش برینەکانی سارێژ بکات و دوای چەند ڕۆژێکیتر خۆی سازو ئامادە بکات بۆ نێو ژوانەکانی مریەم لەگەڵ خۆشیدا شوشە عەترێکیتر بۆ تریێ بکاتە دیاری، بەگەیشتنیشی زۆر زۆر داوای لێبووردن لەخوشکە مراوی بکات و بەسەرهاتەکەی ئەمشەوی بۆ بگێڕێتەوە، لەسووچی ئەو ژوورە دانیشتبوو، لەبەر خۆیەوە بەئاستەم لێوەکانی دەجووڵاندو بەم شێوەیەی بۆ ئێوەم خستە روو ئاوەها بیری ئەکردەوەو ئاوەهاش قسەی دەکرد:-

یەعقوب// ئم....کەبرینەکانم چاك بووەوە....شووشە
عەترێکیتر بۆ تریێ دەکڕم....ئم....شەوێکیتر
دێمەوە بۆلایان....بەخوا داوای لێبووردن لەمریەم و
تریێش دەکەم.

بەدرێژایی ئەم وتووێژەی یەعقوب لورەی گورگەکان لەچواردەوری خانووەکە بڵاو بووبووەوە، بەدوای یەکتردا ئەسوڕانەوە، ئەویش لەژوورەوە خەریك بوو دڵی دەرئەهات، بەڵام ئەمجارە ئەوەندەی نەبرد دووبارە گورگەکان

چوونەوە ژێر بێدەنگی، ئەویش دوای چاوداخستنێکی‌ترو هاتنەوەیەکی‌تری سەرەخۆ، یەك دوو هەناسەی قووڵی هەڵکێشاو تێر تێر بۆنی عەترەکەی ترێی هەڵمژی کەبەنێو ژوورەکەدا بلاو بووبووەوە.

ساتێك بەبێ‌دەنگی لەو سووچی ژووره مایەوە، دواتر ڕێڕەوی خەیاڵی گۆڕی رووەو گوندەکەی خۆیان گەڕایەوەو کەوتە نێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر، تەنها بەوێنە بەبێ‌دەنگی مام حەمەد قادر-ی ئەهاتەوە بەرچاو کەبەگریانەوە چیرۆکەکەی خۆی‌و براکانی بۆ گەنجەکانی نێو دوکانەکەی دەگێڕایەوە، چەند دیمەنێکی مریەم-یش بەبێ دەنگی لەگوندەکەی خۆیان‌و لەژوورەکەی خۆی هەر ئەمدیو ئەودیی سەر جێگا دەکات‌و لەگەڵ ترێ بەبێدەنگی سەیری یەکتر دەکەن‌و هەر بەردەوامیشە لەچاوەڕوانی، هەموو ئەم دیمەنانە بێ دەنگ بێ دەنگ بەبەر سکرینی روئیای یەعقوب دا تێدەپەڕین.

یەعقوب لەنێو ژووره نیمچە تاریك‌و کپ‌و بێ‌دەنگەکە دانیشتووەو سەیری برینەکانی دەکات، گورگەکانیش لەدەرەوە چەند دانەیەك لەگورگە هاوڕێکانیان خواردوەو کەمێك گەدەیان گەرم بۆتەوە، ئەگەر منی نووسەرو ئێوەی خوێنەر بمانتوانیایە لەدوورەوە سەیری ناو رەزەکە بکەین، ئەوا زۆر بەئاشکرا گورگەکانمان ئەبینی:-

گورگەکان بەبێ دەنگی بەدەوری ژوورەکە ئەخولێنەوە.

لورەو هات‌و هاواریان نەماوە.

جارجارەش قەپ ئەگرن لەدیواری دەرەوەی ژوورەکە.

وەکو یاریکردن پەلاماری یەکتر ئەدەن.

وەکو یاریکردن هەڵبەزو دابەز بەیەکتر دەکەن.

تەنها لەهاتووچۆی سەر بەفرەکە چرپەی قاچیان دێت.

دیارە کەمێك لەبرسیەتی رزگاریان بووە.

کاکەی عاشق لەژوورەوە سەرقاڵی برینەکانیەتی، هەندێجاریش گوێی شل دەکات بۆ دەنگی قاچی گورگەکان، سیرە سیڕ بەناو بەفرەکەدا ئەسوڕێنەوە، دواتر لەم ژوورە تەنهایە بەدەم دەستهێنان بەبرینەکانیدا چاوێکی هەڵبڕی بەسەر دیواری دوکانەکەی مام حەمەد قادر نیشتەوە کەئەمشەو یەعقوب پێش هاتنە دەرەوەی بەرەو رێگای ژوانی مریەم گیان لەو کۆڕەی نێو دوکانەکەدا دانیشتبوو وبەم شێوەیە ئەهاتەوە بەرچاوی:-

مام حەمەد قادر// عەرەبەکان بەیانی زوو ئامادەبوون بۆ رۆیشتن، شەویش کەل و پەلەکانیان خستبووە سەر پشتی چەند وشترێك، هەرچی ئێسقان و پاشماوەی گۆشتخواردنەکەی شەو هەبوو هەموویان خستە چواردەورمان و ئێمەیان لەناو ئەوسێ چاڵە بەجێهێشت.

* * *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێلێکی باریکتر، دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

عەرەبەکان بەدەم پێکەنینەوە دوا کەل وپەلی خۆیان پێچایەوە، کەوتنەرێ و هەرسێ براکەشیان بەجێهێشت، ئەوان خوایان نەئەناسی رێزی قورئانیشیان نەگرت، وەلەسەر کردەوەی نامرۆڤانەی ئاوادا پێغەمبەریش لێیان بێبەریە.

کەس لێیان تێناگات چ جۆرە مەخلوقێکن؟ چ جۆرە بوونەوەرێکن؟ بۆ لەساڵی ١٩٦٣ هەموو شتێکیان بەرامبەر بەکورد کردووە!؟

تۆ بڵێی لەساڵی ١٩٦٣و لەساڵی ١٩٨٨یشدا بەزمانەکەی خۆیان بۆیان نازڵ بووبێ و پێیان ووترابێت:- (بئس المصیر لهؤلاء الاکراد فاقتلوهم....)!؟ وبۆیە ئەوانیش بەوکارە هەڵسابن!؟

قافلەی پێپەتیەکان کەوتە ڕێ، بەبێ ئەوەی هیچ گوێ بەو سێ برایە بدەن، وشترەکانیان خستە پێش خۆیان و هەندێکیشیان سەرکەوتن بۆ سەرپشتی ئەو گیاندارە بەرزە، ئەو سێ سەرە خڕەی لەسەر ئەرزەکە دیاربوو زۆر زۆر هاواریان کرد بەڵام زۆر زۆر بێ سوود بوو:-

- هیچ نەبێ یەکێکمان دەربهێنن.
- تەنها دەستمان دەربهێنن.
- تەنها دەستی من، توخوا مەڕۆن، تەنها دەستی من.
- تەنها دەستی کاکم........توخوا تەنها دەستی کاکم دەربهێنن.

بەپێکەنینەوە بەدەم ڕۆیشتن جارجار ئاوڕیان ئەدایەوە بۆیان، بەڵام لەیەك ووشەی کوردی حاڵی نەدەبوون، ئەو سێ برایەش زۆر بێ دەسەڵاتن، زۆر بێکەسن، دەباشە خوایە گیان کە ئەو خەڵکە پێپەتیەت بەم شێوە دەسەڵاتە بەهێزە خەڵق کردووە، قەیچیەکە بەهەمان هێزوتوانا دوای ڕۆیشتنی قافڵەی ووشترەوانەکان ئەو سێ سەرەش لەئەرزەکە دەربهێنە، خۆ هێندەی رزگارکردنی کەشتیەکەی نوح قوڕس وناخۆش نیە.

سێ سەرەکەی سەر ئەرزەکە لەدواوە سەیری ئەو قافلەیەیان دەکردو زۆر هاواریان لێکردن کەبەجێیان نەهێڵن بەڵام هەر سوودی نەبوو....زۆر هاواریان کرد لەرێی خوا....بۆ خاتری پێغەمبەر....بۆخاتری قورئان بەجێمان

مـەهێڵن بـەڵام کـەڵکی نـەبوو، قورئـان لای ئـەوان موجـازەو ئـەڵێن ئیجـازەی بەئێمەداوە کەهەموو شتێك بکەین.

ئـەوان هـەموو کردەوەیـەکی بـاش و خـراپ بۆخۆیـان بـەڕەواو حـەڵاڵ ئەزانن، سێ کوردەکەش تاملیان لەنێو ئەرزەکە نوقم بووەو لەهاوارکردن زیاتر هیچ دەسەڵاتێکی تریان نیە، قافڵەکەی کراس سپیەکانیش بێ گوێدان....بێ ئەو٘ی سڵ لەهیچ بکەنەوە....هەر بەبێ دەنگ لەگەڵ چەند زەردە خەنەیەك و چەند ئاوڕدانەوەیەك و چەند گاڵتەپێکردنێکی بێ ورتە زوو لەناوچەی کفری دوور کەوتنەوەو بەرەو خوارووتر ڕۆیشتن، ئەو سێ برایەش تاماوەیەك بەبێ دەنگی و بەحەپەساوی لەوێ مانەوە.

کـافری خـوا نـەناس بـەم دیمەنـە پەشیمان ئـەبووەوەو داوای ئیمـانی لـەخوا دەکـرد، بـەڵام قافڵـەی وشـترەوانەکان بـەزەییان بـەهیچ کەسـیان نەئەهاتەوە، هەروەکو ووتم وەك لەئاسمانەوە پێیان ووترابێ وایە، بەمشێوەیە ئەو سێبرایەیان بەجێ هێشت! ئەوانیش تەنها سەریان بەدەرەوە بوو....ترس سیمای هەرسێکیانی گرتبووەوەو ڕەنگی مردوویان لێنیشتبوو.

مـام حەمـەد قـادرو هـەردوو براکـەی تاملیـان لەئـەرز چـەقێندرابوون، لـەنزمترین ئاسـتی زەویـەوە لـەدواوە بەحەپەسـاویەوە سـەیری عەرەبـەکانیان دەکرد، ئەوەندەی پێنەچوو خۆیان و وشترەکانیان لەچاوی ئەوان وون بوون، ئـەوانیش بەتـەنها لـەو چـۆڵەوانیە تەختـە مانـەوە! بـەبێ ئـەوەی ئاگایـان لەچواردەوری خۆیـان بێت! تـەنها بەردەمی خۆیـان تاچـەند مەترێك ئەبینی و هیچی‌تر! بـەم شـێوەیە کـات بەڕێدەکـەن و وردە وردە لـەنێوڕۆ نزیـك دەبنـەوە، دوای ماوەیـەك و پـێش نیـوەڕۆ گریـان بەسـەر دەموچـاوی برابچووکەکەیاندا داباری.

*    *    *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

مـام حەمــەد قــادر لــەنێو دوكانەكــەی خــۆی بەرامبــەر بەگەنجــەكان دانیشــتووەو بــەم شــێوەیە بەســەرهاتەكەی خــۆی بــۆ ئــەو كــوڕە لادێییانــە دەگێڕێتــەوە، یــەعقوب-یــش لــەنێو تاكــە ژووره نیمچــە تاریكەكــە ئاوەهــا دانیشـتووەو ئاوەهـاش بـەهۆی گورگـەكانی چـواردەوری خـۆی گێڕانەوەكـەی ئەمشەوی ئەم مامە پیرەو براكانی دێتەوە بەرچاو وخەیاڵ:

مام حەمەد قادر// سەرلەبەیانی ئەوێ فێنك بوو بەلام
وردە وردە خۆر هەڵكشا بەرەو ئاسمان، سات لەدوای
ســات گــەرمتر ئــەبوو، چــواردەوری سەریشــمان
ئێســقانو پاشمــاوەی گۆشــتو وورگو ســەروپێی
مەڕەكانی لێبوو بۆنێكی پیسی لێئەهات.

* * *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێلێكی باریكتر،
## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

بالێرەدا منیش بەدێزانێكی روون هـاوینی سـاڵی ١٩٦٣ لەچوارچێوەو پرۆسەی گێڕانەوەدا بۆتان وێنا بكەم تاكو تـامو چێژێكی وێنـەیی لێـوەربگرن، سـەرجەم (جووڵــە بەســەرهات)ــەكانی ئــەم دەقــە ئەدەبیــە لــەواقیعی ســكرینی رۆئیاتان بوونێكی بەرچاوی هەبێت تائێوەش بۆی بخزێنە نێو بەسەرهاتە یەك لەدوایەكەكانی ئەم ژیانەی مام حەمەد قادر. دەفەرموون:-

* * *

## لەو ڕۆژەی هاوینی ساڵی ١٩٦٣دا

سەروقاچ و ورگی مەڕە خوراوەکانیش کەمێك لەدووری سەری ئەو سێ برایە کەوتبوو، بۆنێکی ئێجگار ناخۆشی بڵاوکردبووەوە، بێزاری بەسەر دەمووچاویانەوە تێکەڵاوی ترس بوبوو، تاکات گەیشتە نێوەڕۆ گۆشت و ئێسقانەکانی ئەوێ کەمێك بۆگەنیان کرد و کەللەی سەری ئەوانیش گەرم داهاتبوو، هەرسێکیان بەریزی یەکتر لەناو ئەرزەکە نوقم بووبوون، برا بچووکەکەیان کەمناڵ بوو دەستی کرد بەگریان و هاواری لێهەڵسا! لەسەرلا ئاوڕی بۆ برا گەورەکەی دایەوە:-

برا بچووکەکە// کاکە گیان ئیتر تەحەمول ناکەم....خەریکە ئەمرم....فریامکەوە.

ئەوانیش پەنایان ئەبردە بەرخوا بەڵکو کەسێکیان لێوەدەرکەوێ لەو شوێنە رزگاریان بکات، چاوەڕوانی فریشتەکانی خوایان دەکرد رزگاریان بکات، هەندێجار پەنایان ئەبردە بەر شێخ و پیاوچاکانیش بۆئەوەی رزگاریان بکات، مام حەمەد قادرو براگەورەکەی هەردووکیان لەوەیتر گەورەتربوون بۆیە بەردەوام دڵی برا بچووکەکەیان ئەدایەوە و قسەی خۆشیان بۆ ئەکرد:-

- ئێستا نا....تۆزێکیتر زرگارمان ئەبێت.
- کەمێك دان بەخۆتا بگرە ئێستا دێینە دەرەوە.
- بەخوا کاکە گیان ئەمرم!....چیتر تەحەمول ناکەم.
- قەیناکە بەقوربان....کەمێك دانبەخۆتا بگرە ئێستا دەرمان ئەهێنن.

- ئـاخر كـێ ئاگـای لێمانــه!؟ كـێ دەرمـان ئەهێنێ!؟
- خــەمت نــەبێ بــەقوربان ئێســتا رزگارمـان ئەبێت.

زۆر لەوجۆرە قەسەیان بۆ برابچووكەكەیان ئەكرد، بەردەوام لەسەرلا سەیریان ئەكردو دڵنەواییان دەكرد، ماوەیەكیش بەمشێوەیە بەردەوام بوون‌و بەمشێوەیە دڵی برا بچووكەكەیان ئەدایەوە، هەرچەندە خۆشیان ئەترسان بەڵام لەبەر دڵی ئەو دەریان نەدەخست.

دوای ماوەیەك بەم شێوەیە مانەوە، بەم شێوەیەش خەفەتی هەموو دونیا چوو بەدڵیانا، ئاخ بۆ دەستێكی خوایی‌و ئەو سێ برایەی رزگار بكردایەو موعجیزەی خوایی سەدەی بیست لە كوردستان بهاتایە دی، خۆ لەلای خودا كوردستان شوێنێكی پیرۆزە هەربۆیەش دوا وێستگەی كەشتیەكەی نوح پێغەمبەر لەسەر شاخێكی ئەم كوردستانەیەو لەوێ نیشتۆتەوە، بەڵام چی؟! ئەوە تا هەرلەو نزمایییەی سەری ئەو سێ برایە لەدووری چەند مەترێك گورگێكیان بەدیكرد خەریكە لەبرا بچووكەكەیان نزیك ئەكەوێتەوە.

ئای لەو ساتەی هەردوو برا ئەو گورگە گێژەی بەرگەرمایان بەدیكرد!
ئای لەو ساتەی لەگەڵ هەنگاوەكانی ئەوگورگە لەمردن نزیك ئەبوونەوە!

ئای لەو ساتەی هەردوو برا بەبینینی گورگەكە خەریكە دڵیان دێتە دەرەوەو دڵدانەوەی برا بچووكەكەشیان لەئەستۆدایە.
ئای....ئای‌و ئاخ....ئاخ....هەزاران ئاخ بۆ ئەم سێ برایە.

ئاخۆ ئەبێ ئەم دیمەنە بەچ موزیکێکی گوزارشتی بخنرێتە زەینی خوێنەری بینەر؟ تاکو لەسەرەخۆ سەیری سکرینی روئیای خۆی بکاتو دیمەن دوای دیمەن بەدواداچوونی خۆی ئاوێتەی سەر هێلی گشتی ئەم رووداوە بکات؟

- موزیك لەگەڵ ئیقاعی رێورۆیشتنی گورگەکە ئەبیسترێ؟
- موزیك لەگەڵ ئیقاعی ترپەی دڵی مام حەمەد قادرو براگەورەکەی ئەبیسترێ؟
- موزیك لەگەڵ ئیقاعی واقوڕمانی دڵی مام حەمەد قادرو براگەورەکەی ئەبیسترێ؟
- موزیك لەگەڵ ئیقاعی تەنیایی نێو ئەرزە تەختەکەی ناوچەی گەرمیان ئەبیسترێ؟

* * *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

یەعقوب لەم ژوورە ساردو ترسناکە دانیشتووە، گوێچکەکانی هەڵخستووە بۆ هەردوو پەنجەرە بچووکەکە تاکو ئاگای لەهاتووچۆو پەلاماری گورگەکان بێت، دەموچاویشی ئەبلەق بووەو رێك ئاوور ئەداتەوە سەیری دیوارەکەی بەردەمی ئەکاتو خەیاڵ هەڵیئەرفێنێ بۆ دوکانەکەی مام حەمەد قادرو لەسەرەخۆ چیرۆکەکانی ئەمشەوی ئەو مامە پیرەی دێتەوە بەرچاو، ماوەیەك بەمشێوەیە لەوێ بەبێ دەنگی دائەنیشێو تەنهایی نێو ژوورەکە دەرئەکەوێ.

* * *

## هێلی گشتی بەردەوامە........

مـــام حەمـــەد قـــادر لـــەنێو دوکانەکـــەی بەردەوامـــە لەگێڕانـــەوەی بەسـەرهاتەکانی، گەنجـەکانیش بەشـێوەیەك چـاویان زەق بووبـووەوە هـەروەك گورگەکان بۆلای ئەوان هاتبن! یان ئەوان تـاکو ملیـان لەئەرزەکە چەقێندرابن! هەریەکەیان لەهزری خۆیدا سەرقاڵی ئەوە بوو کەسێ پیاوی لەئەرز چەسپیو چـۆن لەدەسـت ئـەم گورگـە رزگاریـان بـووە؟! یـان چـیان بەسـەرهاتووە؟! مـام حەمـەد قـادر لەگـەڵ چـا تێکـردن سـەرقاڵ بـوو ئـەوانیش لەگـەڵ یـەکتر سەرسـام بوون‌و بۆیەکتریان ئەچرپاند:-

- مام حەمەد قادر چۆن دەرباز بووە!؟
- نازانم!........
- لەوەئەچێ گـورگ براکـانی تـری خـواردبێت، وانیە!؟
- وەڵڵاهـی منـیش نـازانم........! دەتـۆ گـوێ بگرە ئێستا خۆی بۆمان باس ئەکات.
- ئم........گوناحە!....بەخوا مام حەمـەد قـادر زۆر گوناحە.

*　　*　　*

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر، دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

مام حەمەد قادر لەگەڵ هەردوو براکـەی‌تری لەئەرزەکە چـەقێندرابوون! لەولا لەژێر خۆڵەکە سێیەم سەر بوو، براگەورەکەشیان لەناوەڕاستدا بوو، بەڵام برابچـووکەکەیان لەپێشـەوە بـوو لەگورگەکـە نـزیکتر بـوو! ئـەوان هـەردووکیان

چەند ساتێکە گورگەکەیان بەدیکردووە بەڵام نەیانئەویست قسە بکەن نەوەکو برابچووکەکەیان بترسێ.

چەند ساتێك بەم شێوە دڵەڕاوکێیە سەیری ئەو گورگەیان کرد! ئەو گیانداره دڕندەیەش لەوێ واقی وڕمابوو وتێیدەڕوانین، ئەوەندەی نەبرد گورگەکە زیاتر لێیان نزیك بووەوە! خورپەی دڵ کەوتە نێو سنگی هەردوو برا، پەتی تەحەمولیان پچڕاندو هەردووکیان کردیان بەهەراو دەنگە دەنگ! لەگەڵ ئاوڕدانەوەی برا بچووکەکەیان گورگەکە تێیتەقاندو رایکرد!

- موزیك لەگەڵ ئیقاعی ترسان! تێکەڵاو بەترس و گریان و دڵەڕاوکێ برا بچووکەکەیان بوو!

برابچکۆلە زۆر ترسا! دەستی کرد بەگریان زۆریش هاواریکرد کەدەریبهێنن، تەنها ئەو دوو برایەی شك دەبر کەهاواریان بۆ بەرێت و رزگاری بکەن، بەڵام چۆن دوو برا بوون! ئەوانیش وەکو خۆی لەلایەن ئەو کراس درێژانەوە لەئەرز چەقێندرابوون.

لەسەردەمی کۆن خودا دەریای کردووە بەدوو لەت و موسای پێغەمبەر بەوێدا رۆیشت و لەدەست لەشکری فیرعەوندا رزگاری کرد، دەستی خوایی زۆر کەسی لەغەدرو ستەم رزگار کردووە، دەبا ئاواتی ئەم پڕڕەوە پێپەتیانە نەهاتایەتەدی و ئەوسێ برایە بەدەستێکی پیرۆزی خوایی دەربهاتنایەو ئەمەشیان بچوایە ریزی موعجیزەکانی تر.

* * *

## هێلی گشتی بەردەوامە........

## کات

## دوای نیوە شەو ە

## سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٩٤ـە

## خەیاڵەکانی یەعقوب دوکانەکەی مام حەمەد قادر-یان بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ تاکە ژوورەکەی رەزموانەکان

دڵداری برینـدار لـەو ژوورە تەنهایـە ئـاوا بـیر لـەمام حەمـەد قـادر ئەکاتەوە، لەهەمان کاتیشدا لەو ژوورە سارد و تەنهایە زۆر ئەترسێ، شتی زۆر سەیرسەیر لەهەگبەی بیرەوەریەکانی ئەودا سەردەرئەهێنن وەك:-

چۆن براکانی مام حەمەد قادر گورگ خواردوونی.

چۆن براکانی خۆی گورگ خواردوونی.

ئازاری رزگاربوون و نەبوونی خۆی.

ئازاری برینەکانی دەست و قاچی.

ئازاری سەرمای نێو ژوورەکە.

ئازاری چاوەڕوانی مریەم گیان.

هەموو ئەمانە وایان لێئەکرد بگەڕێتەوە بۆ ئەرشیفی بیرەوەریەکانی و لەخەیاڵدانی خۆی بەمشێوەیە بیربکاتەوەو چەند ورتەیەکیش لەدڵی خۆیدا لەگەڵ خۆی بکات:-

یەعقوب// زۆر ئەترسم بەدەردی براکانی مام حەمەد قـادر بچـم! ئـەی مریـەم؟! دوای مـن چـی ئەکات؟!....مریەم گیان بەقوربانت بم.

لەسوچێکی ئەم ژوورە دانیشتوە، لەوێدا هەگبەی یادەکانی داخست و وازی لەبیرکردنەوە هێنا و گەڕایەوە بۆلای دەردی خۆی، سەیری دارودیواری

ژوورەکەی دەکرد، دواتر هەستەکانی چڕکردەوە بۆ دەرەوەی ژوورەکە! بەڵام گورگەکان زۆر بێدەنگ بوون، ئەویش دانیشتووەو بەم شێوە بێدەنگیە لەکونەکانی بنمیچەکەوە سەیرێکی ئاسمانی کردو لەدڵی خۆی ووتی:-

یەعقوب// (لەکونەکانی بنمیچەکەوە سەیری ئاسمانی ئەکردو لەدڵی خۆی قسەی دەکرد) خودایە رزگارم بکە، خودایە منیش وەکو دوو براکەم گورگ خواردوو نەبم! وەکو دوو براکەی مام حەمەد قادر گورگ خواردوو نەبم! خودایە داوای رەحم و بەزەیت لێئەکەم....لەگوناهەکانم ببوورەو رزگارم بکە، موساو عیساو محمد....هەرسێکتان پێغەمبەری خودان....دوعام بۆ بکەن با رزگارم بێت.

لەم ژوورە تەنهاو ساردو ترسانەکەدا بست بەبست چاوی ئەگێڕا بەسەر دیوارەکاندا وەکو شێتی لێهاتبوو! لەوە ئەترسا وەکو براکانی مام حەمەد قادرو براکانی خۆی گورگ بیخوات و گۆڕیشی نەبێ.

بەنیئادەم روحی خۆی زۆر خۆش ئەوێ، لەکاتی تەنگانەدا پەنا بۆ هەموو جۆرە دەربازبوونێک ئەبات، بیر لەهەموو شێوزاێکی رزگاربوون دەکاتەوە، بۆیە یەعقوب وردە وردە هێور بووەوە، هەستی کرد لەنێو ئەم ژوورە تەنهایەدا ئەبێ بەوردی و ژیرانە بیر بکاتەوە، بۆیە کەمێك ئارام بووەوەو بڕیاریدا نابێ پەلە بکات، چونکە پەلەکردن بێ بیرکردنەوە لەگەڵ گەلە ئاژەڵێکی ئاوا دڕندەدا مەینەتی بەدواوەیە.

لەو سووچەی کەلێیدانیشتبوو نیمچە پاڵکەوتنێکیش لەسەر پشت لێراکشابوو، هەرلەوێوە ئەیڕوانیە کونەکانی بنمیچەکە، دواتر لەبێدەنگی گورگەکان دڵنیابوو، کەمێکیش ئارامی بۆ گەڕایەوە، بۆیە بەو راکشانەوە

جـارێکیتریش دڵنیـا بـوو، جـارێکیتریش بـۆ بیرچـوونەوەی ئازارەکـانی گەڕایەوە نێو دووکانەکەی مام حەمەد قادر، ئەو پیاوە پیرەش هەربەردەوامە لەدەرخسـتنی چـۆنیەتی بەسـەرهاتەکانی زەمـانی گـەنجی خـۆیو هـەردوو براکـەیو ئـاواش وێنـەی دوکانەکـەی مامـە بـەدەنگو رەنـگ ئەهاتـەوە بەرچاوی:—

مـام حەمـەد قـادر// عەرەبـەکان ئەوەنـدە بەتونـدی خۆڵەکـەیان پەسـتابووەوە بـەهیچ شـێوەیەك نەمانئـەتوانی بجـوڵێین!....کـاتیش تائـەهات گـەرمتر ئـەبوو....ئـارەق بـەناو چـاومانا ئەهاتـە خـوارەوە، هەندێجار چاومان دائەخستوو لەدواییدا هـەر بەزۆر دەمانکردەوە بۆئەوەی بەردەمی خۆمان ببینین.

*        *        *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر، دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........ ئەو رۆژەی هاوینی ساڵی ١٩٦٣

هەرسێ بـرا کوێسـتانیەکە لەناوچـەی کفـری بەمشـێوەیە لەبـەر تینـی گەرما مانـەوە، هـەموو لەشیان لـەناو خاکەکە فێنك بوو ولەوانەیـە کـەمێکیش سارد بووبێت، چونکە لەهاویندا سەرما ئەچێتەوە ژێـر خـاكو لەزستانیشدا بەپێچـەوانەوە، بـەڵام سـەری هەرسـێکیان لسـەر ئـەو ئـەرزە هـاتبووە دەریو زۆریـــش گــەرم داهـــاتبوون، دوای تاوێـــكو دوای هـــەڵبڕینی گورگەکـــە بـەهاتوهاوارەکانیان دووبـارە گەڕایـەوە بۆلایـان! ئـەوانیش دیسـان دەسـتیان

کرد بەهەراو هاتەهات، گورگەکە سەرلەنوێ ترساو رایکرد! برا بچووکەکەیان ئەوەندە ئەترساو ئەگریا هەرئەوەندە مابو گیانی دەرچێ.

چەندجارێك بەمشێوەیە گورگەکەیان هەڵبڕی، بەڵام جارلەدوای جار راکردنی گورگەکە کورتتر ئەبووەوە! چونکە ئەیبنی و ئەیزانی لەدوای هەموو هاتوهاوارێك کەس بەدوایدا راناکات و پەلاماری نادات، بۆیە ئەویش جار لەدوای جار ترس و شەرمی دەشکا! راکردن و گەڕانەوەی گورگەکەو هاتوهاواری ئەوان بەردەوام بوو! تاوایلێهات گورگەگە بەتەواوی ترس و شەرمی نەما.

ئاخ لە بێکەسی ئەم سێ برایە.

ئاخ لەزەلیلی ئەم سێ برایە،.

ئاخ لەبێدەسەڵاتی ئەم سێ برایە.

دواجار گورگەکە لەگەڕانەوەیەکدا بۆلایان پەلاماری سەری برا بچووکەکەیدا تاسەرسنگی هەڵیدڕی و خواردی! خوێن لەملی ئەو منداڵە فیچقەی دەکرد، سەرو گوێلاکی گورگەکەی لەخوێن هەڵکێشا، مام حەمەد قادرو برا گەورەکەی کەمێك لەدووری ئەو برا بچکۆلەیە هەر باوکەڕۆو براڕۆیان بوو! بەڵام گورگەکە بەهیچ شێوەیەك لێیان نەترسا چونکە هەرسێکیان لەبەردەمی بێدەسەڵات بوون و کەس نەبوو رێگری لێبکات.

*　　*　　*

## گەڕانەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

### کات

### دوای نیوە شەو ە

### سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٩٤ـە

### یەعقوب جارێکیتریش گەڕایەوە بۆ تاکە ژوورەکەی ڕمزەوانەکان

یەعقوب لەنێو ژوورە تەنهاکەدا وێڕای ئەو ترس و دڵەڕاوکێیە زۆریش سەرمای بوو، لەوسووچی ژوورەدا خۆی هەڵکوڕماندبوو، زەینەکانی دابەشکردبوو بۆ کونەکانی بنمیچەکەو بۆ دەرگای ژوورەکەو لەهەردوو پەنجەرەکەشەوە بۆ دەرەوەی ژوورەکەش، تابەتەواوی وێنای هاتوچۆی گورگەکان بکات، ئەم عاشقە تائێستا بەهیچ شێوەیەك لەگورگ نەترساوە بەڵام ئەمشەو برینداره جگەلەوەی چواردەوری بەگورگ گیراوە لەخەنجەرێك زیاتر چەکی باشیشی پێنیە، بۆیە هەردوو براکانی خۆی و هەردوو براکەی مام حەمەد قادری هاتۆتەوە یاد کەچۆن گورگ هەرچواریانی خواردووەو کەسیش نەیتوانیوە رزگاریان بکات.

یەعقوب بەهۆی ترس و دڵڕاوکێی گورگەکانی چواردەوری بیرەکانی جێگیر نین، بۆیە بەبەردەوامی لەنێو فەزای ترسناکی ژوورە ساردو نیمچە تاریکەکەدا خەیاڵەکانی هەڵئەفڕن و بەرەو گۆڕەپانی مردنی هەردوو براکەی خۆی و هەردوو براکەی مام حەمەد قادر ئەڕۆن، لەماوەی شەش حەوت کاژێری نێوان دوای نیوە شەو وبەرەبەیان چەندجارێك ئەڕۆن و ئەگەڕێنەوە. ئەوەتا یەعقوب لەوژوورە نیمچە تاریك و تەنهایە دانیشتووەو یەك لەدوای یەکتر ئەم دیمەنانە بەجووڵەو دەنگ دێتەوە بەرچاوی، بامنیش بە شێوە گێڕانەوەیەك بۆ ئێوەی خوێنەر وێنا و بەرجەستەی بکەم و چەند لقە جووڵەیەکی رووداوەکان بۆ بەواقیعاندن ئامادە بکەم:-

یەکەم) یەعقوب کوڕە گەرمەکەی ئەمشەوی نێو دوکانی مام حەمەد قادر–ی ئەهاتەوە بەرچاو، مامە پیرە باسی کاتی دوای نیوەشەوی دەکرد بۆ لەچاڵنانیان لەلایەن عەرەبەکان دواتر بووە هۆی ئەوەی گورگ دوو برای ئەم پیاوە پیرو بێکەسە بخوات:-

مام حەمەد قادر// (لەبەرامبەر گەنجەکان دانیشتووەو بەردەوامە لەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی) کەعەرەبەکان سەیری کاتژمێرەکەی دەستی خۆیان کرد هاربوون، دواتر کات گەیشتە نیوەشەو گریان گرت، نازانم بۆچی وەستان تا نیوە شەو تەواو بوو ئینجا ئێمەیان خستە ناو چاڵەکان؟!

*************************************

دووەم) یەعقوب دیمەنی کابرای لێپرسراوی پاسدارەکانیشی ئەهاتەوە بەرچاو کەچۆن باسی کاتی دوای نیوەشەوی دەکرد بۆ ناڵکردنی ئەیوب و دوای بەرەڵلاکردنیشی گورگ لەدەرەوەی رەبیەکە خواردی.

لێپرسراوی پاسدارەکان// (لەکۆکین تەواو ئەبێت، ناڵەکان بەرز دەکاتەوەو سەیری خێزانەکە ئەکات و پەنجەش ئەخاتە سەر کاتژمێرەکەی دەستی) کات دوای نیوەشەوە، ئێستا کاتەکە لەبارە.

*************************************

سێیەم) دوای ئەوە یەعقوب دیمەنی سەربازەکانی بەعسی ئەهاتەوە بەرچاو کەلەهاوینی ئەمساڵدا لەناوچەی کفری باسی نیوەشەویان دەکرد بۆ بەرەڵلاکردنیان دواتر گورگ کامەرانی برای خوارد.

سەربازێك// (سەیری کاتژمێرەکەی دەستی دەکات)
ئێستا کاتی هاتووە، دوای نیوە شەوە بابیانبەینە دەرەوە.

************************************

چوارەم) ئەو دیمەنەی ئەمشەوی خۆی ئەهاتەوە بەرچاو کەلەناو دوکانەکەی مام حەمەد قادر سەیری کاتژمێرەکەی دەستی دەکرد وردە وردە لەنیوە شەو نزیك ئەبێتەوە.

یەعقوب// (لەنێو دوکانەکەی مامە پیرە هەڵئەسێتەوە بۆ ماڵئاوایی کردن) هاورێیان بەیارمەتی خۆتان من ئەبێ برۆم.

پێنجەم) لەدێکەی خۆیان، هەرئەمشەو لەناو ژوورەکەی خۆیان لەسەرپێ وەستاوەو ئەیەوێ بەرەو ژوان بێتەوە.

یەعقوب// (ئەچێتە لای چراکە کەنزیکە لەدەرگای ژوورەوە، ئاورێکی بۆ دایكو خوشکەکەی ئەداتەوە دواتر توزێك چراکە کزئەکات، دەرگاکە ئەکاتەوە زۆر بەخێرایی ئەچێتە دەرەوە).

ئەم گەنجە بریندارەی نێو ژۆورە ساردەکەی رەزەوانەکان بەهۆی سەرماو سۆڵەی شەوەکەو ترسی پەلاماردانی گورگەکان یەك لەدوای یەك ئەم پێنج دیمەنەی هاتەوە بەرچاو. ئەوەتا ئێستاش بیر لەکامەران-ی برای دەکاتەوە کەلەشەوێکی هاوینی ئەمساڵی ١٩٩٤دا لەناوچەی کفری بەبەرچاوی خۆیو باوکی گورگ خواردی! ئەوانیش نەیانتوانی رزگاری بکەن چونکە خۆیو باوکی هیچ جۆرە چەکێکیان پێنەبوو، دوای هەوڵدانێکی زۆر نەك نەیانتوانی براکەیان لەدەمی ئەو گورگە دەربهێنن بەڵکو ئەگەر لەوکاتەدا

هەندێ قاچاغچی وەکو فریشتە دەرنەکەوتنایە ئەوانیش بەدەردی کامەران ئەچوون.

*　　*　　*

## جیابوونەوەی لقە جوولە بەهێلێکی باریکتر، دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

لەم هاوینی ١٩٩٤ دا یەعقوب لەگەڵ کامەران و باوکی‌دا دوای ئەوەی رژێمی بەعس هەندێ لەپێشمەرگە گیراوەکانی بەردابوو چووبوون بۆ سۆراخی یوسف-ی برا گەورەیان کە لەناوەڕاستی ساڵانی هەشتاکانی سەدەی رابردوو گیرابوو و تاکو ئەوکاتەش بێ‌سەرو شوێن بوو، بەڵام لەخاڵی پشکنینی سەربازەکانی بەعس لەناوچەی شاری کفری هەرسێکیان ئەگیرێن و دوای سوکایەتی پێکردنیان، دوای لێکۆڵینەوە، دوای ئەزێتدانێکی خراپ، لای خۆیان گلیان ئەدەنەوە تادرنگانێکی شەو گاڵتەیان پێئەکەن، دوای ماوەیەك بەم شێوەیە سەربازەکان سەیری کاتژمێرەکەی دەستیان دەکەن و بۆ یەکتر قسە ئەکەن:-

سەربازێك// (سەیری کاتژمێرەکەی دەستی دەکات)

ئێستا کاتی هاتووە، دوای نیوە شەوە بابیانبەینە دەرەوە.

ئێستا دوای نیوەشەوە هەرسێکیان بەرەڵا ئەکەن، سەربازەکان بەچەکەوە تاماوەیەکی زۆر لەرەبیەکانی خۆیان دووریان ئەخەنەوە بەرەو سنووری کوردستان هەڵئەکشێن، بەرێیان ئەکەن بەرەو ناوچە ئازادکراوەکان، لەرێگا لەدوایانەوە ئەڕۆن و بەدەم رۆیشتن هەربەئامارەی ئاژەڵی ترسناك گاڵتەی ئەوەیان پێئەکەن کەئەم ناوچەیە پڕە لەگورگ و ئەتانخۆن، چونکە

خۆیان چەکیان پێبوو بۆیە نەئەترسان، ئەو سەربازانە وایان نیازبوو تاماوەیک لەرەبیەکانی خۆیان دووریان بخەنەوە دواتر بگەڕێنەوە، ئەو باوك و دوو کوڕەش بەڵکو لەو شەوە تاریکە گورگیان بۆ پەیدا بێت و تیابچن! سەربازەکان ئەیانزانی ئەم ناوچەی گەرمیانە لەشەودا گورگی زۆر دڕی هەیە، بەلام مەلا عەلی و دوو کوڕەکەی خەڵکی ئەوێ نەبوون و شارەزاییان نەبوو، ئەوان وەکو چەندین خێزانی‌تر بۆ سۆراخی کوڕەکەیان هاتبوون و هیچی‌تر.

یەعقوب ئەوشەوەی لەبیرە کەسەربازەکان لەدواوە بەهەردوو پەنجەی دۆشاومژەیان ئاماژەی گوێچکەی گورگیان بۆ ئەکردن و سەریشیان بەرز دەکردەوە بەدەم لوورە لووریان بۆ ئەکردن، مەلا عەلی باوکیان لەپشتی هەردوو کوڕەکەی ئەڕۆیشت و نەیئەهێشت ئاوڕ بدەنەوە، بەلام یەعقوب و کامەرانی برای جارجارە ملیان بۆ ئەسوڕاندن، دواتر مەلا عەلی بەدەست سەری هەردوو کوڕەکەی دەسوڕاند بۆ پێشەوەو نەیهێشت بەتەواوی سەربازەکان ببینن کەچۆن بەدەست و بەدەم ئاماژەی هەندێ شتی سەیر دەکەن، هەرچۆنێ بێت یەعقوب زۆر بەچاکی لەبیریەتی کەهەردوو برا لەکاتی ئاوڕدانەوە توانیان کەمێك سەربازەکان ببینن کەبەدەمو دان جیڕکردنەوەو ووشەی ((یەن یەن)) وەکو لاسایی کردنەوە وئاماژەکردن بۆقەپگرتن و پەلاماردانی گورگ و ئاژەڵە دڕەندەکانی‌تر.

هەرچۆنێ بەهۆی ئاماژەکانیانەوە شێوە جووڵەی گازگرتنی گورگ یان سەگ گەیشتە زەینیان، بەلام بەهیچ شێوەیەك پێشبینی ئەوەیان نەدەکرد کەبەمشێوەیەو بەمشەوە گورگ پەلاماریان بدات و یەکێکیان بخوات، بۆیە لەگەڵ ئاوڕدانەوەیان بۆ سەربازەکان و جووڵەی دەست و دەمی ئەوان کەمێك زەردەخەنە ئەیگرتن، خۆشیان ئومێدیان بەدەربازبوون هەبوو بۆیە کەمێك دڵیان خۆش بوو، چونکە هەڵسوکەوتی سەربازەکان دیار بوو کەلەو دەشتە

نیمچە تاریکە تاماوەیەك بەڕێیان دەکەن دواتریش نەیانئەزانی چۆن‌و بەچ شێوەیەك دەرئەچن، ئەوان هەر ئەوەندەیان ئەزانی لەلایەن سەربازەکانەوە ناکوژرێن بەڵکو بەڕێدەکرێن، بەڵام مام عەلی بەهۆی ئەزموونی زیاتری لەژیاندا زیاتر ئەترسا، چونکە زۆرجار مرۆڤی زانا ترسنۆکترە لەمرۆڤی نەزان، کوردیش ئەڵێ نەزان بەقاچێك تێئەکەوێ و زاناش بەهەردوو قاچ.

هەرسێکیان لەپێشەوەی سەربازەکان ئەڕۆیشتن، ئەوەندەی نەبرد لەرەبیەکانی دوژمن دور کەوتنەوەو بەرەو شاری کفری هەڵکشان، تاماوەیەك بەمشێوەیە ڕۆیشتن، وردە وردە شەوە تاریکەکە ئەبڕن، خەریکە ڕێگاکە درێژە ئەکێشێ! خەریکە یەعقوب‌و کامەرانیش وەکو باوکیان بێباوەڕیان لەلادروست ئەبێ! هەردوو برا گەنجەکە لەبەردەمی باوکیاندا ئەڕۆیشتن‌و خەریکی چرپە چرپی خۆیان بوون:–

- بۆچی ئەو سەربازانە ناگەڕێنەوە؟!
- نازانم! چیان ئەوێ؟!
- ئەترسم درۆمان لەگەڵ بکەن! ووو!!!! ووو!!! دوایی بمانکوژن!
- نازانم! منیش زۆر ئەترسم!
- (بەچرپە) بەسە کوڕم بەبێ دەنگی بڕۆن.
- (بەچرپە) گوێ بگرن.
- (هەردووکیان ئاوڕ ئەدەنەوە).
- ئاوڕ مەدەنەوە! ئەگەر لەدواوە تەقەیان لەمن کرد! ئێوە مەوەستن، یەکسەر ڕاکەن....باش؟!

* <u>(هـــــەردووكيان ترســـــيان لێئەنيشـــــێو دەمووچاويان تێكئەچێ)</u>

لەرێگا هەرسێكيان دڵەكوتێيان بوو! وايان ئەزانی ئەو سەربازانە بۆ ئەوە دووريـان ئەخەنـەوە تالـەو چۆڵەوانيەدا بيـانكوژن! ئەگـەر وانيـە بۆچـی ناگەڕێنـەوە؟! ئـەی كـاری ئـەوان چـيەو چـۆنە؟! تـاكوێ بەدوايانـەوە ئـەبن؟! هەرسێكيان بەمشـەوە بـەردەوام بـوون لەرۆيشـتن، سـەربازەكان تاماوەيـەكی‌تر بەدوايانـەوە بـوون، ئـەوانيش بـەهيچ شـێوەيەك لەسـەربازەكان نەدەگەيشـتن! نەيانئـەزانی بـۆ ئـەوە هـاتبوونو تادڵنيـا بـن لەسـنوری ئەوانـدا دەرئەچـنو نامێننەوە. ئەو باوكو دوو كوڕەش دوای بێزاربوونيـان لـەو رۆيشتنە لەترسا نەيانئـەتوانی ئاوڕبدنـەوە، هەربـەو ترسـەوە ملـی رێگايـان گرتبـوو، مەلاعـەلی هـەردوو كوڕەكـەی خسـتبووە پـێش خـۆی نـەوەكو سـەربازەكان لـەدواوە دەسـترێژيان لێبكـەن، حـەزی ئـەكرد خـۆی ببێكـێو كوڕەكـانی دەربـازبن، بـەردەوام بـوون لەرۆيشـتن، يـەعقوب بـيری نـەماوە چـەند دەقيقـە لەسـەربازو رەبيەكـەيان دووركەوتنـەوە، بـەڵام ئـەوەی لـەبيرە بـاوكی بەسـووكی چـرپانديە گوێيان:-

<u>مـەلا عـەلی// (لەترسـا زۆر لەسـەرەخۆ قسـەی ئـەكرد بۆئـــــــەوەی دەنگيـــــــان نـــــــەڕوات!)</u>

كامەران....يەعقوب....بوەستن.

* * *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

يەعقوب لەگەڵ بانگكردنی باوكی سەرپۆشی خەياڵەكانی هەڵدڕی لێی هاتـەدەرەوەو دووبـارە كەوتـەوە نێـو ژووره سـاردو تـەنهاو پـڕ لەترسـەكە،

جارێکی تریش گوێی گرت بۆ گورگەکانی چواردەوری هەموویان لەدەرەوە بێدەنگ بوون....بێ هەست بوون....چونکە دوای خواردنی هاوڕێ گورگەکانیان هێشتا برسیان نەبۆتەوە! کەمێکیش گوێی لەخرچەی قاچیان بوو کەبەهۆی لەهاتوو چۆیاندا لەسەربەفرەکە بەدەوری ژوورەکەدا ئەبیسترا!

عاشقی بریندار دوای دڵنیا بوون لێیان لەبەرخۆیەوە ئاراستەی خەیاڵەکانی گۆڕیو بیری لەمریەم گیان ئەکردەوە، غوربەتو تەنهایی ئەم شەو زۆر کاریگەری هەبوو لەسەری، زۆریش بیری باوەشە گەرمەکەی مرە گیانی دەرکرد، زۆریشی حەزئەکرد بگاتە ناودێو جامە ئاوەکەی دەستی ئەوکچە وردیلە لادێییە بخواتەوە، هەلەوێ لەقوڵایی دڵ لەگەڵ خۆی ئەدوا:-

یەعقوب// ئەبێ مریەم چی بکات؟ چۆنی چاوەڕی من
بکات؟ شەوگاریش درەنگە ئەزانم ئەمشەو لەگەڵ
ترێ ئێشك ئەگرن.

کاکەی عاشق لەو سووچە دانیشتووە، لەو ژوورە تەنهایە لەوڕێنەو بیرکردنەوە زیاتر هیچیتری لەدەست نایەت، یەك لەدوای یەك یادگاریە تاڵو شیرینەکانی دەرئەهێنێو تاوێکی کەم لەگەڵیدا ئەژی پاشان سەرلەنوێ دایئەپۆشێتەوەو یەکێکیتریان دەرئەهێنێ لەگەڵ ئەویشدا تاماوەیەك تێکەڵ ئەبێت.

یەعقوب بەهۆی نزیك بوونەوەی مەرگی خۆیو گیرانی چواردەوری ژوورەکە بەو گورگە برسیو هارانە جارێکیتریش بیری لەمەرگی کەسانی گورگ خواردووی پێشوو ئەکاتەوەو زۆریش ئەترسێ، هەربەو ترسەوە چاوی ئەگێڕا بەسەر دیوارە تاریکەکانی ژوورەوە، بێ هیوا جارێکی تریش گەڕایەوە بۆ نێو دوکانەکەی مام حەمەد قادرو دووبارە گوێی بۆ قسەکانی گرت.

* * *

## هێلی گشتی بەردەوامە........

گەنجەکان بێ دەنگ لەنێو دوکانەکە گوێیان بۆ مام حەمەد قادر گرتووە، خەریکە ئەگەنە نیوەی شەو، جگەرە کێشانیان لەبیر چۆتەوە، چای زۆریشیان خواردووە، هەرهەموویان ئەبڵەق بوون بەدیار بەسەرهاتەکەی مام حەمەد قادر! بەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی خۆیو براکانی، هەرچەند گورگەکە لەزمانی مام حەمەد قادر لەکاتی گێڕانەوەدا پەلاماری براکانیی ئەدا....واقوڕمانی سەردەموچاوی یەعقوب لەنێو دوکانەکەدا ئەگوازرایەوە بۆ سەر دیواری تاکە ژوورەکەی نێو ڕەزەکەو لەگەڵ دەنگی هاتووچۆی قاچی گورگەکانی دەرەوە تێکەڵاو ئەبوو! دواتر مام حەمەد قادر-ی ئەهاتەوە بەرچاو کەلەنێو دوکانەکەیدا بەسەرهاتەکانی خۆی ئەگێڕایەوە:-

مام حەمەد قادر// (بەگریانەوە) هەرچەند گورگەکە
قەپی لەدەموچاوی ئەو برا بچووکەم ئەگرت گوێم
لەخرچە خرچی ئێسقانەکانی ئەبوو! خوێنیش
فیچقەی دەکرد، دەموچاوی گورگەکەش بەخوێن
سوور بووبوو.

یەعقوب لەو ژوورە تەنهایەو بەمشەوە ئەترسێ! لەگەڵ هاتنی ووشەی خرچەی سەرزمانی مام حەمەد قادر بەبیریدا زیاتر ئەترسا! چەند جارێك دەموچاوی مام حەمەد قادر لەکلۆزێکی پڕبەپڕی سکرینی زەینەکانی ئەهاتەوە بەرچاو، دەمولێوی ئەجولاندو ئەیووت:-

مام حەمەد قادر// گوێم لەخرچە خرچی
ئێسقانەکانی ئەبوو!
مام حەمەد قادر// گوێم لەخرچە خرچی
ئێسقانەکانی ئەبوو!

مـــام حەمـــەد قـــادر// گـــوێم لەخرچـــە خرچـــی
ئێسقانەکانی ئەبوو!
مـــام حەمـــەد قـــادر// گـــوێم لەخرچـــە خرچـــی
ئێسقانەکانی ئەبوو!

یەعقوب لەگەڵ بیرکردنەوە لەم ووشانەی مام حەمەد قادر، دەنگەکانی مام حەمەد قادرو زەینەکانی خۆی تێکەڵاوی سیرەی قاچی گورگەکان ئەبوو کاتـێ بەچـوادەوری ژوورەکـەدا ئەسـوڕانەوەو بەفرەکـەیان گێرەدەکـر، دەموچـاوی یـەعقوب یـەك بەسکرینی خوێندنـەوەی ئێـوەی خوێنـەر هاتۆتـە پێشەوەو لەگەڵ قسەکانی مام حەمەد قادر-دا واقی وڕماوە!.

مام حەمەد قادر// (بەدەم فرمێسك سرینەوە) کەللەی
سـەری لـەوێ کـەوتبوو! گورگـە برسـیەکە شـانو
ملیشـی خـوارد! ئـیتر خـوێنو گۆشـت تێکـەڵاوی
خۆڵەکە بوو!

هـیچ عـەیب نیـە یـەعقوب لـەو ژوورە تەنهایـەدا رەنگـی مـردووی لێنیشـتبوو وەبـۆ لـەبیرکردنی تـرسو دڵـەڕاوکێی خـۆی کـەمێك پشـتی راسـت کـردەوە، زیـاتر نوسـاندی بەدیوارەکـە، زیـاتر خـۆی خسـتە نێـو سووچـەکە، بـەهۆی بریـنداری ئـازاری زۆری قاچـەکانی لێڕاکێشـا، بێدەنگیـەکی سەرسـام کەوتۆتـە سـەر دەموچـاوی ئـەو گەنجـە بریـندارە، هەربـەو حەپەسـاویەوە جارێکیتر زەینـەکانی خزانـدەوە نێـو دوکانەکـەی مامـە پیرەی بێکـەسو بـێ ژنو منـاڵ. لـەنێو دوکانەکـەدا لەگـەڵ هاورێکـانی دەمیـان داچـەقاندبوو وهەستیان بۆ گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی مامەی دوکاندار شل کردبوو، ئێسـتا هـەموویان پەلەیانـە بـزانن چارەنوسـی مـام حەمـەد قـادری بێکـەس بەچیدەگات؟! ئەزانن مام حەمەد قادر تەنهایەو هیچ خوشكو برای نیە بەڵام

نازانن چۆن‌و چۆن؟! یەعقوب-یش لەویَ لەنیَو گەنجەکان کەمیَك زەینی لای قسەکانی مام حەمد قادرەو تۆزیَکیش بیر لەمریەم ئەکاتەوە، چاوەڕوانی تەواو بوونی قسەکانی مامەی دوکاندار دەکات، چاوەڕوانی نزیك بوونەوەی نیوەی شەو دەکات تابگات بەو مراویە خرکەڵە عەیارو مەکربازە چاوڕەشە.

مام حەمەد قادر// دوای خواردنی برا بچووکەکەم!....گورگەکە پەلاماری برا گەورەکەمی دا!....(دەستیکرد بەگریان) سەرو ملی ئەویشی داکرماند....زۆر لەمن نزیك بوو....بینیم چۆن سەری لیَکردەوە!....تاسەرسنگی بۆی چووە خواریَو دووبارە سەروملی خۆشی لەخویَن هەڵکیَشا.

* * *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهیَلیَکی باریکتر، دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕیَنمەوە بۆ سەر هیَلی گشتی........

دوای خواردنی هەردوو براکەی مام حەمەد قادر ئەو گورگە برسیە تیَر بوو، خەمی خواردنی نەما، هەرچەند سەیری مام بریام-ی دەرکردو لیَیدەهاتە پیَشەوە ئەو پیاوە خەریك بوو گیانی دەرئەچوو! چاوەکانی ئەنوقاندو ئەیکردەوە! لەدڵی خۆیدا هاواری بۆ خوا ئەکرد، زۆر بەقورس‌و خەستی ئەگریا! کاتیش نیوەڕۆ بوو ئەوشویَنەش زۆر گەرم بوو، گورگەکە وردە وردە ئەهاتە پیَشەوە بۆی! ئەو گورگە دوای تیَرخواردن خەمی گەرمای بوو، بۆیە لەتاو تینی هەتاوەکەو لەبەردەمی مام حەمەد قادر چاڵیَکی هەڵکۆڵی تاگەیشتە نیَو خۆڵە شیَدارەکە، بەم چەشنە سیَبەریَکی فیَنکی دروستکرد،

دواتر لێی پاڵکەوت و ترسێکی زۆریشی خستەدڵی مام حەمەد قادر کەئەوکاتە گەنجێکی قۆز بوو.

ئەو پیاوە لەبەرچاوی خۆی دوو برای گورگ خواردوو بوون، خۆشی دەستی گیراوەو هیچی پێناکرێ، لەترسی گورگەکەش زیپەی مەرگی کردبوو! هەرچەند تووکی سەرپشتی گورگەکە ئەچوو بەدەم وچاویدا خەریك بوو گیانی دەرئەچوو! هەربەوترس و دڵەڕاوکێیە سەیری ئەو گیانلەبەرە دڕەندەیەی دەکرد! گورگەکەش زمانی بستێ دەرهێناوەو خۆی نوقمی خۆڵە فێنکەکەی بەرسنگی مام حەمەد قادر کردووە، مامەش نەیئەزانی چی بکات؟! ماوەیەك بەم شێوەیە مانەوە! زۆریش لەوە ئەترسا تاوێکی تر گورگەکە سەرلەنوێ برسی بێتەوەو سەروملی ئەویش قووت بدات.

گورگەکە پشتی کردۆتە ئەو پیاوەو بەهیچ شێوەیەك لێی ناترسێ، زمانیشی دەرهێناوە لیك بەملاولای دەمیدا دێتە خوارێ، سەیری بەردەمی دوورو نزیکی خۆی ئەکات، من وەك نووسەرێك ناتوانم بچمە ناخی ئەو گورگە کەبەدەم سەیرکردن و پشتکردنە مام حەمەد قادر بیر لەچی ئەکاتەوەو چی لەدڵدایە؟! رەنگە بیر لەبرسیەتی دوای ئێستای بکاتەوە! وەك ئەوە وایە ئێستا تێری خواردبێت و برای سێیەمی هەڵگرتبێ بۆ کاتێکی تر! بەڵام لەوەزیاتر ناتوانم هەستەکانی ئەو ئاژەڵە دەربخەم و وەك پسپۆرێکی دەروونناسی ئاژەڵان لێی تێبگەم.

ئەو پیاوە داماوە مایەی بەزەیی پیاهاتنەوە بوو....جارجارە چەناگەی ئەکەوتە سەرپشتی ئەو گیانلەبەرە دڕندەیە! نەیئەزانی چی بکات! نەیئەتوانی هیچ بڵێ! لەدڵی خۆیدا زۆر هاواری بۆ خوداکرد کەیارمەتی بدات....زۆر دوعای کرد کەدوای مردنی ئەو دووبرایەی خۆی بمێنێتەوە، وردە وردە کاتیش بەکێشیان دەکات بۆ دوای نیوەڕۆ واتا ساتەکانی دووبارە برسی

بوونەوەی ئەو گورگە نزیك ئەبێتەوە! بۆیە برای سێیەمی داماو بەپشتیوانی خودا بیری لەوەكردەوە هەوڵبدات دەستەكانی دەربهێنێت هەرچەندە دوای هەڵكۆڵین لەلایەن گورگەكەوە هێشتا تاكو سەرووی ئانیشكی لەناو خۆڵەكە نوقم بووبوو، وردە وردە شانی بۆ شلكردو لەسەرەخۆ سانتیم دوای سانتیم زۆر بەهێمنانە دەستەكانی لەخۆڵ هەڵكێشا بەبێ ئەوەی گورگەكە بەهۆی تێربوون و پڕبوون و مڕبوونی لەگۆشتخواردن هەستی پێبكات.

گەر بمانتوانیایە بەكامێرایەك وێنە گوزارشتیە ترسناكەكەی سەر دەموچاوی مام حەمەد قادر لەكاتی دەست راكێشان لەنێو خۆڵەكەدا وێنەبگرین!....بێگوومان ئەچووە نێو وێنە سەرسوڕهێنەرەكانی جیهان! چونكە هیچ كاراكتەرێك ناتوانی ئەوترس و دڵەڕاوكێیە بەرجەستە بكات و بیگەیەنێتە زەینی بینەرانی سینەما! ئەم بەسەرهاتە تەنها بەگێڕانەوە سانایە بەڵام بەكردار جگە لەمام حەمەد قادر هیچ مرۆڤێك بەرگەی ترسێكی مەرگ ئامێزی ئاوا ناگرێ، هیچ كەسێك بەرگەی ترسی كارەساتێكی ئاوا ناگرێ كە بكوژی دڕندە لەبەر لووتی دانیشێ و چاوەڕوانیشی بكات بۆئەوەی كەمێكی‌تر بیخوات.

بەدڵنیاییەوە ئەڵێم گەر مام حەمەد قادر لەكاتی ئازادكردنی دەستەكانیدا بۆ یەك چركە دوابكەوتایە! ئەو ئاژەڵە دڕندەیەش فریای یەك ئاوڕدانەوە بكەوتایە! ئەوا بەیەك قەپگرتن لەقورگی مامەی دەستگیراو هەموو شتێكی لەژیانی ئەسڕیەوە و رووداوەكانی كارەكتەرێكی دوكاندار لەنێو گوندەكەی ماڵی یەعقوب لەم دەقە ئەدەبیەی بورهان جۆلا دروست نەدەبوو، لەوانەیە بەسەربردنی كاتە زیادەكانی یەعقوب-یش تارۆیشتنی بەرەو ژوان بۆلای مریەم لەشوێنێكی تربوایەو بەشێوازێكی‌تر كاتی ئەو دیمەنەم وێنا بكردایە، لەم حاڵەتەدا كەسێتی مام بریام لەنێو دوكانەكەی خۆیدا بەرجەستە

نەدەكرا، نەك لەسەر هێلی گشتی ڕووداوەكانی ئەم تێكستە خاوەنی جوڵەی كارا نەدەبوو بەڵكو بەسەر ڕووداوی لقەجوڵەكانیشدا نەدەڕۆیشت چونكە ئەكەوتە دەرەوەی سنووری پەیوەندیە بابەتیەكان، ڕەنگبوو خێزانێكیتر ڕۆڵی دوكانداری ئەم گوندەیان ببینیایە یان ئەم دەقە ئەدەبیە پێویستی بەكەسێتی دوكاندار نەبوایەو لەجیاتی ئەو كاراكتەرێكیتر ڕۆڵی كەسێتیە مام ناودێیەكەی ئەم پیاوە پیرەی بەرجەستە بكردایە بۆ تێربوون و ڕوونكردنەوەی وردە هێلەكانی ڕەهەندی ئەم كەسێتیە بۆ كاراكردنی هێلی گشتی واتا هێلكاری دیزاینی گێڕانەوەو داڕشتن شێوازێكیتری ئەبوو.

مام حەمەد قادر دوو سێ چركە هەناسەكانیشی ڕاگرت! بەتەواوی دەستەكانی دەرهێناو پەلاماری ملی ئەو گورگە دڕندەیەی دا!! دا!! دا!! دا!! دا!!....هەرئەوەندە قوڕگی گرت!!!! ئیتر لورەو مڕەمڕی ئەو گیاندارە بەرز بووەوە! دەنگێكی زۆر ترسناك بوو! ئەو پیاوە هەژارەش لەترسا نەیئەوێرا بەریبدات! هێنان و بردن و بەرزو نزم بوونەوەی هەردووكیان بەردەوام بوو! سات لەدوای سات خۆڵەكەی چواردەوری لەشی مام حەمەد قادر شلتر ئەبووەوەو زیاتر هەستی بەئازاد كردنی لەشی خۆی دەكرد. گورگە گیراوەكە لەتاو قوڕگ گرتن و هەناسەبڕكێی ئەوەندە هەڵكوتو داكوتی كرد....بەتەواوی مام حەمەد قادری لەخۆڵەكە دەرهێنا....

* * *

گورگە مردارەوەبووەكەی لەوێ بەجێهێشت و بەگریان و باوكەڕۆوە وردە وردە هاتە نزیك تەرمی براكانی، تەرمی چی؟! دوو چاڵی پڕ لەخوێن و گۆشت ئەبینران، دووسەری نیوەخوراویش لەولاوە كەوتبوو، سەیری چاڵەكە بكەین قوڕاوێكی سوورەو كەمێكیش پارچە گۆشتی تیایە، ئەو برا نەگبەتە داماوە لەسەر ماندوێتی خۆی دەستەو ئەژنۆ بەدیار ئەو دوو چاڵە

خوێناویەو ئەو دوو سەرە لەت بوو دانیشتووەو قوڕ ئەپێوێ، هەندێجاریش هەڵئەسێتەوە بەگریانەوە هەڵئەپەڕێ‌و ئەمسەرو ئەوسەری ئەکات.

مام حەمەد قادر// هەیڕۆ....هەیڕۆ....بۆ خۆم ڕۆ،

بێبرا خۆم، بێکەس خۆم.

*   *   *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

گەنجەکان بێ‌ورتە گوێیان بۆ گرتووە، دەرگای دوکانەکەش کراوەتەوە کەمێك هەوای سارد هاتۆتە ژوورێ، یەعقوبیش وەکو ئەوانی‌تر حەپەساوەو باوەشی کردووە بەهەردوو لاشانی خۆی‌و سەرمای دوکانەکەی پێ‌ئەڕەوانێتەوە، دواتر یەکێك لەگەنجەکان هەڵساو دەرگاکەی داخست، یەعقوبیش سەیری ڕۆیشتن‌و گەڕانەوەی ئەو گەنجەی دەکر تالەشوێنی خۆی دانیشتەوە، خۆشی بەهەمان گرژی نێو سەرمای دوکانەکەی مام حەمەد قادر جارێکی‌تریش گەڕایەوە نێو ئەو ژوورەی بەگورگ دەورەدراوە! ئەو ژوورەی تیایا چاوەڕێی مەرگ دەکات.

یەعقوب-ی برینداز بەمشەوە لەنێو ئەو ژوورە تەنهایە بەهەمان شێوەی نێو دوکانەکەی مام حەمەد قادر دانیشتووە....لەناو ئەو ڕەزە ساردو پڕ بەفرە باوەشی کردووە بەهەردوو لاشانی خۆی‌و بیر لەهەموو شتێك دەکاتەوە، ترسی گورگەکانی دەرەوەش خەریکە دڵی ئەوەستێنن! ترسی تەنهایش ئەوەندەی‌تر بێهێزی کردووە! هەردوو براگورگ خواردووەکانی مام حەمەد قادری بیرکەوتۆتەوە، هەردوو براگورگ خواردووەکانی خۆی بیرکەوتۆتەوە، سەرماکەش هەموو گیانی سڕکردووە، برینەکانی وردە وردە

سارد ئەبێتەوە، هەندێ لەبرینەکانی زۆر کاریگەرن‌و قووڵیان پێوە دیارە، بەڵام بەهۆی سەرماکە سڕبوون‌و خوێنیان وەستاوەتەوە.

یەعقوب لەوە ئەترسێ بەدەردی براکانی مام حەمەد قادر بچێت! لەوە ئەترسێ بەدەردی ئەیوب‌و کامەرانی برای بچێت! لەوە ئەترسێ بەبێ ئەوەی مریەم ببینێ گورگ بیخوات! لەوە ئەترسێ جارێکی‌تر مریەم نەبینێتەوە! لەوە ئەترسێ دوای خۆی دایك‌و باوکە پیرەکەی بەرگەی کارەساتی وا نەگرن بمرن‌و بەیانی خوشکی بەتەنها بمێنێتەوە! یەعقوب بەمشەوە بەبرینداری بیر لەزۆر شت دەکاتەوە، خۆشی سەری لەو هەموو بیرکردنەوەیە دەرناچێ، نازانێ چی بکات‌و نەکات؟! ئەی چۆن لەدەست ئەو گورگانە رزگاری ببێت؟! چۆن خۆی بگەیەنێتە گوندەکەی ماڵی مریەم؟! ماڵی دولبەرە چاورەشەکەی، ئەی چۆن خەمەکانی ئەو کچە نازدارە برەوێنێتەوەو خۆی پێبگەیەنێ تادڵی پڕبکات لەخەندەو پێکەنین، خۆ نزیکەی ساڵێکە مریەم-یش چاوەڕێی ئەمشەو دەکات، لەپاییزی ئەمساڵدا لەلای بەیان قسەی بۆ یەعقوب بەجێهێشتبوو کە هەر ئەمساڵ لەیەکەم شەوی زستاندا واتا لەشەوی ٢١لەسەر ٢٢ی مانگی ١٩٩٤/١٢دا سەرلەنوێ وەکو زستانەژوانەکەی تر لەبەردەمی دوکانەکەی باوکی یەکتر ببینن.

*　　*　　*

## هێلی گشتی بەردەوامە........

بەمشەوە ساردە کات پێش بەرەبەیانە....مریەم لەنێو دەرگای ژوورەکەی خۆی وەستاوە، دەستەکانی لەیەکتر ئاڵاندووە، تریێی خوشکیی باوەشی پیاکردووە، جارجارەش سەر هەڵئەبڕێ بۆ ژوورەکانی‌تر نەوەکو دایك‌و باوکیان وەئاگابن، پەستی مریەمی داگیر کردووەو حەپەساوی

نەگەیشتنی یەعقوب-یش بەسەر دەمووچاویدا ئەچۆڕێتەوە، چەند دەنکە فرمێسکێکیش لەسەر ڕوومەتەکانی قەتیسماوون لەبەر سەرمای شەوەکە ناتوانن ڕوومەتە نیمچە گەرمەکەی ئەو دولبەرە دڵ ناسکە بەجێبهێڵن، قاچەکانیشی سڕ بووبوون، چاوەڕوانکردنی یەعقوب-یش لەقسەکردنی بڕیبووەوە، هەستەکانی ناجێگیرو کەلوپەلی حەوشەکەی بەتەڵخی ئەبینی، حەوشەکەیان یەك پارچە بەفر بوو، تریێ بەقاچەکانی بەفری بەردەمی ژوورەکەی لا ئەبردوو بەردەوامیش ئەیڕوانیە مریەم، لەودیو دیوارە نزمەکەیان کۆڵانیش پڕبوو لەبەفر، دوکانەکەشیان لەپێشەوەی ماڵەکەیانە، دەرگای دواوەی دوکانەکە کەوتۆتە ناو حەوشەکەیانو بەرامبەر دەرگای ژوورە گڵەکەی مریەمو تریێیە، خوشکە مراوی لەبەردەمی ژوورەکەی خۆی وەستاوە بەهۆی سەرماو هەوا ساردەکە سڕ بووبوو وهەستی بەلەشی خۆی نەدەکرد، ئەگەر تریێی خوشکیو لایەکی دەرگاکە نەبوایە ئەکەوتو نەیئەتوانی بەپێوە بووەستێ چونکە بەهۆی دواکەوتنی دڵدارەکەیو زۆری چاوەڕوانی هێزی تیا نەمابوو.

* * *

## یەعقوب لەسەر هێلی گشتی بەردەوامەو

## لەناو ژووره ساردەکە چاوەڕێی چارەنوسە نادیارەکەی دەکات........

بەفر لەبارین کەوتووە....دوای کەمێکی‌تر نۆرەی با ساردەکەیەو مێشكو دڵی مرۆڤ ئەکات بەسەهۆڵ، یەعقوبیش لەژوورە تەنهاکەی نێو ڕەزەکە لەئەندێشەیەکی قووڵ نوقم بووە، ڕۆیشتووە بۆ دێکەی ماڵی مریەمو بەچواردەوری دێ ئەسوڕێتەوە حەزی دەکرد کۆڵانەکان بڕێو زوو بگاتە دوکانەکەی مام خدر، زوو بگات بەمریەم، زوو تامی ماچەکانی بکات، لەناکاو

دەنگ و دەستی گورگێکی تر لەکونە گەورەکەوە یەعقوب-ی بەرزکردەوەو سەرلەنوێ خستیەوە نێو ژوورەکە، وارایچڵەکاند مەرگی پێنیشاندا! واترساندی یەك دوو چرکە بێهۆش بوو! وابەرزیکردەوە کەکەوتەوە سەر ئەرزەکە ئازار بەسمتی گەیشت و دووبارە برینەکانی کولانەوە.

یەعقوب زۆر تورە بوو وێڕای برینداریەکەی هێزی دایە بەرخۆی و بەبێ دواکەوتن پشدێنەکەی ئالاندە دەستە برینداراەکەی و هەڵسایە سەرپێ، لەشوێنی شووشە عەترە شکاوەکەی ترێ وەستاو دووبارە توند توند چنگی ئەم گورگەشی گرت! گورگەکانی تریش دەستیانکرد بەلوورە لوورو مرەمڕ، زۆر بەتوورەییەوە هەرچی دەماری دەستی گورگەکە هەبوو بەخەنجەر بڕی! چەند چرکەیەك بەردەوامبوو لە هەڵدڕین و چەند چرکەیەکیش لەبنمیچەکەوە خوێن فیچقەی دەکرد بۆ ژوورەوە، بەهۆی کەمیی دەنگی گورگەکان یەعقوب بۆی دەرکەوت ژمارەیان کەم بووەتەوە، ئەویش بەهۆی یەکترخواردنیان لەدوای کوشتنی گورگی یەکەم و بڵاو بوونەوەی خوێن لەوناوەدا.

لەکاتی هەڵدڕیندا خرچەی خەنجەرەکە لەسەر ئیسقانی دەستی گورگەکە یاری دەکرد!

یەعقوب-یش بەدەم ترس و ئازارەوە لەگەڵ بیستنی ئەم خرچەخرچە، ووشەی خرچەی سەرزمانی مام حەمەد قادر بەبیریدا دێتەوە! چەند جارێك دەموچاوی مام حەمەد قادر-ی دێتەوە بەرچاو بەبێدەنگ دەم ولێو ئەجوڵێنێ:-

مام حەمەد قادر// گوێم لەخرچە خرچی
ئێسقانەکانی ئەبوو!
مام حەمەد قادر// گوێم لەخرچە خرچی
ئێسقانەکانی ئەبوو!

مـــام حەمـــەد قـــادر// گـــوێم لەخرچـــە خرچـــی ئێسقانەکانی ئەبوو!

یەعقوب بەردەوام بوو لەهەڵدڕینی دەستی گورگەکە! دواتر هەستی کرد ئەو دڕندەیە هێزی دەستی نەماوەو هەر بەوخوێنەوە بەشلی بۆ نێو ژوورەکە شۆڕبۆتەوە! جوڵەشی تیانەما! هەستی کرد گورگەکە هێزو گوڕوتینی بەرەنگاری نیە بۆیە بەئەسپایی دەستی بەردا.

یەعقوب لەو سەرسامیەدا زۆر بێهێز بووبوو، هاتە دواوە دیقەتی لەدەستی گورگەکە ئەدا بەوخوێنەوە لەبنمیچەکە هاتۆتە ژووری ئەوەندەی‌تر بێتاقەت بوو چونکە ئەو خەزی دەکرد بەهیچ شێوەیەك گورگەکان نەبینیو هەرچی زووترە لەبەرچاوی وون بن.

کەمێك وەستاو هەستی بەبۆنی شوشە عەترەکە کرد، ئەویش بەهۆی دووبارە جووڵاندنی قوڕە بۆنگرتووەکەی شوێنی شووشە عەترەکەوە بوو، دواتر سەیری ژێر قاچی خۆی کردو ڕوانیە شووشە شکاوەکەو چەند ساتێکیش سەری هەڵبڕی بۆ بنمیچەکەو دەستە هەڵدڕاوەکەی گورگەکە، خوێنی لێئەهاتە خواری! کەمێکیش کەوتەوە جووڵە! وەکو یەکێك لەسەرەوە ئەو دەستە بێگیانە بجووڵێنێ وابوو!

ئەوەندەی نەبرد گورگەهارو برسیەکە بەدەستەکەی‌تری خەریکی هەڵکۆڵینی سەربانەکەبوو، لەنزیك دەستە بێهێزەکەی کونێکی بچووکی لەوەپێشتری گەورە کردوو دەستەکەی تری لێهێنایە ژووری! بەونیازەی کونێکی‌تر دروست بکاتو لێی بێتە ژوورەوەو لاوەی عاشق بخوات! چونکە گورگ بۆ پەلاماردانو فێڵی پەلاماردان زیرەکەو ئەقڵ بەکارئەهێنێ! یەعقوبیش دووبارە پەلاماری دەستو چنگە تیژەکەی‌تری‌داو دووبارەش دەستیکرد بەهەڵدڕینی! هەرزوو ئەویشی خستە بێهێزیو جووڵەی تیا

ئەهێشـت، یـەعقوب کەلـەژوورەوە دەسـتی ئەوگورگـەی گرتبـوو لەپەنجـەرە بچووکەکانەوە بینی چەند دانەیەکیان لـەخوارەوە خۆیان هەڵدایە سەربانەکەو پەلاماریاندا! ئەویش بەهۆی دووبارە بڵاوبوونـەوەی بۆنیخوێن بوو، یـەعقوب کەدرکی بەجوڵاندنی لاشەی گورگەکە کرد بەئەسپایی دەستی بەرداو ورد ورد چـووە دواوە، لەبنمیچـەکەوە گورگەکـە هـەردوو دەسـتی شـۆڕ بووبـووەوە خوێنیان لێئەچۆڕایەوە، دواتـر وەك یـەکێك لەسـەرەوە رایبکێشـێ ئاوا هـەردوو دەستی هەڵکێشرا بۆ سەرەوە، ئەوەنـدەی نـەبرد ئـەمجارەش ئەم گورگـە کەوتـە خوارەوە، ئەویش دووبارە گوێی بۆ تەپەی کەوتنەکەی گرت، ئەمەشیان وەکو ئەوەی پێشوو بووە خواردنی هاوڕێ گورگەکانیتری.

کەلەپەنجەرەکـەوە سـەیری کـرد چـەند دانەیـەکیان بەربوونەتـە خواردنیو چەند دانەیەکیش پەلاماری یەکتر ئەدەن، ئەویش لەژوورەوە دیسان هەندێکیتر کەلو پـەلی ژوورەکـەی خستە پـاڵ دەرگاکـە نـەوەکو لەهەڵمـەتێکی گورگـە هـارو برسیەکان بکرێتـەوەو بـۆی بێنـە ژوورەوە! دوای ئـەوە دووبـارە خۆی خزاندە سووچەکەو لەهەردوو کونە گەورەکـەی بنمیچەکەوە هەستەکانی ئەخستە دەرەوە بۆ زانینی دوا هەواڵی گورگەکانو خواردنی یەکتریان.

ئـەو دەنـگو مڕەمـڕە نـاخۆشو ترسـناکەی بـەو شـەوە سـاردە بـەهۆی یەکتر خواردنیـان لەگورگەکانـەوە ئەبیسـترا بەتـەنها دڵـی ئـەو کوڕە عاشـقە بـوو بەرگـەی ئـەگرت! بەتـەنها جورئـەتی ئـەو لاوە برینـدارە بـوو بەرگـەی ئـەگرت! تەنها ئەویشە بەتەنها خەنجەرێك بۆڕی ئەو ئاژەڵە دڕندانـە ئەداتـەوەو ناهێڵێـت پێی بگەن! ئەو گەنجە لادێییە هەموو هـەوڵێك ئەدات لـەپێناوی مانـەوە چونکە بەتـەنها مـوڵکی خـۆی نیـە بـەڵکو بەشـی زۆری هـی مـریم—ـەو ئەیـەوێ ئـەو ئەمانەتەی نێو دڵی مریەم بپارێزێ.

* * *

## هێلی گشتی بەردەوامە.........

### کات

### دوای نیوە شەو ە

### سەرەتای زستانی سالی ١٩٩٤ـە

### لەدیکەی مالی مریەم-دا

مریەمو تریەی خوشکی لەبەردەمی دەرگای ژوورەکەیان نەماوونو چوونەتە ژووری، لەسەر جێگاکەیان دەستیان کردۆتە ملی یەکترو هەناسەکانیان تێکەلاوی یەکتر کردووە، چاوەکانیان لەدووری بستێ بڕیوەتە یەکترو بەبیری یەکتردا چوونەتە خواری، خۆ ئەگەر تریێ نەبوایە مریەم هەر زوو ئەروخواو بەرگەی ئەو هەموو ئازاری چاوەڕوانیەی نەدەگرت، هەرچەند تریێ منالە بەلام جۆرێك لەعەیاری مریەم-ی تیایەو جارجار دەست ئەهێنێ بەسەرو قژی مریەمدا تازیاتر نوقمی ئەندێشەی خۆشەویستی یەعقوب نەبێ و بەلکو بچێتە نێو خەوو تابەیانی لەئازار چەشتن رزگاری بێت، کەرۆژیش بووەوە هەرچۆنێ بێت هەوالو هۆی نەگەیشتنەکەی ئەبیستن.

تریێ// مریەم گیان بەقوربانی دلت بم، دەتوخوا بخەوە، بەرگەی ئەم هەموو ئازارە ناگریت.

مریەم// (هەر بێدەنگە، جارجار بەملاولای شانی تریێدا ئەکەوێ و بەردەوام لەباوەشی تریێ دایە).

مریەم-ی دلّ ناسکیش بەهۆی دواکەوتنی دلدارەکەی ئەوەندەیتر دلی ناسك بۆتەوەو بەیەکجاری لەقسە چۆتەوە، بەچاو ئەڕوانێتە تریێ، دواتر لەسەر لایچەپ پالّ ئەکەوێ بەلام تریێی ژێکەلە دەستی ڕاستی خستۆتە ژێر سەری خوشکە گەورەکەی و بەدەستی چەپی دەستە ڕاستەکەی مریەمی گرتووەو ئالاندوویەتی لەملی خۆیو توند توند بۆی ئەگوشێ.

تـریٚ// مریـەم گیـان بەسـە ئـیتر...بـۆ وا لـەخۆت ئەکەی؟!

مریـەم// (لـەژێر لێـوەوە زۆر بـەبیٚ هێـزی چـرکەیەکی لێوەهات) چی؟

تریٚ تێگەیشت کەمریەم هۆشی لای خۆی نەماوەو چۆتە نێو قوولایی دەریـٚای چاوەڕوانی، زۆریش سەرسام بوو بۆ وێڵ بوونی خوشکە گەورەکەی! لەبەر خۆیەوە ورتە ورت ئەکات، لەوە ئەترسیٚ مریـەم شتێکی لێبێت! شتێکی ناخۆشـی بەسـەربێت! کـاتیش زۆر درەنگـە نەیئەویسـت دایكو بـاوکی لەخـەو هەڵسێنیٚو ئاگاداریان بکات! بەڵکو ئەیویست هەرچۆنیٚ بێت تابەیانی خـەوی لێبکـەویٚ. تـریٚ زۆر بەئاسـایی ئەیڕوانیـە ئـەو چـاوەڕوانیو نـەهاتنو نەگەیشتنەی یـەعقوب، چـونکە زۆر ئاسـاییە مـرۆڤ لەهەرکارێکیـدا دوابکـەویٚ، بـەڵام خـەمی خوشـکە گەورەکـەی بـوو وزۆریـش لێـی ئەترسا کەبـەم شـێوەیە وسەرسـام بـووە! بۆیـە بـەردەوام هـەوڵی ئـەدا خوشـکەکەی بخـەوێنیٚ تاپشوویەکی چاك وەربگرێتو خۆشی لەو ترسو دڵەڕاوکیٚیە رزگاری بێت.

*　　*　　*

بەم ترسـەو بەمشـێوەیە لەژوورەکـەی مریـەم-دا هـەروەها لەژوورەکـەی یـەعقوب لـەنێو ڕەزەکـە وردە وردە کـات بـۆ بەرەبـەیان دەڕوات، مریـەم لەدڵەڕاوکیٚی نەگەیشتنی یـەعقوب-دایە، لـەخواردنی مـەراقو خەفـەتی دووری دڵدارەکەیدایـە، بـەدەم دیقکردنـەوە لـەنێو دەریـای خەیاڵدایـەو نەرمـە مەلـەی مەرگ دەکات، تریٚی خوشکە بچوکیشی خـەوی لێتـۆراوە، پاسـەوانی خوشـکە گەورەکەی دەکات، لەباوەشـگرتنی ئـەو خوشـکەی پێسـپێردراوە، هـەردووکیان بەیەکـەوە بـەم شـەوە درەنگـە بەحەپەسـاوی لـەو ژوورە نیمچـە تاریکـەو لەسـەر جێگاکەی خۆیان دانیشتوون، بەڵام هەریەك بەجۆرێك خەریکی ئێشك گرتنە.

یەعقوب-یش لەنێو ڕەزە ساردو پڕ بەفرەکە لەترسی گورگەکانی چواردەوری خەوی لێناکەوێ و ئەمشەو لەنێو ئەم ژوورە ساردەدا پاسەوانی گیانی خۆی پێ سپێردراوە.

هەرلە (شیعرە تابلۆ)ی ئەم ژوارنە گورگەدا:-

مەرگبازی نێوان حەسرەتی چاوەڕوانی دولبەرێك و قەتیسماوی نێو ئاواتی گەیشتنی دڵدارێك لەم جووتە تابلۆیەدا دەرئەکەوێ کە:-

جووتە تابلۆی هێمن و کەس نەدیو، تەواوکەری یەکترو ڕەنگ پەڕیو، جووتە تابلۆی کچە عەیارو لاوێکی بریندار، جووتە تابلۆی سڕبووی لەشی دوو دڵدار، جووتە تابلۆی ئەمدیو ئەودیوی شاخێکی کوردستان، بەموراد نەگەیشتنیان تیا هەڵکەندراوە.

## لەم شیعرە تابلۆیەدا

## کەدووەم تابلۆی ژوانە گورگە

گوندە خنجیلەی سپی داپۆشراو، هەر لەبێدەنگی و بەفر هەڵکێشراو.

چەند خانوێکی جوان ئاوەدانکراو، ئاسمانێکی ڕەش بەسەرپۆش کراو.

تاکە دولبەرێك لەخەم داچۆڕاو، ئێشك گری ژوان ڕەنگ زەرد هەڵگەڕاو.

دەرەوژوور دەکات خەو لەچاوتۆراو، ناگات بەموراد هەرخۆی ڕەنج خوراو.

## لەم شیعرە تابلۆیەشدا

## کەسێیەم تابلۆی ژوانە گورگە

ئەرزێکی سپی بەشەو بەفرانبار، پەڵە تێکەوتووی خوێنی گورگی هار.

ڕەزو کانیاو و چەندین بنەدار، پڕ بەپڕی خۆی ئاسمانێکی تار.

لەناوەڕاستدا ژوورێکە لەوێ، عاشقی زامار تیایا ناخەوێ.

دەورە دراوە بەگورگە شەوێ، زۆر هارو دڕن قڕیان تێکەوێ.

## هێلی گشتی بەردەوامە.........

### کات

### ئەوەندەی نەماوە سپێدە پاڵ بەشەو بنێ و

### بەروخسارێکی سپی زیوی بێتە دەرەوە

### سەرەتای زستانی ١٩٩٤ـە

کات پێش بەرەبەیانە، شەوگار خەریکە هەگبەی تاریکی خۆی لەکۆڵ ئـەنێ و ئـەوناوە بـەجێ ئـەهێڵێ، نێـو ڕەزەکـە زۆر سـاردە، کـزە بایـەکی کەللەتـەزێنیش لەسەر بەفرەکە یاری ئەکات و گیـزەی دێت، توێـژاڵی سەوەی بەفرەکە بەستوویەتی، دارو درەختـەکانیش لـەتاو سـەرما ڕەقیـان بردۆتـەوەو بـەبێ دەنـگ لەیـەکتر ئـەڕوانن، زۆربـەی درەختـەکان بـەردارن و لـەم زسـتانەدا سەوزاییان پێوە نەماوە بەڵام سەرتاپا لقەکانیان یەك بەدرێژایی خۆیـان بـەفر داپۆشیون، هەندێ درەختی بەرزو هەمیشە سەوزی بێ‌بەر لەگەڵ بەفرەکـەدا بـەدوو ڕەنگـی سپی و سـەوزێکی تـاریکی نێـو فـەزا نیمـەچ تاریکەکـە تێکـەڵاو بـوون، ئـەو تاکـە ژوورەش لـەوێ لەبـەرف هەڵکێشـراوەو تـەنها هەناسـەکانی یەعقوب تیایدا هاتووچۆ دەکات. ئەم عاشقە بریـنداره لـەدوێنی شـەو تائێسـتا هـەر بێـدارە، لـەدەرەوەش تـەنها ناڵـەی گورگـە بریـندارەکان دێـت، یـەعقوب لەژوورەوە بەپێوە وەستاوەو لەپەنجەرەکانەوە دەڕوانێتە دەرەوەو گەلەگورگێك ئەبینێ وال و پاڵ کەوتوون و بەفری ئەوناوەیان بەخوێن سوور کردووە.

ئەگـــەر لەســـەرووی ژوورەکـــەوە ســـەیری خـــوارەوە بکـــەی ئـەبینی....چـوارده‌وری ژوورەکـە بازنەیـەکی سـووری خواروخێچـی بـۆ کێشـراوە....چـەندین پەڵـە خـوێنی جیاجیـاش لـەدووری ژوورەکـە ئـەبینرێت کەبـەهۆی ڕاکـەڕاکی گورگـەکان و پـەلاماردانی یـەکتریان بـڵاو بۆتـەوە، دواتـر دابەزە خوارەوە لەدەرەوە سەیری پەنجەرە بچووکەکەی تەنیشت دەرگاکە بکە

دەموچاوی عاشقە بریندارەکەی ژوورەوە ئەبینی چۆن بەحەپەساوی سەیری دەرەوە ئەکات و جوولەی قاچی چەند دانەیەکیان ئەبینی وەك لەسەرەمەرگا بن وایە بەلام هیچیان بەپێوە نەماون لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕ ناکات هیچ گورگێکی زیندووی لێنەمابێ! چونکە ترس و دڵەڕاوکێی دوێنی شەو هەروا بەئاسانی ناڕەوێتەوە.

دوای تاوێك تێڕامانی بۆ ئەو گورگانە یەعقوب-ی عاشق دووبارە ئەگەڕێتەوە بۆ سووچی ژوورەکەو دائەنیشێ، کەمێك بێدەنگی لەئامێز دەگرێ، چاوەکانی دائەخات و کەمێکیش خۆی لەئازار ئەشارێتەوە بەرەو ئارامی دەڕوات، زەینەکانیشی بەچواردەوری خۆیدا بلاودەکاتەوە. ئەم گەنجە بەبێدەنگی دانیشتووە، وردە وردە هەست بە بۆنی عەترە شکاوەکە دەکات، هەرلەشوێنی خۆیەوە چاوەکانی دەکاتەوەو ئەڕوانێتە شوێنی شووشە شکاوەکە، هەڵئەستێ بەرەو ئەوێ دەڕوات، لەبەردەمی شووشە شکاوەکە بەچیچکانەوە دائەنیشێ، عەترە ڕژاوەکەش کەمێك گلەکەی کردووە بەقوڕ، تۆزێکیش لەگەڵ خوێنی گورگەکان تێکەلاو بووە، خەنجەرەکە بەدەستی چەپ ئەگرێ و لەسەرەخۆ قوڕەکە هەڵئەگرێ ئەیخاتە ناولەپی ڕاستی و دووبارە ئەگەڕێتەوە سووچەکەی خۆی و دائەنیشێ. دواتر شەرواڵەکەی هەڵئەکات، سەیری برینەکانی دەکات، قوڕەکە هەڵئەسوێ لەقاچی چەپی کەزۆر بریندارە! لەتاو ئازار سەربەرز دەکاتەوەو ئەڕوانێتە کونەکانی بنمیچەکە، کەمێك هاوارو ئاخونۆفی لێبەرزدەبێتەوە! گورگە بریندارەکانی دەرەوە لەگەڵ دەنگی یەعقوب دەست دەکەن بەلوورەو هاوت وهاوار! ئەو گەنجە بریندارەش لەترسی ئەوردەعبایانەی دەرەوە پشتی دەستی ئەخاتە سەر دەمی و کەمێك بێدەنگ ئەبێت، دوای تاوێك بیدەنگی، دوای تاوێك تێڕامان لەقاچە بریندارەکەی سەیری برینەکانی دەستی چەپیشی دەکات، دوای هەڵکێشانی چەند

هەناسەیەك و چاو نوقاندن تۆزێك لەوقوڕەی کەلەناو لەپی ماوە ئەیخاتە سەر برینەکانی دەستی چەپی کەبەهۆی چنگ و نینۆکەکانی هەردوو گورگەکەی سەربان بریندار بووە، برینەکانی دەستیشی زۆر ئەکزێتەوە بەڵام دان بەخۆیدا ئەگرێ و ناوێرێ دەنگ بەرزکاتەوە.

یەعقوب ئەم کارە بۆ ئەوە ئەکات تاکو برینەکانی لەمیکرۆب بپارێزێ، وەکو نەریتی ئەو شوێنانەی لەشار دوورن و دەستی پزیشك نایانگاتێ برینەکانی لەشیان لەجیاتی پاککەرەوەی نێو نەخۆشخانەکان بەعەتر پاك دەکەنەوە یان خۆڵی پیائەکەن. دوای تاوێك دان بەخۆدا گرتن چیتر لەتوانای نامێنێ، بەهۆی ئازاری زۆرەوە دووبارە هاواری لێبەرزدەبێتەوە! گورگە بریندارە کەوتووەکانیش لەدەرەوە دیسان دەیکەن بەهات و هاوار! ئەو لاوە عاشقەش جارێکیتر ئەچێتەوە ژێر باری بێدەنگی.

یەعقوب لەو سووچە بەبێ دەنگ دانیشتووە، سەیری برینەکانی قاچی چەپی و دەستی چەپی دەکات، دوای ماوەیەك واقووڕمان لەبەردەمی خۆی بەخەنجەرەکەی دەستی ئەرزی ژوورەکە هەڵئەکۆڵێ تالەژێرەوە خۆڵی پاکی دەست بکەوێ و بیخاتە سەربرینەکانی بۆئەوەی ئازارەکانی کەم بکاتەوە و دەمی برینەکانیش داپۆشێ، هۆش و زەینیشی لای گورگەکانە ئەگەر بچنە سەربانەکە یان بەنینۆکەکانیان خەریکی ڕنینەوەی سەربان و دەرگاکە بن.

یەعقوب تابەرەبەیان خەریکی برینەکانی ئەبێت....

لەو ژوورە کپ و بێدەنگەدا، لەو ژوورە ساردو بەئاستەم رووناکەدا، لەو ژوورە ترسناك و مەرگ ئامێزەدا عاشقی بریندار بەدەم دەستکاری برینەکانیەوە جارجارە خەیاڵەکانی باڵ ئەگرێ بۆ لای مریەم و سەرهەڵئەبڕێ سەیری بەردەمی خۆی دەکات هەروەکو لەسکرینێکی سینەماییدا خۆی و مریەم ببینێ کەچۆن ئاوێزانی یەکتر دەبن، یان پاڵەوانی فیلمەکە خۆی و مریەم

بێت و هەرخۆشی لەنێو ئەو ژووره بەگورگ دەورەدراوەدا بەتەنها دابنیشێ و سەیری ووتوویژیان بکات، واقی ورماوەو چاوەکانی زەق ئەڕواننە بەردەمی و لەدڵی خۆیدا لەگەڵ خودی خۆی قسە دەکات:-

یەعقوب// مریەم گیان بیرت ئەکەم....ئەترسم

ئەمجارە نەگەمە لات و بەحەسەرەتەوە سەربنێمەوە!

مریم گیان ئازارم زۆرە.

ئەگەر ئێوەی خوێنەر لەکونێکی ئەو ژووره سەیری یەعقوب-تان بکردایە ئەتانبینی دوای تەواوبوونی ئەم حیوارە بەهەناسەیەکی قووڵەوە جارێکیتر سەردائەخاتەوە نێو کۆشی و لەنێو گۆمی ورێنەدا نوقم ئەبێ، تاماوەیەکی کورت بێدەنگ ئەبێت، بێ جووڵە ئەبێت، ئەتوانی چاوی کامێرای زەینەکانی خۆت چەند جارێك بەنێو بێدەنگی ژوورەکەدا بهێنی وببەی و دواتر کلۆزێکی راستەوخۆ بخەیتە سەردەم وچاوی ئەو گەنجە عاشق و بریندارو کاڵفامە.

کەسەری بۆ برینەکانی دانەواندۆتە خوارێ وەك یەکێك بەزۆر سەری بەرز بکاتەوە وایە، لەپڕ سەیری داروديواری ژوورەکە ئەکات، هەست بەتەنیاییەکی بێوێنە دەکات، ووری پێوەدیارە، جارێکیتر ئەندێشەکانی پەلکێشی دەکەن بۆ ماڵی مریەم، هەلوەسەی ترس و نزیك بوونەوەی مەرگ دەرگای خەیاڵەکانە هەست و نەستیشی بۆ والآکردووە، ئەم گەنجە سەرکێشە هەربەم شێوەیە بۆساتێکی کورت بێدەنگ ئەبێت و خەیاڵەکانی هەڵئەفرێ بەناو بەفرو سەرمای رەزەکەدا ئەڕوات، بەبەرزایی شاخەکە هەڵئەگەڕێ، دواتر دائەبەزێت بۆ گوندەکەی ماڵی دولبەرە چاورەشەکەی، دواتر ئەگاتە نێو حەوشەکەی ماڵی ئەو کیژەو لەوێشەوە رووەو دەرگای ژوورەکەیان دەڕوات،

خۆی لـەدەرەوە دەرگاکـە دەکاتـەوە، سـەیردەکات هێشـتا نەخـەوتوون! تـریێ لەناوجێگەکەوە دەستی کردۆتە ملی مریەم ئاوڕی بۆ ئەداتەوە:-

تـریێ// (بەپەرۆشـەوە سـەیری یـەعقوب ئـەکاتو سەرسوڕمانی درەنگ گەیشتنی پێوەدیارە)!!

مریـەم// (چـاوەکانی کردۆتـەوە بەحەپەسـاویەوە سەیری یەعقوب دەکاتو لەشوێنی خۆی ناجوڵێ).

یەعقوب// (لەناو دەرگاکە وەستاوە لەسەرەخۆ قسە ئەکات) مریەم!

مریـــەم// (هەرلـــەنێو جێگاکـــەی زۆر بێهێـــزی چـــاوەڕوانیە) یـــەعقوب گیـــان زۆر چـــاوەڕێم کردی....منیش بیرت ئەکەم....منیش ئازارم زۆرە.

لەژووره تەنهاکەی نێو ڕەزەکەدا کزانەوەی برینـەکانی لەشـی یـەعقوب بەهۆی خـۆڵ پیاکردن لـەو جـۆرە خەیاڵانـەی دەرئـەهێنیو ئەیگەڕێنێتـەوە لای گورگـە برینـدارەکان! ئەیگەڕێنێتـەوە بـۆ نێـو ژووری تـرسو دڵـە لـەرزێ، بەدەسـتەکانی خـەریکی برینەکانیـەتی بـەڵام لەبەرخۆیـەوە چـەند ورتـەورتێك ئەکاتو زۆر لەسەرەخۆ دەنگی لێوەدێت:-

یـــەعقوب// (لەســـەرەخۆ لەگـــەڵ خۆیـــدا ئـــەدوێ) ئەزانم........ئەزانم مریـەم گیـان........بەخوا ئـەزانم تۆش ئازارت زۆرە.

یـەعقوب بەمشـێوەیە خـەریکی برینـەکانی خۆیـەتیو خەیاڵەکانیشـی جێگیر نین هەرلەخۆیانـەوە بـەرەو شـوێنی دیـارو نادیـار بـاڵ ئـەگرنو ئـەفڕن، هـەرئاواش چـەند سـاتێکە سـنورە رەشو تاریکەکـەی شـەوی بەجێهێشـتووە، ئێستا لەکۆتایی تاڵە ڕەصاصیەکەی سپێدە دایەو وردە وردە خەریکە ئەچێتە

نێو پانتاییە زیویەکەی ئەم بەیانیەی نێو رەز، بەمشێوەیە لەژوورەوە بەردەوام دانیشتووەو چاوەڕوانی چارەنووسێکی نادیاری بەیانی دەکات.

*          *          *

## هێلی گشتی بەردەوامە........

## کات

## سپێدەیەکی رووناکە لەناو رەز

## دووەم رۆژی زستانی ١٩٩٤ـە

سپێدەی نێو ڕەزەکە وردە وردە رووناك ئەبێتەوە، فەرشێکی زیوی داخراوو تاکە ژوورێکیش لەناوەڕاستدا بەگورگە برینداراو مردووەکان دەورە دراوە، ئەڵقاوئەڵقی ژوورەکەش بەخوێنی ئەو گیاندارە دڕندانە سوور بووە، کزەبا ساردەکەش بەنێو هەردوو پەنجەرەکە بەتەوژم خۆیان ئەکەن بەژوورەکەداو ئەوەندە ساردن لەش و هەستی عاشقی برینداریان سڕکردووە، کەمێکیش گڤەی باساردەکە لەکونەکانی بنمیچی ژوورەکە پەیدا بوون، ئەو کونانەی دوێنێ شەو گورگە هارو برسیەکان تێیانکردبوو بۆ خواردنی لاوە عاشقەکە، هەرلەوێ چەند وژە وژو ڤیکەیەکی سەیرو شێوە موزیکێکی ناڕێکی لێ ئەبیسترێت و لەگەڵ خۆشیاندا کەمێك بەفری سەربانەکە ئەهێننە ژوورێ، یەعقوب-یش بەدانیشتنانەوە لەسەرما خۆی لوولکردووەو لەسوچێکی ئەو ژوورەدا ئەلەرزێ، خۆی کرژکردۆتەوە دەستەکانی ئاڵاندۆتە هەردوو قاچی و چەناگەشی خستۆتە سەر ئەژنۆی، تاوتاوە چاو هەڵئەبڕێ بەنۆرە سەیری هەردوو پەنجەرەکەی لاتەنیشتی ژوورەکەو کونەکانی بنمیچەکە ئەکات.

وردە وردە سەرپۆشە زیوینەکەی ئەم سپێدەیە شەفافترو تەنکتر ئەبێت، رەنگە خۆڵە مێشیەکەی نێوان تارمایی درەختەکان رەوینەتەوە، گەر

لەنێو ئەو رەزە بوەستیت و سەیر بکەی لەخوارەوە بنەدارەکان لەسنوری ئەرزە بەبەفر داپۆشراوەکە جیا ئەکرێتەوە، چڵە سەرپۆش بەفرینەکانی سەرەوەی دارەکانیش بەتەواوی دیارن و کەوتوونەتە نێو بۆشایی ئاسمانە زیویە چڵکنەکە، ئاووهەواش کەمێك تورەیە، چەند هەورێکی بۆرو بەڵەکی پێوەیەو دەموچاویان داوە بەیەکدا، ئەگەری بارانێکی بەهێز یان دووبارە بەفربارینی لێ بەدی ئەکرێ.

بابەم شێوەیە بچینە سەر تەپۆلکە شاخەکەی نێوان گوندەکەی ماڵی مریەم و تاکە خانووەکەی نێو رەزەکە کەیەعقوب تیایدا دانیشتووەو چاوەڕوانی بەیانیەکی نادیارو ترسناك دەکات، لەوێ چاوەڕوان بین تاکو ئەم بەیانیە بەتەواوی روناك دەبێتەوە.

گورگە مردوو بریندارو پەککەوتووەکانی دەوری ژووری رەزەوانەکانیش بەهەمان شێوە بەجێیان بهێڵین بەڵکو ئەوەندەی پێنەچێ ئەوانەی بەبرینداری ماون رق ببنەوەو گیانیان دەرچێ، بۆ ئەوەی کاکەی عاشق و بریندار ترسی هیچی نەمێنێ.

* * *

## هێلی گشتی بەردەوامە........

## کات

## بەیانیە لەسەر تەپۆلکە شاخەکە

## دووەم رۆژی زستانی ١٩٩٤ـە

گەر لەو بەرزاییەی سەرەوەی تەپۆلکە شاخەکان سەیری گوندەکەی ماڵی مریەم بکەی ئەبینی بەیانیەو هەرچی خانووی دێکەی ماڵی مریەم هەیە بەبەفر داپۆشراون، بێدەنگیەکی تەنکیش بووەتە سەرپۆشی کۆڵانەکان، بەفر

حەوشـــە قورینەکـــەی مـــاڵی دولبـــەری داپۆشـــیوەو بـــەردەرگای ژووری نوستنەکەشیان بستێ بەفری لێ بەرزبۆتەوە، لەژوورەوەو لەودیو دەرگاکەوە ترێ لەباوەشی مریەم چۆتە قووڵایی خەو وخۆی گرمۆڵە کردووە، کەمێك لەقژە رەشەکەشی بەسەر سەرینەکەیدا بڵاو بۆتەوە، لەچکەکەشی بەسەریەوە نەماوەو لەگەڵ قژو پێخەفەکەیدا ئاڵۆزکاون، مریەمیش چاوەکانی نووقاون بەڵام هەموو جەستەی بووە بەهەستو رەوانەی نێو حەوشەکەی کردوون لەوێ لەچاوەڕوانی یەعقوب- دا خەمی دووری ئەنۆشن.

گەر ئاوڕێکیش بۆ خوارەوە بۆلای دەستە ڕاست بدەینەوە ئەبینین بەیانیەو ناو رەز بەتەواوی رووناك بووەتەوە، ئەگەر دابەزین بۆ خوارەوەو بچینە ژوورەوە ئەبینین یەعقوب ئارامی لێبڕاوە، جارێکیتریش جامانەی سەر قاچە زۆر بریندارەکەی توندکردو تێی ئاڵاندەوە بۆئەوەی لەکاتی رۆیشتندا خوێنی لێنەیەتو لەسەرماش بیپارێزێت، بەدەم پێچانەوەی برینەکانی کەمێك هەستی راگرت بۆ دەرەوەی ژوورەکە دواتر هەرچۆنێ بێت بەو شێوە شەلیەوە هەستایە سەرپێ بۆ ئەوەی سۆراخێکی گورگە بریندارەکانی دەرەوەی دەست بکەوێ کەئەمشەو بوونە رێگر بۆ بینینی مریەم.

ئێستا بەپێوە وەستاوەو جامانەکەشی لەقاچی چەپی پێچاوە، کەمێکیش جلە کوردیەکانی هەڵکێشایەوەو خۆی توندوتۆڵ کرد، بەرەو پەنجەرە بچووکەکان رۆیشت هەرچەند هەستی راگرت گوێی لەدەنگی هیچ شتێك نەدەبوو! لەپەنجەرەکانەوە چاوەکانی ئەخستە ئەودیو ژوورەکە لەهەردوولا گورگی مردووی لەتوپەتکراوی لێکەوتبوو، ئەودەوروبەرەشیان بەخوێن سوور کردبوو، چەند دانەیەکی لێبوو لەتوپەت نەکرابوون شێوەیان لەساغ ئەچوو بەڵام جووڵەشیان تیا نەمابوو چ بەهۆی رەقبوونەوەیان لەبەرسەرماکە چ بەهۆی زۆر برینداریانەوە گیانیان لێبڕابوو، بەڵام قاچی یەك

دوانێکـی بینــی بەئاسـتەم ئەجوولایــەوە کەنیشـانەی گیـان دەرچـوون بـوو! ئـەویش دوای سـەیرکردنیان و وەرگرتنــی ئـەو کەمـە هەواڵـەیان جـارێکی‌تر گەڕایـەوە بۆ قـووڵایی ژوورەکـە بـۆ زیـاتر بیرکردنـەوەو پـلان دانـان بـۆ چـوونە دەرەوە.

*　　*　　*

## هێلی گشتی بەردەوامە........

### کات

### سەرلەبەیانی دووەم ڕۆژی زستانی ١٩٩٤ـە

### یەعقوب ئەیەوێ ناو ڕمز بەجێبهێڵێ

ئـەو گەنجـە برینـدارە تاوێکـە لـەژوورەوە هاتووچـۆی ئـەم پەنجـەرەو ئەوپەنجـەرە ئـەکات، جارجارەش جلـەکانی ڕێك ئەخاتـەوەو شـپرزەی چـوونە دەرەوەیە! ترس هـەموو گیـانی گرتۆتـەوە! بڕیـاری چـوونە دەرەوەی داوە بـەڵام قاچـــەکانی لـــەترس چـــەقیوون و هـــەنگاوەکانی تـــەنها لـــەنێو ژوورەکـــەدا دابەشـکردووە، سـەیرێکی‌تری پەنجــەرەکانی‌کرد، بەهــەمان شـێوەی پێشـوو گورگەکان کەوتبوون و قاچی ئەو چەند دانەیەش هەر لەجووڵەدابوو. ئـەویش دوای خۆڕێکخســـتن خەنجەرەکـــەی ئامـــادەکردو تونـــد گرتـــی، وردە وردە کەل‌وپەلـــەکانی پشـــت دەرگاکـــەی لادا، لەگـــەڵ لادانـــی هەرپارچـــەیەك لەکەل‌وپەلـەکان جارێـك سـەیری ئـەودیو پەنجـەرەکانی ئـەکرد بـۆ دڵنیـابوونی گیـانی خـۆی‌و دەگەڕایـەوە بـۆ پشـتی دەرگاکـە، تاماوەیـەك سـەرقاڵ بـوورو هاتووچۆی ئەکرد لەنێوان لابردنی شتومەکەکانی پشت دەرگاو سـەیرکردنی هەردوو پەنجەرەکە تابەتەواوی پشتی دەرگاکەی چۆڵ کرد، بەدەسـتی راسـتی توند خەنجەرەکەی گرتووە، بەئەسپایی بەدەستی چەپی دەرگاکەی ترازاند!

هەواساردەکە هەندێ لەبەفری بەردەرگاکەی کرد بەدەموچاوو باڵایدا، یەکسەر گڤەی هەوا ساردەکەش بەسەر لەشیدا خۆیکرد بەژووراو ئەویش بۆ ساتێکی کەم لەنێو دەرگاکە هەڵوەستەیەکی‌کرد.

ورده ورده خەریکی هێنانە دەرەوەی سەرو ملو دەموچاوی بوو بۆ هەواڵێکی ئەو ئاژەڵە دڕندانە، گورگەکانیش هیچ دەنگو سەنگێکیان نەبوو! کەبەتەواوی هاتە نێو دەرگاکە ئاوڕی دایەوە بۆ لای ڕاستی! لەپەنا دیواری ژوورەکــە چــەندین گــورگی بەڵــەکی برینــداری بــەدیکرد کەلــەژوورەوە نــەیبینیبوونو کەوتبوونــە ژێــر پەنجەرەکــە، هــەر هەمووشــیان لــەخوێن گەوزابوون! چاویان نووقابوو، بەفری ئەوناوەشیان بەخوێن سوورکردبوو.

دووبــارە تــرس ئــەو گەنجــە برینــدارەی داگرتــەوە، بــەڵام دوای تێڕوانینێکی چڕوپڕ تێگەیشت کەهیچیان زیندوو نین ئینجا کەمێك ترسی ڕەویــەوە، نــەختێك هاتــەوە ســەرخۆی، تۆزێــك ئــارام بــوو، بڕێکــی کــەمیش هەناســەی ئاســوودەی هەڵکێشــا بــەڵام چ جــۆرە خۆشــیەك؟! لــەدوێنێ شــەو تائێستا مەرگی بەچاوی خۆی بینیو لەلێواری مردن گەڕابووەوە.

لــەپڕ بــەهۆی جووڵــەی چــەند چــیلکەیەکی دەم بــا کەلەخانووەکــە هاتبوونــە خــوارێو بەئاســتەمو لەســەرلا ئــەم ســێبەرو تارمــایی جووڵەیــەی بەدیکرد بۆیە لەگەڵ موزیکێکی زۆر ترسناکدا زۆر ترسا! ئاوڕی دایەوە بۆ لای چــاوی چــەپیو ترســێکی زۆر دایگــرتو زۆریــش ڕاچــڵەکی، خەنجەرەکــەی بەرزکردەوە بەڵام لەو پووشو چەواڵانە زیاتر هیچی نەبینی، دووبارە ئاوڕی دایــەوە بــۆ دەســتە ڕاســتی. دواتــر زۆر درێــژەی بەوەســتانو ســەیرکردنو چاوەڕوانیو بیرکردنەوە نەدا بۆیە هەر بەپەلە، هەر بەبرینداری، هەر بەشەلە شەل ڕایکرد لەژوورەکە دوور کەوتەوە، لەبەر پەلەکردن بۆ ڕزگارکردنی خۆی تائەژنۆی کەوتە نێو حەوزی ڕەزەکە کەرووکەشی ئاوەکە بەبەفر داپۆشرابوو

ونەیبینی، زۆر بەخێرایی خۆی دەربازکردو چەندین هەنگاو چووە قووڵایی ڕەزەکە، بەلام هەستی بەسەرمایەکی زۆری قاچەکانی دەکرد، بەنێو درەختەکانیشدا لەراکردن رووەو بەرزاییەکەی دوێنێ شەو بەردەوام بوو. بەهۆی ترس و دڵەراوکێ و سەرماکەی دوێنێ شەو ناوسکی بەتاڵ بۆتەوە، تەڕبوونی قاچەکانی ئەم بەیانیەشی هاتە سەر، زۆریش برسیەتی بەڵام زۆر گرنگی پێنەدات چونکە فەرمانێکی زۆر گرنگی لەئەستۆدایە ئەویش رزگارکردنی گیانی خۆیەتی کەموڵکی مریەم-ی چاورەشە.

بەردەوامە لەرۆیشتنی خێراو بەنێو دارە چڕو لەیەك نزیکەکاندا جارێك بەلای راست و ساتێکیش بەلای چەپ رائەکاو خۆی لەقووڵایی ڕەزەکە وون ئەکات، دەموچاوی لەپێکەنین و خەندە هەڵکێشراوە چونکە خۆشی رزگار بوون و بینینەوەی سەرلەنوێی مریەم هەموو لەشی خستبووە پێکەنین، بەدەم ئەم راکردنە خۆشەوە لەناکاو لەپشتیەوە هەستی بەخشپەی شتێك کرد! هەربەدەم ئەم تیژ ڕۆیشتنەوە کەمێك بەچاو زەینەکانی ئاراستەی دواوە کرد بەلام زۆر گوێی پێنەداو بەردەوام بوو لەسەرکەوتن رووەو ئەو هەورازەی ئەیبات بۆ سەر تەپۆلکەکانی دوێنی شەو.

عاشقی بریندار بەردەوامە لەراکردن، بەردەوامە لەخۆرزگارکردن، بەردەوامیشە لەشەلە شەلی قاچی چەپی، سات لەدوای ساتیش هەردوو قاچی بەهۆی تەڕبوونی نێو کانیەکەوە زیاتر سەرمایان ئەبێت، دوای تاوێك رۆیشتن بەو خێرایەوە بەرەو بەرزایی خشپەی دواوە هەربەردەوامە! کەمێك ترس چووە دڵی! کەئاوڕی دایەوە گورگە بۆرێکی بریندار بینی بەبێهێزی دوایکەوتووە! ئەو بارە پڕ لەئۆخەی بۆ دەرچوون هەڵیگرتبوو لەچرساتێکدا لێی کەوتوو جارێکتریش گەڕایەوە قووڵایی سەرسامی و دووبارە خەم و پەژارەی نەگەیشتن بەمریەم دایگرتەوە! دەمووچاوە ساردو ئاوساوەکەی لەتوڕەبوون هەڵکێشاو

تەوژمی دایەبەرخۆی بەنێو دارە چڕەکانی ڕەزەکەدا خێراتر رایکرد، لەنێوان درەختەکاندا لەگەڵ گورگەکەدا چاوشارکێیەکی مەرگ ئامێزیان دەکرد! ئەگەر گورگەکە زۆر بیرندارو بێهێز نەبوایە ئەوا کارلەکار ئەترازاو ئەم عاشقە بریندارەی دەکرد بەخۆراکی ئەم بەیانیە.

یەعقوب بەنێو دارو درەختەکاندا لەدەست گورگەکە رایدەکرد! لەگەڵ هەموو هەنگاوێکدا کامەرانی برای ئەهاتەوە بیر کەچۆن گورگ پەلاماریداو گیانی لەبەر بڕی! ئەهاتەوە بەرچاوی کەچۆن بۆ هەواڵی یوسف-ی برای چووبوون‌و برایەکی‌تریان تیاچوو! بۆیە بیری لەوە دەکردەوە لەرێگەی ژوانی مریەم خۆیشی تیا بچێت! گورگەکە بەدوایەوە هەنگاوی بێ‌هێزی هەڵئەبڕی‌و ئەویش بەدەم راکردنەوە بەم شێوەیە بیر ئەکاتەوە کە:-

لەهاوینی ئەمساڵ کە ١٩٩٤ـە کامەرانی برای بەبەرچاوی خۆی‌و باوکی گورگ خواردی! یەعقوب لەسەرمای نێو ڕەزەکەدا کەتاقوولە پێی لەبەفردابووو تائەژنۆشی تەڕبووبوو بەیەك چاو سەیری گورگی زستانی حاجی ئۆمەران‌و گورگی هاوینی کفری دەکرد، دوای تاوێك ڕاکردن هەستی بەهەناسەبڕکێی خۆی کرد، شوێنەکەشی سەرەوهەوراز بوو بۆیە زیاتر درکی بەماندووبوون کرد، راکردنەکەی ئەم بەیانیەی وەکو دوێنێ شەو سەربەرەوخوار نەبوو، ئەمجارە بەپێچەوانەوە سەرئەکەوێ‌و زووتر ماندووبوونی پێوەدیارە، بەهەرحاڵ ئەیویست زوو بگات بەتەپۆڵکەکانی سەرەوە، ئەوشوێنەی دوێنێ شەو گورگەکان تووشی بوون‌و دایانگرتە خوارێ، دوای کەمێکی‌تر لەو راکردنە هەڵوەستەیەکی بچووکی کردو ئاوڕی دایەوە ، چاوی تێبڕی بوو....دیقەتیکرد گورگەکە بەهۆی زۆر برینداریەوە نەیئەتوانی بەتەوژم بۆی سەربکەوێ، ئەویش زۆر ترسی لێی نەبوو بەڵام هەرچۆنێ بێت ئەمە ئاژەڵێکی دڕندەیەو ئەبێ خۆی لێدوورو دەرباز بکات.

بەم بەیانیە سازدە لەگەڵ ئەو گورگە بەرامبەر بەیەکتر وەستابوون، ئەو ئاژەڵە دڕندەیە بۆی نەدەچووە پێشێ، ئەویش بۆی نەدەگەڕایەوە، بەڵام لەو بەرزاییەوە وەستابوو وتێیدەڕوانی، هەر لەناو چاوی ئەم گورگە برینداروو برسیە خەیاڵەکانی کلۆز ئینێکی کردوو گەڕایەوە بۆ ناوچەی گەرمیان:-

*   *   *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر،

## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

لەشەوێکی هاوینی ئەمساڵدا لەدەشتەکەی شاری کفری هەرسێکیان خۆیو کامەرانو مام عەلی باوکیان بەربوونەتە گورگەکە بەڵام دەرەقەتی قەپە تیژەکەی نەدەهاتن، ئەوەتا بەم بەیانیە لەوبەرزاییەی ڕەزەکان وەستاوە بەڵام بەسەرهاتەکەی خۆیو باوکو براکەی هاتۆتەوە بەرچاو.

گورگەکە هەرسێکیانی بریندارکرد! هەزار ئەفسووس برینەکانی کامەران زۆر گەورەو قووڵ بوون! خۆیو باوکی بەدیاریەوە دانیشتبوونو بۆی ئەگریان، لەگەڵ دەنگی گریانی خۆیو باوکی ڕاچڵەکیو لەم هەلوەستەیەدا کەمێك هاتەوە سەرخۆی، بینی گورگەکە زیاتر لێی نزیك بووەتەوە! دواتر یەعقوب زیاتر هاتەوە سەرخۆیو دووبارە دەستیکردەوە بەراکردن، دوای ڕاکە ڕاکێکی زۆر ئەوەندەی پێنەچوو یەعقوب بەدەستو چنگەکانی بەبەرزاییەکە هەڵگەڕاو بەیەکجاری ناو ڕەزەکەی بەجێهێشت.

*   *   *

## هێلی گشتی بەردەوامە........

## یەعقوب

## گەیشتەوە سەر تە پۆلکە شاخەکەی دوێنێ شەو

بــەم بەیانیــە کــە دووەم ڕۆژی زســتانی ســاڵی ١٩٩٤ـــە یــەعقوب لەدەرەوەی ڕەزەکە بەسەر تەپۆڵکە شاخەکەدا ڕووەو گوندەکەی ماڵی مریەم وەستاوە، ئەو تەپۆلکەیەی دوێنێ شەو لێی وەستابوو وگورگەکان ڕێگایان پێگۆڕی بەرەو ڕەز، ئەو تەپۆلکەیەی لەنێوان گوندەکەی خۆیان و گونەکەی ماڵی مریەم دایە، ئەو تەپۆلکەیەی خەریك بوو دوێنێ شەو مەرگ تیایە بیبەزێنێ، بەبێ دەنگ لەسەری وەستاوەو ناشتوانێ جاریکیتر بگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی خۆیان چونکە نزیکترین شوێن بۆ سارێژکردنی برینەکانیی گوندەکەی ماڵی مریەمە، لەوبەرزاییەوە بەبێ هێزی وەستاوەو سەیری ماڵەکانی ناودێ دەکات کەسەربانەکانیان سپی ئەنوێنێ، لەهەندێکیان دووکەڵی سۆبا گەرمەکانیان ڕووە ئاسمان هەڵکشاوون و بەسەر گوندەکە بڵاو بوونەتەوە.

بەیانیەکی زۆر ساردە یەعقوب لەسەر ئەو تەپۆلکەیە وەستاوەو سەرو ملو دەستی تەنانەت قاچەکانیشی لەسەرما ڕەقیان بردۆتەوە، چەند جارێك دانەوایەوەو دەستی هێنا بەقاچە سڕبووەکانی، بەردەمیشی نشێوێکی زۆر سەختە، کۆتاییەکەشی تەختاییەو گوندەکەی ماڵی مریەمی لەسەر بنیاتنراوە، لەدەستە ڕاستیدا ڕەزە چڕوپڕەکانە، لەلای چەپیشی پاشماوەی کۆنە ڕەبیەکی سەربازی زەمانی حکومەتی بەعسی لێیە چەند تۆپەڵە سیمێکی دڕکاویش ڕووەو گوندەکە ڕۆچوونەتە خوارێ! یەعقوب ئەزانێ نێو ئەو سیمە هەرهەمووی مین ڕێژکراوە! بۆیە ناوێرێ بچێتە ناوی تاخۆی لەگورگە

بریندارەکـە بشـارێتەوە، سـاڵیش ١٩٩٤ـەو هێشـتا کوردسـتان لـەمین پـاك نەکراوەتەوە.

دوای ساتێکی کەمو تێڕامان لەچواردەوری خۆی نەیدەزانی چ جۆرە بڕیارێك بدات، لەناکاو ئاوڕی دایەوە بۆ تەنیشتی ڕاستی، ئەیبینی ڕەزێکی چڕەو گورگـە بریندارەکـەش نەرمـە نەرمـە بەوبەرزاییـە هەڵئەگـەڕێو خـۆی بەکێش ئەکات تاپێی بگاتەوە! هەواکەشی زۆر ساردەو لەتوانای نیە بەرگەی ئـەو شـوێنە سـاردو پڕبـەفرە بگـرێ، هەروەسـتاوە بیرکردنـەوەکانی جـارێکیتریش پێچیان کـردەوە بـەلای گوندەکـەی مـاڵی مـراوی خـان، ڕووەو قیبلەی دڵەکەی، ڕووەو ئاواتەکەی، بەو دەمولێوە ووشك بووەوە لەبەرخۆیـەوە ورتە ورتی بوو وئەیووت:-

یەعقوب// مریەم گیان ئاخۆ ئێستا چی ئەکەی؟! خۆ ئـەزانم وەئاگـای....ئەشـزانم زۆر خەفـەت ئەخۆی....زۆریش بیرم ئەکەی.

بەم شێوەیە لەو بەرزاییەوە وەستاوەو لەگەڵ خەیاڵەکانی مریەم-دا ئەژی، قاچی چەپیشی بەهۆی برینداری بەجامانەکە پێچاوەو تەڕیش بووە، سەروملیشی رووتە، بەهۆی هەوا ساردەکەوە کەمێك خۆی گرمۆڵە کردووە، جارێك ئاوڕ بۆ گورگە بریندارەکە ئەداتەوەو جاریکیش سەیری دووکەڵی سۆبا گەرمەکانی نێو گوندەکەی ماڵی مریەم دەکات، بەم شێوەیە چەند گرتەو دیمەنێکی نێوان هەردوو جۆری ڕوانینی یەعقوب دووبارەو سێبارە بووەوە، گورگەکەش وردە وردە لێی نزیك ئەبێتەوە، لەهەموو هەنگاوێکی گورگەکەدا دیارە کەجۆرێك لەترس و دڵەڕاوکێی لەزەیندایە، لەگەڵ ئەوەش ئەم ئاژەڵە هەرچەندە ڕۆیشتنەکەی لەسەرەخۆیە بەڵام بەردەوامە لەهاتنە پێشەوە.

* * *

## هێلی گشتی بەردەوامە........

## کات

## هەمان بەیانیی دووەم ڕۆژی زستانی ١٩٩٤ـە

## لەدێکەی ماڵی مریەم

مریەم لەژێر پێڵووەکانیدا چاوە وەئاگاکانی ئەجووڵێ و بەدڵ ئاگای لەژوورەوەو دەرەوەشە، گوێشی هەڵخستووە بۆ پرخە نەرمەکانی تریێ، ئەو پرخەیەی دوور لەهەموو ئازارێکی دڵداری، دوور لەهەموو ئازارێکی چاوەڕوانی، پرخەی کچە هەڵوژەیەکی کاڵی پێنەگەیشتوو، پرخەی تریێی چوادەساڵ، ژوورەکەشیان خەریکە بەم بەیانیە کەمێك رووناك ئەبێتەوە، درزەکانی نێو دەرگاکە زۆر روون بوونەتەوەو زۆر بەچاکی سپیایی بەفرەکەی دەرەوە بەڕوونی ئەبینرێ.

لەم ژوورەی ئەم دوو خوشکەدا چەند نایلۆنێکی رەنگاورەنگ بەدیوارەکاندا هەڵواسراوە بۆئەوەی خۆڵ و قورەکانیان بشارێتەوە، چەند جلێکی کیژانەی جوانی رەنگاورەنگ بەسەر نایلۆنەکانەوە هەڵواسراون و بەقوماشێکی تەنك داپۆشراون، ئاوێنەیەکی بچکۆلەش لەدیوارەکە گیرکراوەو بەردەمیشی لەسەر تەختەیەك چەند داوودەرمانێکی جوانکاریِ ئەو کچە لادێیەی لەسەر ریزکراوە، ئەو شووشە عەترەی یەعقوب بەدیاری بۆی ناردبوو تەنها یەکجار لەبەر دڵی ئەو بەکاری هێنابوو وبەپڕی لەوێ دانرابوو، بالای شووشە عەترە رەنگ ئاویەکە لەکەل وپەلەکانی‌تر بەرزتر بوو، قەپاغێکی زەردی لەسەربوو عەترەکەی ناویشی زەردێکی کاڵ بوو، بۆیە وەکو بووکێکی تارا ئاڵتوونی کراس زەردی بەرئاوێنەکە وابوو.

مریەم بەئاستەم چاوەکانی کردەوە، بەهۆی کەم رووناکی لەژوورەوە سپێدەیەکی خۆڵەمێشی ئەبینی، هەموو ژوورەکەش لەبەرچاوی لێڵ بوو،

لەناوجێگەکەوە سەیرێکی بەرئاوێنەکەی کرد، شووشە عەترە جوانەکەی هاتەوە بەرچاوو یاد، ئەو کچە گوندیە زۆر دڵی بەو شووشە عەترە خۆش بوو، هێندەی ترێی خوشکیی خۆش دەوێ، دڵیشی نایەت زۆر بەکاری بهێنێ.

* * *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر، دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

جارێکیان ئەوەندەی نەمابوو دڵی ترێ بڕەنجێنێ، مریەم هاتەوە بیری لەوژوورەی خۆیان لەزستانی پێشوو بەیەکەوە وەستابوون، تازەش عەترەکەی لەلایەن یەعقوب-ەوە پێگەیشتبوو، بەدەست هەردووکیانەوە بوو سەیریان دەکردو لەوەپێش شتی واجوانیان نەدیبوو! لەنێوان هەردووکیاندا کەبەقسەکردن خەریك بوون ئەوەندەی نەمابوو بکەوێتەخوارەوەو بشکێ! مریەمیش ئەوەندەی نەمابوو لەترێ تووڕەبێ بەڵام هەرئەوەندەی پێووت:-

مریەم// تری گیان هی شێتەیە ئاگات لێی بێ.

ترێ-ش لەچاوەکانی مریەم توڕەبوونەکەی خوێندەوە، ئەیزانی شوشە عەترەکەی زۆر خۆش ئەوێ بۆیە بەبێ ئەوەی هیچ بکات، هەربەبێ دەنگی دایەنایەوە شوێنەکەی خۆی تادڵی ئەوخوشکە گەورەیەی نەیەشێ چونکە زۆری خۆش دەوێ.

هەرلەناو جێگەکەوە زیاتر چاوەکانی کردەوە، هاتەوە یادی......

دوا شەوژوانی زستانی پێشوو لەبەردەم دوکانەکەی باوکیدا بەیەکەوە وەستابوون و ترێ-ش لەولاوە چاوەڕێی دەکردن، دوای گووشینی دەست و پەنجەکانی مریەم، دوای شکاندنی تامەزرۆی ماچەکانیان، یەعقوب لەباخەڵیدا ئەم شووشە عەترەی دەرهێنا.

یەعقوب// (بەپێکەنینەوە) مریەم گیان تا ساڵێکیتر ناتبینمەوە.

بەپەنجەکانی کەمێکی کرد بەلوتی مریەمدا، دواتر یەك دوو فیچقەی ئاراستەی سنگو مەمکەکانی کرد....ئەوناوە پڕ بوو لەبۆن، ئەو کچە بەنازەش بەهۆی شەرمو تەریق بوونەوەیو پێچانەوەی ژوانەکانیان تا ساڵێکیتر زۆر لێی تورە نەبوو بۆیە بەسووکی کێشای بەرووومەتی ئەو کوڕە عاشقو شێتە، ئەویش بەپێکەنینەوە قەباغی شووشەکەی نایەوەو خستیە دەستی مریەم.

یەعقوب// (بەپێکەنینەوە) مراوی گیان تا زستانی داهاتوو هەربۆنی بکە.

مریەم// (بەتورەبوونێکی لەناز هەڵکێشراو) حەیوان دیسان ووتت؟!

لەدووری چەند مەترێك بەهۆی تاریکی شەوەکەوە  ترێ بەئاستەم شووشەکەی ئەبینی بەلام بۆنە خۆشەکە بلاو بووەوەو لوتی ئەویشی پڕکرد، هەرلەشوێنەکەی خۆی ووتی:-

ترێ// وەیش....مریەم بۆنێکی خۆشە.

یەعقوب لەوێوە چاوەکانی بڕیە ترێو پڕبەدڵ خۆشەویستی خۆی بۆ دەربڕی، بەهۆی ئەوەی زۆری خۆش دەوێ لەسەرەخۆ پێی ووت:-

یەعقوب// ترێ گیان ئەمجارە کەهاتمەوە عەترێکی منالانەی زۆر خۆشت بۆ ئەهێنم، وەکو خۆت جوان.

مریەم// (بەپێکەنینو سووکی بۆئەوەی ترێ گوێی لێنەبێ) کەی ساڵێکیتر؟ شێتە.

*　　*　　*

## گەڕانەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

مریەم لەنێو جێگاکەیدا بیر لەو شتانەو زۆر شتی‌تریش دەکاتەوە، خەیاڵەکانی جێگیر نین بەنێو هەزاران شوێن‌و کاتدا ئەسوڕێنەوە لەهەمووشیان کاریگەرتر چاوەڕوانی یەعقوب‌و نەگەیشتنیەتی! سەرسامی‌و کاریگەری نەگەیشتنی ئەمشەوی دڵدارەکەی بەسەر دەم‌وچاوە وردیلەکەی دیارەو بەهیچ شێوەیەك ناڕەوێتەوە.

تەمەنەکەشی ئەوەندە زۆر نیە ببێتە هۆی دونیا دیدەیی‌و تەجروبەی زۆری تاکو نەهێڵێت کاریگەری چاوەڕوانی کارلە هەست‌و دەرونی بکات‌و رەنگدانەوەی خراپی بۆ بێتە پێشەوە، یان زۆر بەچڕی بیر لەدواکەوتنی دڵدارەکەی نەکاتەوەو بەکارێکی سانا وەریبگرێت کە دواکەوتن زۆر ئاساییە بۆ هەر مرۆڤێك‌و لەهەرکارێکدا.

ئەو شێوە حەپەساویەی سەر دەم‌وچاوی مریەم کەلەزاری تریێ وەرگیراوە ئەوەندە کاریگەری هەبوو بۆی تەنانەت تریێش بەدەست ئەو خوشکە گەورەیەی پەشۆکاو بوو وهەندێجار ئەیویست بەمشەوە درەنگە دایك‌و باوکی وەئاگا بێنێتەوە، چونکە ئەمشەوی چاوەڕوانی شەوێکەو هەرگیز لەیاد ناچێت، ئەگەر یەعقوب‌و مریەم منالێکیان ببێ رەنگە ناوی لێبنێن (چاوەڕوانی) یان (ئازار) یان (عەزاب)، (ئێش)، (نەگەیشتن)، یان هەر شتێکی ناخۆش.

ئەوەتا مریەم بەمشێوە پەشۆکاویەو بەم حەپەساویەو بەمشەوە سارده لەسەر جێگەکەی خۆی دانیشتووە، بەهۆی چاوەڕوانی‌و نەگەیشتنی یەعقوب خۆی لەئازار هەڵکێشاوە، لە دەریایەکی بێ بنی خەیاڵ مەلە ئەکات، نەهێزی دەرچوون، نەرێگەدان بەنوقم بوونی یەکجارەکی، بڕیار لەسەر هیچیان نادات، ئەمڕۆ سەرلەبەیانی ١٩٩٤/١٢/٢٢ـە ئەم کچە لادێییە عاشقە بەهۆی

زۆری خەفەتی چاوەڕوانی بەیەکجاری دیق ئەکات، کاریگەری ئازاری چاوەڕوانی دوێنێ ئەوی بەسەرەوە دیارەو ئەبێتە هۆی پچڕانی بەندی دڵی و ماڵئاوایی لە بەهاری تەمەنی دەکات.

*     *     *

## هێلی گشتی بەردەوامە........

### کات

### هەمان بەیانیی دووەم ڕۆژی زستانی ١٩٩٤ـە

### دڵداری بریندار لەسەر شاخەکەیە

یەعقوب لەسەر تەپۆلکەکە نەماوە، نەختێك بەرەو ئەودیو گوندەکەی ماڵی مریەم دابەزیوە، کەمێك لەشوورەی سیمی ڕەبیە کۆنەکە نزیك بۆتەوە بەڵام ناتوانێ و ناوێری بچێتە ناوی! دەمێکیشە جامانەکەی بەسەرومليەوە نیە چونکە ئالاندوویەتی لەبرینەکانی قاچی چەپی بۆیە سەروملی گرمۆڵەکردووەو قاچەکانیشی بەهۆی تەڕبوونیەوە زۆر سەرمایانە، نازانێ ئازاری سەرمای قاچی یان سەری بچێژێ.

ئەوەتا ئەم گەنجە بریندارە لەسەر ئەم شاخە ساردە بەرامبەر گوندی دولبەرەکەی وەستاوەو یەخەی پاڵتۆکەی بەدەست بەرز دەکاتەوە تاسەروملی لەو هەوا ساردە بپارێزێ، هەموو دەمارەکانی لەشی لەتاو سەرما کرژ کردووەو هەڵئەلەرزێ، لەوبەرزاییەوە سەیری گوندەکەی ماڵی مرەخان ئەکات و چاویش ئەگێڕێ بۆ ماڵی ئەو کیژە بەڵام بۆی نادۆزرێتەوە، چونکە هەمووی بەبەفر داپۆشراوەو لەیەکتر ئەچن، لەناودێ لەو دوورەیەوە چەند کەسێکی بەدیکرد، تۆزێ گەشایەوە، دوای تاوێك تێرامان بۆ خوارەوە، ڕووەو سەرەوە چاوێکی هەڵبڕی بۆ گورگەکە، زۆریش لێی ناترسێ چونکە برینەکانی هێزیان لێبڕیوە

بەلام برسیەتی پالی پێوەئەنێ رووەو یەعقوب بچێتە سەر ئەو شاخە، رۆیشتنەکەشی بەهۆی برینەکانی هێواش بووەتەوەو لەکاتی رۆیشتندا لار ئەبێتەوە ئەوەندەیتر ترسی لەدلی یەعقوب دوورخستۆتەوە، بەلام بۆ بەدبەختی ئەو دوو عاشقە ئەم ئاژەلە برینداره بەهیچ شێوەیەك واز ناهێنێ و بەردەوام دوای ئەو کوڕە کەوتووە.

یەعقوب-یش پڕ بەپڕی خۆی ئەقلی لەسەردا نەماوەو زۆر ژیرانە هەلسوکەوت ناکات، چ بەهۆی کەمی تەمەنی، چ بەهۆی برینداری زۆرو سەرمابوونێکی لەڕادەبەدەری قاچ و سەروملی یان ترسێکی زۆری نزیك بوونەوەی مەرگی خۆی لەبەهاری تەمەندا، ئەوەتا زۆر بێ ئەقلانە جارێکیتریش پشتی کردە گورگەکەو رووی کردەوە دێکەی مالی دولبەر، لەو بەرزاییەوە دووبارە ئەیڕوانیە ئەو چەند کەسەی بەبچووکی لەناو دێ دیاربوون، ئەویش زیاتر دلخۆش بوو چونکە ئەو کەسانە هەرچەندە دوور بوون بەلام وەکو سەرچاوەیەکی فریاکەوتن وابوو بۆی.

گورگەکە گەیشتۆتە کۆتایی رەبیەکەو سەرەتای شوورە دڕکاویەکە، ئەمجارە رێگەکەی سەوربەرەوخوارەو ئاسانتر رێئەکات! چونکە بەرزاییەکەی بڕیوەو بۆی ساناتر بووە، یەعقوب-یش چەند ساتێك پێش ئێستا بەهۆی ئازاری برینەکانی و بیرکردنەوەشی کەمێك لەسەر شاخ وەستاو هێزی رۆیشتنی نەمابوو بۆیە ئەو گورگە هەلی بۆ رەخساو لەکاتەکانی وەستانی عاشقی بریندار بەرزاییەکەی رووەو سەرەوە بڕی.

یاقوب ئەزانێ لەرزگاربوون زۆر نزیك بووەتەوە، بۆیە لەخۆشیا زۆر گرنگی بەنزیك بوونەوەی ئەو گورگە نەدا، جا چ بەهۆی برینداری و نەترسان لێی، چ بەهۆی بێهۆشی خۆی لەبەر برینداری و ئازارو سەرماش چونکە بەردەوام ئەلەرزی، بەرلەوەی هەنگاوبنێ بەرەو گوند خەریکی توندکردنەوەی

جامانەی سەر برینەکانی قاچی بوو لەخشپەی دوای خۆی وەئاگاهاتەوە! لەگەڵ ئاوڕدانەوەیدا گورگەکە بەخۆهەڵدانێك لەبەرزاییەکە کەوتە سەر سەروملی ئەو گەنجە بریندارە! هەردووکیان لەیەکتری ئاڵۆز بوون رووەو سیمە دڕکاویەکەی چواردەوری رەبیەکە خلبوونەوە، لەشی هەردووکیان بەبەفر داپۆشرابوو، مرۆڤێك و ئاژەڵێکی سپی توند یەکتریان گرتبوو بەیەکەوە ئەسووڕانەوە، جارێك بۆ سەرەوە جارێکیش بۆ ژێرەوە، لەهەردوو کاتدا یەعقوب تواناو هۆشی ئەوەی هەبوو پاڵ بەسەرو ملی ئەو گورگەوە بنێ و قەپ و دانە تیژەکانی لەخۆی دوور بکاتەوە، یەعقوب زۆریش لێی ناترسێ چونکە ئەزانێ ئەو گورگە بەهۆی برینەکان دوێنی شەو هێزی کەمی پێماوە بەڵام لەبەختی ئەو دوو عاشقە ئەوەتا واز لەیەعقوب ناهێنێ و ئەیەوێ مەرگی یەکێك لەو دڵدارو دولبەرە بەرەو دونیای عەدەم ببات.

لەگەڵ لوولخواردندا بەهۆی ترس و دڵەڕاوکێی باوەشی ئەم گورگە خەیاڵەکانی یەعقوب گەڕایەوە بۆ هاوینی ئەمساڵی ناوچەی کفری:-

* * *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر، دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

لەوشەوەدا باوکێك و دوو کوڕ بەبێکەسی لەهاوینی ئەمساڵی ١٩٩٤ لەناوچەی کفری زەلیلی بەردەمی گورگێکی هارو برسی بوون! کەیەکێك بوو لەوگەلە گورگەی ناوچەکە، سەربازە بەعسیەکان بەوکارەیان ئەزانی و چەندین کەسیتریان بەمشێوەیە دەرخواردی ئەو گورگانە دابوو، بۆیە بەوشەوەی هاوینی ١٩٩٤ تاماوەیەك بەدوای ئەو باوك و دوو کوڕە رۆیشتن، دواتر بەبێ

ئەوەی هەستی پێبەکەن لەکاتێکی نادیاردا گەڕابوونەوە بۆ نێو رەبیەکانی خۆیان.

یەعقوب خۆی و باوکی بەمشەوە نەیانئەتوانی کامەرانی برای لەژێر چنگی ئەو گورگە دەربێنن! هەرسێکیان جلیان بەبەرەوە نەمابوو چونکە هەمووی بەهۆی چنگ و قەپی گورگەکە دڕابوو.

کامەران// (بەهاوارو گریانەوە) وای باوکە گیان....یەعقوب گیان بیکوژن....بیکوژن خواردمی ی ی ی ی.

ئەوانیش بەردەوام هەوڵیان ئەدا ئەو کوڕەیان لەژێر چنگی ئەو دەعبایە دەربهێنن، بەلاّم بەهیچ شێوەیك دەرەقەتی نەدەهاتن، گورگەکە بە هۆی بۆنی خوێن زیاتر پەلاماری کامەرانی ئەداو یەك لەسەر یەك قەپی لێدەگرت، تاکو وایلێهات کامەران لەزمان کەوت و خۆی و باوکی بەگریان و ڕۆلەڕۆو براڕۆ شاتاڵیان بۆ ئەو دڕندەیە ئەبرد بەلاّم بێ سوود بوو چونکە چنگەکانی ئەو تیژترو بەهێزتربوو بۆیە بەهیچ شێوەیەك دەرەقەتی نەدەهاتن.

* * *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

یەعقوب ئاوەها بیری لەبراکەی دەکردەوە لەهەمان کاتیشدا لەوە ئەترسا بکەوێتە سەر مینێك و پیایا بتەقێتەوە! لەگەڵ تلخواردنیان بەرەو خوارەوە جارجارە سەرنجی تەلەکانی ئەدا کەسەرجەم مینەکانی بەیەکەوە بەستۆتەوە! زۆر بەباشی ئەیبینین چونکە هێشتا بارستایی بارینی بەفرەکە نەیشاردبووەوە، لەوە دەترسا ئەگەر یەکێکیان بتەقێتەوە ئەوا هەرهەمووی

بەیەکەوە تەپۆلکە شاخەکە بەرەو ئاسمان بڕفێنن! ئەویش لەگەڵ گورگەکەدا بەخوێن و گۆشت تێکەڵاوی یەکتر ئەبن.

*　　*　　*

دڵی عاشق زۆر هەستیارە، مریەم لەنێو جێگاکەی ئەمدیو ئەودیو دەکات، بەجەستە زۆر شەکەتە بۆخەو....بەڵام بەمێشك لەگەڵ ئازارەکانی یەعقوب ئەژی، سەرماکەی یەعقوب ئەچێژێ، ئازاری برینەکانی یەعقوب-یان پێوە دیارە، هەست بەهەموو شادو ناشادێکی دڵدارەکەی دەکات....بۆیە لەنێو جێگەکەیدا چاوەکانی لێك ئەنێ و دواتر رائەچڵەکێت.

*　　*　　*

لەو جووت بوونەی یەعقوب و گورگەکە هەردووکیان بەرەو خواربوونەوە! یەعقوب بیر لەشتێك دەکاتەوە خۆی رزگار بکات تاهەموو ئاواتەکانی نەچێتە ناوسکی ئەم گورگە یان بەسەر مینەکاندا پارچە پارچە نەبێت مریەمیش بەتەنها بمێنێتەوە.

یەعقوب و گورگەکە بەردەوام بەیەکەوە لوول ئەخۆن بەڵام گورگەکە زۆر بێ هێزەو توانای قەپ گرتنی نیە، ئەو گەنجەش کەمێك زاڵە بەسەریداو بەهەردوو دەست سەروملی گرتووەو لەخۆی دووری دەکاتەوە، بەهۆی برینەکانی گورگەکە جلەکانی یەعقوب زیاتر خوێنیان پێوەنووساو سوور هەڵگەڕان، لەو جەنجاڵی و ترسەدا کەئەیویست شتێك یان بیرێك بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی خۆی پێ رزگاربکات نەوەکو ئەو گورگە دڕندەیە زەفەری پێببات و قەپێك یان چنگێکی تیژ بەر مل و قوڕقوڕاگەی بکەوێ خۆ ئەوکاتە هەموو شتێك کۆتایی دێت! منیش وەك نووسەری ئەم دەقە ئەبێ کۆتایی بەهێلی گشتی بێنم و لەدوای مردنی ئەم گەنجە بەشێوازێکی‌تر ژیانی مریەم وێنا بکەم و بەجۆرێکی‌تر بیخەمە نێو پرۆسەی گێڕانەوە، یەعقوب لەوکاتەدا بیری

لەچۆنیەتی رزگار بوونی خۆیو باوکی دەکردەوە کاتێ کامەرانی برای گورگ خواردیو جوانەمەرگ بوو، هەرلەنێو باوەشی ئەم گورگەدا بەبیریدا دەهات کەچۆن ئەو پیاوانە گەیشتنە سەریان:-

*　　*　　*

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێلێکی باریکتر، دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

بیری لەو قاچاغچیانەی ناوچەی کفری دەکردەوە ئەگەر ئەوان ئەو شەوەی هاوینی ئەمساڵی ١٩٩٤ نەگەیشتنایەتە سەریان خۆیو باوکیشی بەدەردی کامەرانی برای ئەچوون!

*　　*　　*

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

یەعقوب زۆر بێهێزە، باوەشی بەگورگەکە کردووەو چاویش ئەگێڕی بۆ یەکێك...یان بەڵکو ئەوکەسانەی لەدوورەوە لەگوندەکەی ماڵی مریەمدا بەدیکردبوون بگەنە سەریو قاچاغچیەکان ئاسا لەوکاتەدا فریای بکەونو رزگاری بکەن بەڵام کەس دیار نەبوو.

*　　*　　*

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێلێکی باریکتر، دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

لەوشەوەدا گورگەکە لەهەرسێکیان ئالابوو ولێیان نەئەبووەوە، ئەوانیش زۆر هەوڵیاندا کامەران لەژێر چنگی دەربهێنن، لەکاتی راکێش

راكێشـەكە خـۆی‌و بـاوكی لـەدوورەوە بـەو شـەوە تاریكـە چـەند پیاوێكیـان بەدیكرد وەكوتارمایی بەراكردن بەرەو لایان ئەهاتن، نەیاندەزانی كێن‌و چین؟! گورگەكە بەردەوام لەگەڵیاندا شەڕە چنگی دەركردو ئەیمڕاند، ئەوانیش جگە لـەدیفاعكردن هیچیتریان پێنـەدەكراو لەودوورەشـەوە سـەیری تارمایییـەكانیان دەكر كەبەرەو لایان دەهاتن.

*　　*　　*

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

دواتر یەعقوب لەسەر ئەم شاخە ساردو پڕبەفرە هاتەوە هـۆش خـۆی لەباوەشی ئەم گورگەدایەو بەیەكەوە تل ئـەخۆن جارێك بەلای راستو جارێك بەلای چەپ، چاودێری خۆیشی دەكات نەبادا بكەوێتە سەرسیمی مینـەكان‌و هـەموو ئاواتـەكانی بەپارچـەكراوی لەگـەڵ خـوێن‌و گۆشـتدا بچـێتە ئاسمـان! لەگـەڵ ئەوگورگـە بـەردەوام لەیـەك ئاڵاون، دووبـارە ئەوشـەوەی ناوچـەی كفری هاتەوە بەرچاوی:-

*　　*　　*

## جیابوونەوەی لقە جووڵە

كاتێ گورگەكە بەسەر هەرسێكیانەوە بوو، ئەو تارماییانەی لەدوورەوە بـەدییان ئـەكردن هەرهـەمووی پیاوگـەلێكی كـوردی چـەكدار بـوون‌و گەیشـتنە سـەریان بەدەمانچە كاسەی سـەری ئـەو ئاژەڵـە دڕەنـدەیان تەقانـدو لاشـەكەیان لێدوور خستنەوە.

*　　*　　*

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

ئەم گەنجە عاشقە بریندارە نەیدەتوانی لەباوەشی ئەم گورگە خۆی رزگار بکات، بەئاواتی ئەخواست وەکو ئەوشەوەی ناوچەی گەرمیان یەکێکی بۆ پەیدا بێتو رزگاری بکات، بەڵام کەس فریای نەکەوت، کەسی پێنەگەیشت، گوێ لەدەنگی کەسیش نەبوو، خۆ گورگەکە زۆر بێهێز بوو بەڵام بەهیچ جۆرێك لەکۆڵی نەدەبووەوە، خۆشی ئەگەر بریندارو سەرمابردەڵە نەبوایە بەهەمان شێوەی مام حەمەد قادر قورگی دەگرتو لەماوەی چەند خولەکێکدا دەیخنکاند.

*      *      *

## جیابوونەوەی لقە جووڵە

بەم بەیانیە لەسەر ئەم شاخە ساردو پڕ بەفرەدا نیوەڕۆکەی مام حەمەد قادری ئەهاتەوەبەرچاو کە لەناوچەی کفری چۆنو بەچ شێوەیەك قورگی ئەو گورگەی گرتبووو دواتر ئەوەندە خۆی راتەکاند تاوای لێهات دەستی کرد بەراکردنو چەند مەترێك مام حەمەد قادری بەدوای خۆیدا راکێشا، چەند جارێك بەسەر لاشەی هەردوو مردووەکەدا هاتووچۆیانکرد، لەشی مام حەمەد قادر-یش بەخوێنی هەردوو براکەی سوور بوو، لەگەڵ خۆڵەکەی ئەوێ قوڕێکی سوور بەسەر جلەکانی ئەو پیاوە دیار بوو بەڵام ئەو بەهیچ شێوەیەك ملی ئەو گورگەی بەرنەئەدا، لەترسی مردنی خۆی بۆ ئەوەی بەدەردی هەردوو براکەی نەچێت چرکە لەدوای چرکە زیاترو توندتر قورگی ئەگوشی تاوای لێهات بەدەستیەوە شل بووو گیانی دەرچوو، ئەویش هەموو لەشی بەخوێنو خۆڵو تەپوتۆز داپۆشرابوو.

*      *      *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

یەعقوب و ئەم گورگە بەردەوام باوەشیان بەیەکدا کردووەو ئەخولێنەوە، لەئاکامی پەلامارە بێهێزەکەی ئەم گورگەو تلخواردنیاندا لەهەلێکدا یەعقوب توانی بەقاچەکانی هەڵیبداتو لەخۆی دوور بخاتەوە! خۆیشی هەڵسایەوە بەکوڕە کوڕە بەرەو سەرەوەی تەپۆلکەکە رایکرد تالەسنوری مینەکان دووربکەوێتەوە، لەکاتی خۆرزگارکردندا ئاوڕی بۆ دواوە دایەوە بینی گورگەکە لەیەکێك لەسیمەکان نزیك بۆتەوە! هەرئەوەندەی بۆکرا زیاتر خۆی هەڵبدا بەرەو پێشەوە بەلام لەدواوە زرمە هەستاو چەند پارچە مینێکیشی بەرکەوت، دووسێ چرکە تێپەڕی........ئەم گەنجەش بەسەردەما پاڵکەوتبوو ونەیدەوێرا بجووڵێ، هەستی راگرت دەنگ نەما، جووڵە نەما، لەوناوە چرکەو چرپەی هیچیش نەدەهات تەنها هەواکەی زۆر ساردبوو خەریك بوو ئەو گەنجە برینداره رەقی دەبردەوە، لەشوێنەکەی خۆی کەمێك خۆی خستە سەرتەنیشتو ئاوڕێکی دایەوە بۆ دواوە، گورگەکە نەمابوو تەنها شوێنەواری پارچەپارچە بوونی مابوو کەپەڵەیەکی خوێنی گەورە بوو وچەند پارچە گۆشتێکیش لەوناوە کەوتبوو، هەندێ لەگۆشتو خوێنەکەشی کەوتبووە چواردەوری یەعقوب و بەفری سەر ئەم شاخەی بەخوێن سوور کردبوو، ئەم گەنجەش زۆر لەگورگە تووڕە بوو، زۆریش خەفەتی لەبەختی خۆی خوارد کەئاوا لەدوێنی شەوەوە تائێستا ئەم گورگە وازی لێنەهێناوە، خەریك بوو ئەویش تیا بچێتو ئاواتەکانی لەگەڵ ئەو مینانە بەپارچەکراوی دابەشبێت بەسەر بەفری ئەم شاخە ساردەی نێوان هەردوو گوند.

* * *

## هێلی گشتی بەردەوامە........

## کات

### هەمان بەیانیی دووەم ڕۆژی زستانی ١٩٩٤ـە

### لە ناو گوندەکەی ماڵی مریەم لەدوای تەقینەوەکەی سەرشاخ

ئەو کەسانەی لەناو گوندەکەی ماڵی مریەم بەو بەیانیە بەدەرەوە بوون گوێیان لەو تەقینەوەیە بوو! هەرلەوێوە سەریان هەڵبڕی بەرەو تەپۆلکەکە! بینیان بەفرەکە وەکو تەپوتۆزێکی سپی لەئاسمانەوە دائەبارێتە خوارێ! ئەیانزانی تەقینەوەی مینەکانی ئەو ڕەبیە کۆنیە بەڵام سەریان لەوە سوڕما و ئەیانووت:-

- بەم بەیانیە کێ چۆتە ناو ئەو ڕەبیە کۆنە؟!
- تۆ بڵێی مردبێ؟!
- خوایە گیان....کەس نەمردبێ!
- ڕەنگە ناشارەزابێت.
- لەوانەیە ئاژەڵ بێت.

لەنێوان ئەم پیاوانە چەند وتووێژێکی لەمجۆرە ڕوویدا، وردە وردە پەنا دیوارەکەیان بەرئەداو ئەهاتنە پێشەوە بەرەو شاخەکە، چۆنیش چاویان لەوبەرزاییە بڕیبوو نەیاندەتروکاندو چاوەڕێی جووڵەیەك یان کەسێك یان هەرشتێك بوون تا بۆیان ساغ بێتەوە چیەو چۆنە.

ئەگەر ئەو پیاوانەی ئەو گوندە بدوێنی ئێستاش باسی ئەو بەیانیە دەکەن کە بۆ ئیش‌وکارەکانیان هاتبوونە دەرەوەو لەبەر سەرمای ئەو ڕۆژەش خۆیان خزاندبووە پەنا دیوارەکانی دێ، باسی ئەو تەقینەوەیە دەکەن کەدوای سەر هەڵبڕینیان چیو چۆنیان بەدیکردبوو.

* * *

بـۆ بەدەسـتهێنانی ڕێپۆرتـاژێکی بەڵگەنامـەیی ئـەو چـەند پیـاوە بەمشێوەیە وردەکاری چۆنیەتی تەقینەوەکەیان باس کرد:-

- دوای تەقینەوەکـە بەفرەکـەمان بینـی وەکـو پەڵە هەورێکی سپی وردە وردە دائەباری بۆ سەر شاخەکە.
- دوای ئەو دەنگە زلە زۆریش چاومان گێڕا بۆ کەسێك یان هەر جووڵەیەك تاکو بەرەو پیری بڕۆین و فریای بکەوین.
- ئەرێوەڵڵا ئەو گەنجە داماوەی ئەو گوندەی دراوسێمان پێوەبووبوو.
- ئەگەر نەگبەت نەبوایە وای لێنەدەهات.
- ئێ باشە خۆ ئەویش شارەزای ناوچەکەیە.

* * *

بـەم بەیانیـە مریـەم دەمێکـە وەئاگایـە، پـێش تەقینەوەکـە چـاوەکانی بەنێو ژوورەکەدا ئەگێڕا، ئەمشەوی بەکەروێشکە خەو بەسـەربردووە، بەئازاری دووری بەسەربردووە، زامی نەگەیشتنی دڵدارەکەشی سارێژنەبوو، بەڵام تـرێ تایێستا بـۆ خـۆی خپـی نێـو خـەو بـووە، لەگـەڵ تەقینەوەکەشـدا هەرلـەناو جێگەکەیەوە چاوەکانی زوق بووبوونـەوەو بـەبێ ئـەوەی دەمـی بجووڵـێ لـەدڵی خۆیدا دوعای بۆ لاوە سەرکێشەکە دەکرد:-

مریـەم// (<u>لـەنێو ژوورەکـەی خـۆی لەسـەر جێگەکـەی خۆی زۆر لەسـەرەخۆ قسـە ئەکات</u>) خوایە لەیـەعقوب بـەدور بێـت....قـەزای لـەمن کـەوێ....یـەعقوب گیـان یـاخوا مـەرگت نـەبینم....خوایـە بیبەخشـە بـەمن،

(دوایی بەهەمان شێوە لەدڵی خۆیدا بەدەموچاوێکی حەپەساوی‌و وەك بیەوێ باوەڕ بەخۆی بکات)

یەعقوب بەم بەیانیە لەسەر شاخ چی دەکات؟!

کەمێکی‌تر لەبەر خۆیەوە لەبنمیچی ژوورەکەو دەرگاکە رائەما! نازانێ چۆن بیربکاتەوە چۆن بریار بدات، ئەی چۆن هەواڵێکی ئەو کوڕە شێتە بزانێ؟! خۆ ئەم کیژۆڵەیە لەدوێنێ شەوەوە ئازای چاوەڕوانی ئەچێژێ، بەمێشك‌و تەنانەت بەجەستەش زۆر ماندووە، بیرکردنەوەکانی تێکەڵ‌وپێکەڵ ئەبن‌و لەناو جێگەکە ئارامی لێبڕاوە، نازانێ هەستێ یان نا! خۆ ئەو چاوڕوانی بەیانی دەکرد تاکو لەگەڵ کەوتنی رووناکیدا دەرپەڕێ‌و بەپەلە سۆراخێکی دەست بکەوێ، ئەوەتا ئێستاش بەیانیە بەڵام نازانێ چی بکات، هێزی قاچەکانی نیە هەڵسێتەوە، هێزی بانگکردنی تریشی نیە تاکو بەشداری‌و هاوبەشی خەمەکانی بێت، وەکو وڕێنە لەدڵی خۆیدا ئەدوێ‌و هەرخۆشی گوێی لێئەگرێ:-

مریەم// ئەبوایە ئەو شێتە ئەمشەو بگەیشتایە!....نا....شارەزای هەموو ناوچەکەیە....چەمەکەو سەرشاخیش....هەڵەی وا ناکات.

* * *

## هێلی گشتی بەردەوامە........

## کات

## هەمان بەیانیی دووەم ڕۆژی زستانی ١٩٩٤ـە

## یەعقوب لەسەر شاخەکە بەبریندراری دانیشتووە

یـەعقوب دوای دووبـارە برینـدار بـوونی لەسـەر ئـەو شـاخە سـاردو پڕبـەفرەدا بەتـەنها دانیشـتووە، گڤـەی بـا سـاردەکەش زۆر بـەهێزە بـەهۆی تەڕبوونی شەرواڵەکەی لەناو کانیاوەکەدا قاچەکانی زۆر سارد بوون‌و هێزی ڕۆیشتنیشـی پێنـەماوەو ئازاریشـی زۆرە، بەتـەواوی ڕەنگـی مـردووی لێنیشتووە، بیر لەکەساسیو تەنهایی خۆی ئەکاتەوە، بیریش لەکامەرانی برای ئەکاتەوە کەلەهاوینی ڕابوردو لەناوچەی کفری لەو شەوەدا لەگەڵ مەلا عەلی باوکی بەسەر تەرمی کامەرانی برای دانیشتبوون‌و ئەگریان، ئەو دیمەنانەی ئەوسای تەنها بەوێنە ئەهاتەوە بەرچاو دەنگەکانیش تەنها هەوا ساردەکەی سەر شاخ بوون، خۆشی لەو تەنهاییەدا دوای دووبارە بریندار بوونی بەهۆی تەقینەوەی مینەکان‌و دووری مریەمیش چاوەکانی پڕ بووبوون لەفرمێسکی قەتیسماو لەترسی غیرەتیی نەیاندەتوانی بێنە خوارێ، کاریگەری سەرماکەش سەربار، هەربەمشێوەیە ئەهاتەوە بەرچاوی کەچۆن:-

*　　*　　*

## جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر،

## دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

پیاوەکـان لەگـەڵ یـەعقوب‌و باوکیـدا کامـەران ئەمـدیو ئـەودیو ئەکـەن! بـەڵام کارلـەکار تـرازاوە، ئـەو گەنجـە بـەهۆی قـەپکرتنی گورگەکـە لـەقوڕگی، کامـەران جوانەمـەرگ بـووە! خۆشـیان زۆر بریـندار بـوون بـەهۆی گـازو نینۆکـە

تیـژەکانیی! هـەم بۆ تـەرمی کامـەرانی جوانەمـەرگ هـەم بـۆ ئـازارو برینـداری خۆیان ئەگریان‌و خۆڵی ئەوێیان ئەپێوا، دوای تاوێك سەیرێکی ئەو پیاوانەیان کرد کە بەدەمانچەکەی دەستیان لەدەمی ئەو گورگە هارە رزگاریان کردن:-

مام عەلی// (بەگریانەوە بەسەر تەرمی کامەرانی کوڕی دانیشتووەو بۆ ئەو چەند پیاوە قسە دەکات) ئێوە چین؟! فریشتەن لەم کاتەدا پەیدا بوون؟!

پیاوەکـان// ئێمـە قاچاغچین. ئـەی ئێـوە چـی ئەکـەن لێرە؟!

مـام عـەلی‌و یـەعقوب نەیانئـەزانی چـیان وەڵام بدەنـەوە! هەرئەوەنـدە بەمشەوە واقوڕماو بەسەر تەرمی کامەران دانیشتبوون! ئەو کارەساتە جەرگبڕە لەچرکەسـاتێکدا هـاتوو رۆی! کامەرانیشـی لەگـەڵ خۆیـدا بـرد! ئەوانیشـی بـۆ خەم نۆشین لەوێدا بەجێهێشت! یەعقوب لەسەر ئەو شاخە ئەهاتـەوە بەرچاوی کەبەدەم شیوەن‌و گریانەوە بۆ براکەی بەباوکی ئەووت:-

یـەعقوب// (بەگریانـەوە) باوکـە سـەربازەکان لـەدواوە ئامـاژەیـان بـۆ شـێوەی گـورگ دەکـرد! دیـارە ئـەوان ئەیانزانی لێرە گورگ هەیە.

قاچاغچیەکان// سـەربازی چـی؟! (ئەکەونـە خۆیـان‌و خۆیان ئامادە دەکەن‌و چەکەکانیان ئامادە دەکن)

* * *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

یەعقوب بەم سەرما و سۆڵەو برینداریەی ئێستای لەسەر ئـەم شـاخەی ناوچەی حـاجی ئۆمـەران بیر لـەهاوینی ئەمسـاڵی ناوچـەی گـەرمیان دەکاتـەوە

کەبەوشێوەیە کامەرانی برای گورگ خواردیو ئاواش دیمەنەکانی دێتەوە بەرچاو.

لەسەر ئەم شاخە بەبێ هێزی دانیشتووە، گوندەکەی ماڵی مریەم-ی لێوەدیارە، لەوێوە ئاوات بەگەرمی نێو ماڵەکان دەخوازێ، زۆر حەزدەکات لەنێو ئەو بەفرو سەرمایە رزگاری بێتو بەزووترین کات بگاتە نێو ماڵەکانو کەمێك گەرمی بێتەوە.

ئەم گەنجە عاشقە جارجار سەیرێکی چواردەوری خۆی دەکات! لەوە ئەترسێ چەند گورگێکیتری بۆ پەیدا بێت! یان هەرجۆرە ئاژەڵێکی کێویو درەندەیتر دەرکەون! دەنگی با ساردەکەش زۆر ترسناك بوو! بۆیە لەبەر خۆیەوە ئەیچرپاند بەگوێی بەفرو سەرمای سەر شاخەکە:-

یەعقوب// (رووەو ئاسمان سەر بەرز دەکاتەوەو هەناسە هەڵئەکێشێو ئەیداتەوە) خوایە گیان زۆر بریندارم! ئەگەر تەنها یەك گورگیترم لێپەیدا بێت! بەخوا هیچم پێناکرێ.

من وەکو نووسەرێك دووبارە بەئێوەی خوێنەری ئەم دەقە رائەگەیەنمو ئەڵێم ئەگەر تەنها یەك دانە گورگیتر بخەمە سەر هێڵی گشتی ئەم چیرۆکەو لەسەر ئەم شاخە ساردەدا رەوانەی رەبیە کۆنەکەی بکەم، ئەوا بێگوومان کاکە یەعقوب توانای بەرەنگاریو پارێزگاری لەخۆی نیە! ئەو گورگەش تەنها بەیەك پەلاماری بچووك کاکەی عاشق دەخواو کۆتایی بەتێکستەکەی منیش دێت، بەڵام نامەوێ یەعقوب لەسەر ئەم شاخە ماڵئاوایی لەم دونیا بکات، من ئەمەوێ رەوانەی گوندەکەی ماڵی مریەم بکەمو بەدواداچوونیش بەردەوامە.

* * *

## هێلی گشتی بەردەوامە........

### کات

### هەمان بەیانیی دووەم ڕۆژی زستانی ١٩٩٤

### لەناو گوندەکەیماڵی مریەم

### دوای تەقینەوەکەی سەرشاخ

لەنێو گوندەکەی ماڵی مریەم ئەو چەند کەسە کۆبوونەوە، بۆیەکتر قسەیان دەکردو ئاواتی ئەوەیان ئەخواست کەس لەو تەقینەوەیە نەمردبێ، خۆشیان لەسەرما گرمۆڵە کردبوو گەڕابوونەوە پەنا دیواری ماڵەکانی ناودێ، لەوێ سەیری بەرزاییەکەیان دەکرد، گوێشیان هەڵخستبوو بۆ دەنگێك یان هیچ نەبێ جووڵەیەکیش ببین، ئەوان شارەزای ئەو تەپۆلکەیەن هەرگیز نزیکی ناکەون چونکە ئەزانن مین ڕێژ کراوە کۆنەکەی سەردەمی حکومەتی بەعسەو هێشتا لەلایەن ڕێکخراوەکان بۆیان پاك نەکراوەتەوە، خۆیان لەگەڵ دیوارەکان جووت کردبوو تاکو لەهەوا ساردەکەی ناودێ بەدووربن‌و لەگەڵ یەکتر قسەیان دەکرو ئەیانڕوانیە بەرزاییەکەش:-

- ڕەنگە گورگ بێت! یان شتێکی‌تر! وانیە؟!
- منیش ئەڵێم کەس نیە، چونکە هەموو خەڵکی ئەم ناوچەیە شارەزای ئەم ڕەبیەن.
- من ئەترسم یەکێکی نەگبەت پێوە بووبێ‌و گیانیشی لەدەستدابێت.

ئەم چەند پیاوەی ئاوایی هەربەم شێوەیە گفتوگۆیان لەگەڵ یەکتر دەکردو جارجارەش ئۆقرەیان لێدەبڕا هەوڵیان دەدا بێنە پێشەوە سەرکەون بۆ

سەرشاخ دواتر بەهۆی هەوا ساردەکە جارێکیتر ئەگەڕانەوە شوێنەکەی خۆیانو سەرلەنوێ قسەیان لەسەر ئەوە دەکرد کەچۆن بزانن کێیەو چیە؟!

- بەقسەی من دەکەن با سەرکەوین.
- با بچین سەیرێکی ئەوێ بکەین، ئەگەر کەس گرفتار نەبوو بوو ڕێک ئەگەڕێینەوە.
- منیش حەز دەکەم سەرکەوینو دڵنیا بین.

ئەو چەند پیاوەی ئەوێ مقۆمقۆ ئەوەیان بوو کە کۆدەنگیەك بکەنو بەیەك دڵو یەك قسە بەیەکەوە بچن بۆ سەر ئەو شاخەو سەیرێکی شوێنی تەقینەوەکە بکەنو لێی تێبگەن، ئەگەر هەر مرۆڤێکی تیا بریندار بووبێت یان خوانەخواستە مردبێت بچن بەدەنگیەوەو هەواڵەکەش بەناو ئاواییدا بڵاو بکەنەوە تا کەسوکاری ئەو کەسە ئاگادار بێت، یان بەهەر شێوەیەکیترو چۆن چۆنی ڕوویدابێت ئەوان لێی ئاگادار بن.

* * *

**هێلی گشتی بەردەوامە........**

**کات**

**هەمان بەیانیی دووەم ڕۆژی زستانی ١٩٩٤**

**یەعقوب لەسەر شاخەکە بەبرینداری دانیشتووە**

یەعقوب زۆر بێهێز بووەو لەسەر ئەم بەفرە دانیشتووە، لەبەر سەرما لەشی خاو بووەتەوەو خەریکە خەوی لێدەکەوێ، لەشوێنی خۆی چاوەکانی کردەوە هەستیکرد جگە لەبرینی گورگەکانی دوێنێ شەو چەند پارچە

مینێکیشی بەرکەوتووە! دەستی کوتا لەچەند شوێنێك جگە لەخوێنە وشك بووەکە خوێنی تازەشی پێوەبوو! بەهۆی سەرماکەش هەموو گیانی سڕ بووبوو، هەرچۆنێ بێت کەمێك خۆی بەرزکردەوە شوێنەکەی گۆڕیو لێی دانیشتەوە، پاڵی دابەدیواری ئەو ڕەبیە کۆنە.

لەبێهێزیو بێهۆشیدا دان بەخۆیدا ئەگرێو نایەوێو ناهێڵێ خەوی لێبکەوێ، چونکە خۆی کوڕی ئەو شاخو داخەیەو شارەزای سەرمای نێو بەفرە، ئەشزانێ کە مرۆڤ بەهۆی سەرما سەرجەم ماسولکەکانی لەشی خاو دەبێتەوەو خەو تەنگی پێهەڵئەچنێ، ئەشزانێ گەر بۆ چوار پێنج خولەك خەوی لێبکەوێ ئەوا جارێکیتر هەڵناسێتەوەو ئەم دنیایەش بەچاوی خۆی نابینێتەوەو هەر بەرەق بوونەوە گیانی دەرئەچێ، بۆیە زیاترو زیاتر بەزۆرو زۆر پێڵووەکانی هەڵئەبڕێو نایەڵی خەوی لێبکەوێ.

ئەوەتا لەسەر ئەم بەفرە دانیشتووەو تەماشای پێش خۆی دەکات، نزماییەکەی بەردەمی بەسیم چواردەوری گیراوە، لەودیویشەوە بەرەو خوارەوە گوندەکەی ماڵی مریەمی لێوەدیارەو بەئاواتی ئەخوازێ بگاتە یەکێك لەوماڵە گەرم‌وگوڕانە کەلەدوورەوە لوولەی سۆباکانیان ئەبینێ دووکەڵیان لێبەرز ئەبێتەوە، خۆ ئەگەر بگاتە ماڵی مریەم زۆری پێخۆشە:-

یەعقوب// (بەدەم وڕێنەی برینداریەوە) خۆ باوکیشی ئەمناسێ، لەماڵی خۆیان چارەسەریشم ئەکەن، بەخوا ئەگەر مریەم ئاوا ئەمبینێ! هەر خۆی ئەکوژێ! بەڵام ناهێڵم خەفەت بخوات.

دواتر سەیرێکی بەردەمی خۆی کرد، گورگەکە تەنها پارچە گۆشتو خوێنە سوورەکەی بەسەر بەفرە سپیەکەدا بڵاو بۆتەوە، ترسیشی لەمینەکان نەماوە چونکە هەرهەمووی تەقیوە، جارێکیتر تەکانێکی دایە بەرخۆی

تاهەڵسـێتەوە، دواتـر بەپـەنا دیـوارە روخاوەکـانی رەبیکـە خـۆی گرتـەوە، هەرچۆنێ بێت تاوێك بەپێوە وەستا سەیرێکی ناودێی کرد کەسی نەبینی، هەواکەشی زۆر سارد بوو، دواتر تەماشایەکی نزیکتری کرد کەناوەڕاستو دامێنی شاخەکەیە بەدیوی گوندەکەی ماڵی مریەم، لەوێ چەند کەسێکی بەدیکرد کەبۆی هاتبوونە پێشەوەو وردە وردە بۆی سەرئەکەوتن، ئەویش دەستەکانی بەرزکردەوە وەکو خۆنیشاندانو بەهاناهاتن بەدەست بانگی دەکردنو بەدەنگیش:-

یـەعقوب// (دەسـتی بـۆ ئـەو کەسـانە بـەرز کردبـووەوە کـە لەگوندەکـە هاتبوونـە پێشـەوە بـۆ زانینـــی دەنگ‌وباســـی ئـــەو تەقینەوەیـــە)
هێێێێیییییی‌ـــــی....ئـــــەوەتا لێـــــرەم....
هێێێێیییییی....ئەوەتاااااااااااااااااااام.

یـەعقوب بـەگاگۆڵکێ زیـاتر هەڵمـەتی ئـەبرد بـەرەو گوندەکـەی مـاڵی مریەم وردە وردە ئەهاتە خوارەوە، لەدواوەش دڵۆپەی خوێن بەسەر بەفرەکەدا ریزیان گرتبوو سوورێکی کاڵی پێشان ئەدا، یەعقوب تائەهاتـە خوارەوە هێزو توانـای کـەمتر ئـەبووەوەو رێچـکەی خوێنەکەشـی بـەدواوە بـوو، ئەوەنـدەی نـەمابوو بگاتـە نزیـك ئـەو پیاوانـە بەتـەواوی پـەکی کـەوتو لەسەر بەفرەکـە بەبرینـداری لێراکشـا! ئەوانـەی خـوارەوە یـەعقوبیان بـەدیکرد ئـیتر بەپەلـە بەرێچـکە بچـووکەکەدا بـۆی سـەرکەوتن تاگەیشـتنە لای بەتـەواوی هێـزی لێبڕابوو.

هــەموویان بەسەرسـەریەوە وەسـتاون، هەنـدێکیان ئەیانناسـیەوە، یەعقوبیش جەستەی سڕ بووە تەنها چاوەکانی ئەجووڵێ، دوای ساتێکی کەم وتووێژکردن هیچ وەڵامێکیشی لێ نابیستن، بەئەسپایی دەموچاوی لەبەفر پاك

ئەکەنــەوە، بەیەکــەوە دەســتو قاچــەکانی دەجــوولێنن بــۆ گــەرم بوونــەوەی، هەندێکیان قاچیو یەك دوانێکیشیان دەستەکانی ئەخەنە ژێر باڵی خۆیان بۆ گەرم بوونەوەی، دواتر دەست ئەهێنن بەسنگو پشتیدا بۆ گەرم بوونەوەی، ئەو پیاوانە زۆر خەریکی ئەم گەنجە عاشقو بریندارە ئەبن، ئەویش چاوەکانی نووقاوەو لەژێر پێڵووەکانیدا کەمێك ئەجوڵێ.

خۆیــان شــارەزای ئــەم ناوچــەیەن زۆرجــار بــەم شــێوەیە مرۆڤیــان لەرەقبوونەوە رزگا کردووە، زۆر جاریش لەسەردەمی رژێمی بەعسدا خەڵکی ئۆپۆزسیۆن بەناوچەکەی ئەواندا تێئەپەڕین بەرەو دەوڵەتی ئێرانو لەرێگادا بــەهۆی ناشــارەزایی ئــەو شــاخانە تووشــی رەق بوونــەوەو مــردن دەبــوون، ئــەوانیش زۆریــان لــەو کەســانە رزگــار کــردووەو بەرلــەوەی کــار لــەکار بــترازێ بەهانایان هاتوون.

بەیەکــەوە بڕیــاری هــەڵگرتنی ئــەم عاشــقە بریـنــدارە ئــەدەن بــەرەو گوندەکەی خۆیان.

- بەناوی خوا با هەڵیبگرین.

بەیەکـــــەوە هەڵیـــــدەگرنو بـــــەرەو گونـــــد دێنـــــە خوارێ...............

* * *

# هێلی گشتی بەردەوامە........

## کات

## هەمان بەیانیی دووەم رۆژی زستانی ١٩٩٤

## ناو گوندەکەی ماڵی مریەم دوای تەقینەوەکەی سەرشاخ

مریەم لەناو جێگەکەی خۆی هەر وەئاگایە، بەڵام ترێی بچکۆلە هێشتا لەپرخە بچووکەکان بەردەوامە، لەنێو جێگەوە روانینەکانی مریەم لەگەڵ درزکانی دەرگای ژوورەوە یەکتریان گرتووەو جیانابنەوە، یەك یەك تاڵەکانی رووناکی دەرەوەیان تیا ئەبڕژێ.

ئەم کچە لادێییە ئەوەندە بێهێز بووە، ئەوەندە دڵ تەنگ بووە، هەموو چرکەیەك چاوەڕێی هەنگاوێك یان تارماییەکی ئەودیو دەرگاکە ئەکاتو هەواڵێکی ناخۆشی بۆ بێنن، ئەم کیژە جوانە دڵی خەبەری داوە کەشتێك روویداوە، یان هەواڵێکی ناخۆش روو ئەکاتە گوندەکەیان، من ئەڵێم شتێکی زۆر سەیرو گرنگە کاتێك مرۆڤ لەدوورەوە هەست بەرووداوێکی نەبینراوو نەبیستراو ئەکات!! هەربەم شێوەیە مریم لەناو جێگەکە دانیشتووەو بەهیچ جۆرێك چاو لەدەرگاکە ناتروکێنێ.

بەواقووڕماوی لەژوورەوە دانیشتووەو چاوی بڕیوەتە درزەکانی دەرگای ژوورەکە، تانیوەی لەشی بەپێخەف داپۆشراوە بەڵام لەکەمەر بۆ سەرەوە هیچی پێوەنیەو قنج دانیشتووە، بەیانیەو چاوەڕوانی هەواڵێك یان هەرشتێکی تری یەعقوب دەکات، لەو سەرسامیەدا وون بووە تەنها بەجەستە لەنێو جێگەکەی دانیشتووە، دواتر وردە وردە پرخەکانی ترێ لەگوێچکەکانیدا ئەزرنگێتەوەو لەخەیاڵ دەریئەکەنو ئەیهێننەوە نێو ژوورەکە، هەر لەشوێنی خۆی سەری بۆ خوارکردەوە بینی ئەم خوشکە بچکۆلەیەی نوقمی نێو خەو بووە، زۆر دڵی پێی ئەسووتێ چونکە زۆری خۆش دەوێ، بیریشی لەوە

دەکردەوە دوێنێ شەو زۆر چاوەڕوانی ئەو شووشە عەترەی کردو تا درەنگ لەگەڵ مریەم مایەوە، هەربەو هیوایەش خەوی لێکەوت، ئەوەتا بەهۆی ماندوو بوونی دوێنی شەو تائێستاش خەبەری نەبۆتەوە، بەردەوام سەیری دەکات و لەدڵی خۆیەوە قسە بۆ ئەو خوشکە نازدارەی دەکات:-

مریەم// تری گیان....بەقوربانت بم، شەرت بێ عەترەکەی خۆمت بدەمێ، کەیەعقوب-یش دانەیەکی بۆ هێنای ئەویش بۆتۆ، (دەست ئەهێنێ بەسەرو قژیدا، ئەویش خەوی لێکەوتووە) بەقوربانت بم خوشکە بچکۆلانەکەم.

مریەم لەنێو جێگەکەی خۆی بەتەنیشت خوشکە بچوکەکەی دانیشتووەو بەدەستەکانی قژی بۆشی دەکاتەوەو بەردەوام بەبەزەییەوە سەیری دەکات، جارجارەش سەری دائەنوێنێتەوە ماچی دەکات، هەندێجاریش سەر هەڵئەبڕێ بۆ دەرگاکەو بەنێو درزەکاندا زەینەکانی ئاراستەی نێو حەوشەکە دەکات. بەڵام خەڵکی گوندەکە بەگشتی هێشتا خەبەریان نەبۆتوە تەنها ئەوانەی ئیش‌وکاریان هەیە خەریکی کارەکانیانن، لەوانەیە چەند شوانێکیش وەئاگابن بەڵام وەکو لەوە پێش ووتم ئەو جۆرە کەسان لەدەرەوەی هێڵی جووڵەی چیرۆکەکەی ئێمەن بۆیە ناویان ناهێنم و دەستنیشانیان ناکەم و با ئێوەش نەیانناسن.

*   *   *

## هێڵی گشتی بەردەوامە........

### کات

### هەمان بەیانیی دووەم ڕۆژی زستانی ١٩٩٤

### چەند پیاوێك لەسەر شاخەکە یەعقوب-یان بەکۆ هەڵگرتووەو

### بەرەو گوندەکەی ماڵی مریەم ئەیهێننە خوارەوە

پیاوەکان لەسەر ئەم شاخە وورده وورده دێنەخوارێ‌و یەعقوب-یان بەکۆڵ هەڵگرتووە، بەنۆرەش یارمەتی یەکتر ئەدەن، جارجارەش هەندێکیان دەست ئەهێنن بەدەم‌وچاویدا بۆ ئەوەی ئاگایان لێی بێت نەباداو خوانەخواستە شتێکی بەسەربێت. یەك دوانێکیان ئەم کوڕەیان هەڵگرتووەو ئەوانیتریش دابەش بوون لەپێش‌و پشتیان ئەڕۆن، بەڵام یەعقوب سات لەدوای سات گیانی سڕئەبێ‌و هەستەکانیشی بەرەو کزی ئەچن، جارجارە لەکاتی ڕۆیشتندا چاوەکانی ئەکاتەوە لەبەر بێ‌هێزی هەرزوو دایئەخاتەوە، کەسیشی نابینێ تەنها ئەرزێکی سپی بەبەفر داپۆشراو تەنانەت ئاسمانیش لەبەرچاوی سپی‌تر هەڵگەڕابوو، سەرلەنوێ ئەندێشەی گەیشتن بەمریەم بەرچاوی ئەم عاشقە شێت‌و بریندارەی گرتەوە دواتر ئەهاتەوە بەرچاوی:-

*　　*　　*

### جیابوونەوەی لقە جووڵە بەهێڵێکی باریکتر،

### دواتر زەینی بەدواداچوون دەگەڕێنمەوە بۆ سەر هێڵی گشتی........

ماڵی مریەم لەپاییزی ١٩٩٤جارێکی‌تریش دوای پرسەی کامەران‌و بۆ هەمان مەبەستی دڵدانەوەیان دوای ئەو کوڕە جوانەمەرگەیان بەمیوانی هاتبوون بۆ گوندەکەی ئەمان‌و لەماڵی یەعقوب بەکۆمەڵ دانیشتبوون، مریەم‌و ترێ لەگەڵ بەیان-ی خوشکی یەعقوب بەیەکەوە دانیشتبوون خەریکی چرپە

چرپی خۆیان بوون‌و سەرنجی ئەویشیان دابوو کەلەحەوشەکە خەریکی چەند کارێـك بـوو، لەگـەڵ مریـەم-دا جارجـارە نیگایـان ئەگۆڕیـەوە، کچـەکان هەرسـێکیان چـەند شـتێکیان لەبـەردەم بـوو ئـەیانخواردو لەگـەڵ جووڵـەی دەم‌وچـاویان لـەکاتی قسـەکردن زەردە خەنەیـەك ئەکەوتـە سـەر لێویـان، یـەعقوب-یـش لـەوێوە نیگـای دەرکـرد، دایـك‌و باوکی هـەردوولایان لـەولای ئەوانەوە بەیەکەوە دانیشتبوون خەریکی وتووێژی خۆیـان بوون‌و چاو شتی تریشیان ئەخواردەوە، خەمباری بەسەر دەم‌وچاوی هەردوو خێزان دیاربوو، بەدەم قسـەکردنەوە سـەرقاڵ بـوون، بـەڵام دەنگـی هـیچ کەسێك‌و هـیچ شتێك نەئەهاتە گوێچکەی یەعقوب، تەنها دەم‌و دەست جووڵاندنی مریـەم موزیکێکی زۆر ناسکی لای ئەو سازاندبوو.

مریەم پەتی خۆڕاگری پچڕاند هەڵسایە سەرپێ‌و بەرەو لای یـەعقوب ڕۆیشت، لەنێو حەوشەکە بەیەکەوە وەستان، ئەگەر بچیە پشتی ئەوان کـەمێك بەرزبیتـەوەو تێیـان بڕوانـی ئـەبینی لەئاسـۆی ئـەو دوو عاشـقەدا تـریێ‌و بـەیان بەیەکـەوە دانیشـتوون جارجـار سـەیری مریـەم‌و یـەعقوب دەکـەن، لـەولای ئەوانیشـدا دایـك‌و بـاوکی هـەردوولا دانیشـتوون‌و خـەریکی قسـەکردنن، گـەر دەم‌وچـاوی ئـەو دوو عاشـقە بهێنیتـە بەرچـاوی خـۆت‌و لەنزیکـەوە سـەیریان بکـەیت ئـەبینی مریـەم دڵنـەوایی ئـەم عاشـقە ئەداتـەوەو دووبـارە سەرخۆشـی برامردووەکـەی لێدەکات، ئـەویش لەسـەرەخۆ دەگریـاو چاویشـی پڕبووبـوون لەئاو ونووقاندبووی.

بـەڵام ئـەم هـەموو دیمەنانـە بـەبێ ورتەیـەو هـیچ دەنگێـك نابیسـترێ، بەڵکو کزە باساردەکە تێکەڵاو ئەبێت لەگەڵ ئەو موزیکە گوزارشتیەی لەلایـەن زەینـی خوێنـەرەوە پێـی ئەبەخشـرێ، وە لەگـەڵ ڕێوڕۆیشـتنی پیاوەکـانی خەڵکی ئەم گوندە تـەریب ئـەبێت کاتـێ لەسەر شاخەکە یـەعقوب-ی برینـدار

ئەهێننە خوارێو هەر بەم شێوەیە لەرۆیشتن بەردەوام بوون تاگەیشتنە ناو مزگەوتی دێ.

*      *      *

## گەڕانەوە بۆ سەر هێلی گشتی........

لەنێو مزگەوت ئەم کوڕە برینداره‌یان لەنزیك سۆبا دارەکە دانا و چەند ساتێك بەبێدەنگی بەسەرسەریەوە بوون، هەندێکیان دانیشتبوون ئەوانی‌تریش بەپێوە وەستابوون، چەند پیاوێکی پیریش بەچواردەوری سۆباکەوە دانیشتبوون‌و دوعای خێریان بۆ ئەم گەنجە بریندارە دەکرد، دەمیان دەجوولاندو دەستەکانیان بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمان کە هەموو ئەمانە ئاماژە بوون بۆ دوعای خێر بۆ ئەم کوڕە بریندارە. چەند پیاوێکی پیریش تازە لەنوێژکردن ببوونەوەو یەکسەر هەستان هاتنە نزیك ئەم تەرمە لەخوێن هەڵکێشراوە، یەکێ لەو پیرانە مام خدری باوکی مریەم بوو، زۆر بەحەپەساوی سەیری دەکردوو بەپێوە بەسەر سەریەوە وەستابوو! دواتر بەخێرایی چووە دەرەوە.

ئەوانەی چواردەوری وردە وردە جلە تەڕەکانیان لەبەر داکەند، دەستێ جلی کوردی تریان لەناو خۆیاندا بۆ پەیداکردو کردیانە بەری، دواتر بەدیاریەوە دانیشتن تاگەرمی دەبێتەوە، هەروەها چاوەڕێی چاوهەڵهێنانیشی دەکەن، دووبارە پیاوەکان دەست ئەکەن بە شێلانی دەستو قاچی یەعقوب بۆ گەرم بوونەوەی، یەکێکیان کتری سەر سۆبا دارەکە دائەگرێو کەمێك ئاوی گەرم ئەخاتە پیاڵەیەك‌و لەپشت سەری ئەو کوڕە عاشقە دائەنیشێ، وردە وردە بەکەوچك ئاوە گەرمەکە ئەکات بەدەمی یەعقوب بۆ ئەوەی ناو سکی پێی گەرم بێتەوە، کە ئەیبینن ئاوەگەرمەکە ئەچێتە خوارەوەو لەکاتی قووت دانیدا

جوڵەی قورگی بەرزو نزم ئەبێت هەرهەموو سەیری یەکتر دەکەن و زەردخەنە ئەپەرێتە سەردەم وچاویان و زۆر دڵیان پێی خۆش دەبێت، چونکە ئەمە نیشانەی زیندوویی ئەو کەسە دەرئەخات بەڵام بەهۆی سەرماکەوە بێهێز بووەو توانای هەڵسان و قسەکردنی نیە، ئەوانیش شارەزاییان لەم جۆرە حاڵەتانە هەیە چونکە لەناوچەکەی ئەوان لەکاتی زستاندا زوو زوو شتی ئاوا روو ئەدات.

## هێلی گشتی بەردەوامە........

### کات

### هەمان بەیانیی دووەم رۆژی زستانی ١٩٩٤

### لەم گوندەو لەژوورەکەی مریەم

مریەم بەهەمان شێوەی پێشوو بەقنجی دانیشتووە، ترێ هێشتا لەخەو هەڵنەستاوە، ئەم کچە عاشقە بەبێ دەنگی بەنێو ژوورەکەدا ئەڕوانێ، بەغوربەتەوە سەیری هەموو کەل وپەلێك دەکات، هەروەها سەیری ترێ ئەکات وەکو بیەوێ ماڵئاوایی لەهەموو شتێك بکات، لەخوشکەکەی، لەژوورەکەی، لەئاوێنەکەی، لەشووشە عەترەکەی بەردەمی ئاوێنەکە. چاوەکانی زیاتر زەق بوونەتەوە! سەرسوڕمانی پێوە دیارە! رەنگی سپی هەڵگەڕاوەو بەتەواوی سام وترسی مردووی لێنیشتووە، ئەڵێی لەدونیایەکی ترەوە هاتووەو هەڵسوکەوتی لەمرۆڤی لای خۆمان ناچێ. جارجار روو وەردەگێڕێ بۆ سەرینەکەی وەك بیەوێ پاڵ بکەوێ بەڵام هیچ ناکات و دووبارەو سێبارە وەك نامۆبێت بەژوورەکە ئاوا سەیری سەرجەم شتەکان دەکات! یان ئەیەوێ ترێ خەبەر بکاتەوە قسەی بۆ بکات! دەستی بۆ ئەبات و دواتر روودەکاتەوە بەردەمی خۆی و هیچیش ناڵێ. زۆرترین کات چاوی بڕیوەتە درزی دەرگاکەو

هیچ تارمایی و سێبەری هیچ کەسێکیش لەودیو بەدیناکات، زیاتر تێیان ئەڕوانێ وەکو هەرئێستا ئەبێ شتێك ببیستێ وادیارە بەڵام ئەمەشیان ئاکامی نەبوو بۆیە لەم ژوورە نیمچە تاریکەو بەواقووڕمای لەسەر جێگەکەی خۆی بەتەنیشت خوشکە خەولێکەوتووەکەی دانیشتووەو ئەبڵەق بووە.

*　　*　　*

## هێلی گشتی بەردەوامە........

## کات

## هەمان بەیانیی دووەم ڕۆژی زستانی ١٩٩٤

## لەمزگەوتی ئەم دێیەو قسەوباسی خەڵك ئەم گوندە

یەعقوب لەنێو مزگەوت چاوی کردەوە....!

چەند کەسێك بەسەرسەریەوە وەستاون و خەریکی پاککردنەوەی برینەکانی بوون، وردە وردە خەڵکی ئاوایی لێی کۆبوونەوەو ناو مزگەوت پڕبوو لەپیاوی دێ، دەنگ وباسی تەقینەوەکەی ئەم بەیانیە بەناو گوندەکەدا بڵاو بووەوە، سێ‌سێ و چوارچوار پیاوان ئەهاتن بۆ مزگەوت سەیریان دەکردو ئەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان، هەندێکیشیان ئەیانناسی، چەند پیاوێکیش بەدیاریەوە وەستان و نەڕۆیشتنەوە.

لەناو دێ مقۆمقۆ پەیدا بوو! چەندین پیرەمێردو پیرێژن و گەنجانیش لەکۆڵانەکاندا بەیەك ئەگەیشتن، هەندێکیان لەمزگەوت ئەگەڕانەوە ئەوانی‌تریش بەرەو ئەوێ ئەهاتن لێیان ئەپرسین:-

- ئەرێ کێ مردووە؟
- داماوێکە....کەوتۆتە سەر مینەکانی ڕەبیەکەی سەرەوە!

- ماوه؟!
- وەڵڵا وابزانم ماوه!
- کوره بەخوا نوتقی لێبڕابوو!....ماوی چی!
- ئەرێ چەند کەس پێوەبوو؟!
- هەر یەك کەسە!
- کێیە؟!
- تاقە کورەکەی مەلا عەلی ئەودیوە!

* * *

## هێلی گشتی بەردەوامە.........

### کات

### هەمان بەیانیی دووەم ڕۆژی زستانی ١٩٩٤

### لەم گوندەو لەژوورەکەی مریەم

تریێ خشپیلە بەتەنیشت مریەم وەئاگاهات، چاوەکانی کردەوە، لەنێو جێگەکەیەوە کەمێك خۆی لێك کشاندو بەیانی باشی لەخوشکی کرد، بەڵام مریم بەئاستەم نوزەی ئەهاتو بەوردی وەڵامی دایەوە، هەرلەناو جێگەکەوە تریێ باوەشی پیاکردو ماچی کرد، بەڵام ئەو ئاگای لەخۆی نەبوو تەنها بەجەستە لەو ژووره بوو هەرچی هەستو هۆشی هەبوو بەسەر شاخەکەوە بوو وبەچواردەوری ڕەبیەکە ئەسوڕایەوە، سەیرێکی حوشکە بچووکەکەی کردو دەستی بۆ شووشە عەترەکەی ژوورەوە راکێشا، ئەویش بەسەرسوڕمانەوە لێی ئەڕوانی و لێی تێنەدەگەیشت:-

مریەم// (دەستی بۆ شووشە عەترەکە راکێشاو زۆر بەکزی قسەی کرد) بۆ تۆ.

تـریَ// مریـەم گیـان بـەقوربانت بـۆ وانەکـەی؟! چـی بووە؟!

مریـەم// (دووبـارە دەسـتی بـۆ شـوێنی بەرئاوێنەکـە ڕاکێشایەوە).

تری لێی نەدەگەیشت کە ئەم خوشکە گەورەیەی بۆ وانەکات؟ مریەم وەکو هەرکەسێکی‌تری ئەم گوندە شارەزای مینەکانی چواردەوری ئەم ڕەبیە کۆنەی زەمانی بەعس بوو، ئەشیزانی ئەم تەقینەوەی ئەم بەیانیە لەویَ بوو، ئەتووت لەخواییەوە پێیان ڕاگەیاندووە تەقینەوەکە بەر یەعقوب کەوتووە یان دڵی عاشق زۆر هەستیارەو هەواڵی لەناوچوونی دڵدارەکەی پێگەیشتووە، یان لەئیلاهیەوە بۆیان دانراوە کەنامراد بن‌و دوو دڵداری ئەم ناوچەیە بەیەکتر نەگەن، ئەم هەموو هەواڵە بەبیری مریەمدا گوزەریان دەکرد بۆیە بەمەلوولیەوە چاوەکانی هەڵفڕیبوون‌و بەسەر دیوی ژوورەوەی دەرگاکەدا نیشتبوونەوەو خزابوونە نێو درزەکان‌و ئەیویست لەوێوە هەواڵ‌و دەنگوباسی یەعقوب بزانیَ بۆیە نەیدەتوانی بەجوانی وەڵامی تریَی خوشکە بچووکی بداتەوە.

تریَ// (ماچی مریەم دەکات) مریەم گیان بەقوربانت بم، ئەمە چیتە؟! شەو یەعقوب هات؟! (پێئەکەنیَ‌و دەستی بەسەریدا ئەهێنیَ).

مریـەم// (هـیچ ناڵـیَ بەحەپەسـاوی سـەیری تـریَ ئـەکات‌و جارجـارەش چـاوەکانی ئەگوازێتـەوە بـۆ شوێنێکی‌تری ژوورەکە).

تـریَ// مریەم گیان چی بووە؟! دە قسە بکە (تۆزیَک خۆی گرژ دەکات).

تریّ بەمشێویە پرسیاری لەخوشکەکەی دەکردو ئەویش بەمشێوەیە نوقمی خەیاڵ بووبوو، لەنێو حەوشەکەدا گوێیان لەدەنگی مام خدری باوکیان بوو قسەی بۆ دایکیان دەکرد، تەنها منگە منگ بوو لەهیچ ووشەیەك حاڵی نەدەبوون، مریەم بەهیچ شێوەیەك وەڵامی تریّی نەدایەوە هەر لەناو جێگەکەوە بەبێ هێزی گوێی هەڵخست بوو بۆ دەنگو قسەکانی دایكو باوکی بۆ ئەوەی چەند ووشەیەکی دەست بکەویّ نەوەکو ئەوەی ئەو بیری لێدەکاتەوە سەبارەت بە یەعقوب راست بیّو رەنج بەخەسار بێت، دوای چەند چرکەیەك لەحەوشی ماڵی مریەمو لەکوڵانیش دەنگەکان زۆر بوونو خەریك بوو ووشەکانی دەم خەڵك دەرئەکەوتنو سات لەدوای سات روونتر دەبوونەوە.

تریّ-ش هەر دڵنەوایی مریەمی ئەدایەوە تاوەکو خوشکە گەورەکەی خەفەت نەخوات، بەردەوام دەستی دەکردە ملیو زۆریشی خۆش دەویست چونکە وەکو دوو هاوڕیّ وابوون، دوای ئەو هەموو هەوڵدانەی تریّ بۆ ئەو خوشکەی هەر لەناو جێگەکەوە مریەم بەبێزاری ولەسەرەخۆ بەئاماژەی دەست داوای لەتریّ کرد کەکەمێك بێدەنگ بێت تابزانیّ ئەو دەنگە دەنگەی دەرەوە چیە؟! بەدەستە بێهێزەکانی ئاماژەی بۆ دەرگاکە کرد، دواتر وەك مرۆڤێکی بێگیان بەتەپەیەکی خێرا دەستی کەوتەوە سەرکۆشیو جێگاکەی.

تریّ// (بەسەرسامیەوە لەو خوشکەی روانیو کەبۆچی ئاوا بێهێزە؟! لەگەڵ ئەوەشدا پێی ووت)

مریەم گیان دوو دڵ مەبە ئەمە دەنگی باوکمە....تازە لەمزگەوت گەڕاوەتەوە.

مریەم// (زۆر لەسەرەخۆ لەو خوشکەی ئەڕوانیو بەدەست ئاماژەی بۆ بێدەنگی دەکرد).

تریَ–ش یەکەسەر بەبیَ دواکەوتن بەقسەی کردو هەردوکیان بەبیَ دەنگ هەستیان لەخۆیان بڕیبوو وگوێیان گرتبوو بۆ قسەکانی دایكو باوکیان لەنێو حەوشەکەدا، تریَ–ش وەکو ئەو خوشکەی زەینەکانی خستە نێو درزی دەرگا دارەکە بەڵام مریەمی دولبەر زۆرترو زیاتر پەرۆشی بیستنی هەواڵ بوو، لەوە ئەترسا ئەو کوڕە شێتە شتێکی لێبەسەرهاتبیَ:–

مام خدر// (دوای گەڕانەوەی لەمزگەوت لەحەوشەکە وەستاوەو قسە بۆ هەیبەت–ی ژنی دەکات)
لەمزگەوت پاڵیان خستووە! خۆی شارەزای ناوچەکەیە!....بۆ وای لێهات؟!

ماڵەکەی مام خدر لەمزگەوت نزیکە بۆیە دوای بینینی یەعقوب زوو گەڕابووەوە، ئەوەتا لەگەڵ هەیبەت–ی ژنی لەنێو حەوشەکەی خۆیان وەستاون، بەم بەیانیە بەسەر دیوارە نزمەکەی ماڵەکەیان سەیری مزگەوت دەکەن، دوای بیستنی هەواڵی ئەو تەقینەوەیە دەستە دەستە پیاوان بەرەو ئەویَ دەڕۆن.

هەیبەت// (دوای حەپاساوی) خدر....کیَیە؟!
مام خدر// وەللهی....! هەیبەت! بڵێم....! کیَیە!
هەیبەت// (دێتە نزیکی) کیَیە؟!

لێرەدا روئیای خوێنەر لەبەردەمی مام خدرو پلکە هەیبەت لەنێو حەوشەکە بەکێش دەکەم، موزیکێکی گوزارشتی زۆر کز لەگەڵ دەنگەکانی ئەو ژن‌ومێردە بەدرزەکانی دەرگای ژوورەکەی ئەو دوو خوشکەدا ئەبەمە ژوورەوەو بەسەر دەم‌وچاوە سڕو تێکچووەکەی مریەم–دا ئەیگێرسێنمەوە! تریَ–ش حەپەساوی واقوڕمانەکەی خوشکە گەورەکەیەتی، ئەو موزیکە کزەش هەربەردەوامەو دووبارە تێکەڵاو بەگریان‌و قسەکانی مام خدر ئەبێت.

مام خدر// (کەمێك ئەگری) چی بڵێم هەیبەت؟!

مریەم لەدرزەکانەوە گوێی لەدەنگی باوکی بوو بەدەم قسەکردنەوە ئەگریا! بەڵام دوای گریانەکەی ئەیەوێ ناوی مردووەکەش وەربگرێ! بزانێ کێیە! بزانێ چۆن بووە! ووڕ ووڕ لەناو جێگەکە دانیشتووەو سەیری دیوی ژوورەوەی دەرگاکە دەکات! ترێ-ش بەتەنیشتیەوە دانیشتوە سەیری ئەم خوشکەی دەکات، دواتر دەست ئەبات بۆ سەرو لاملی خوشکە گەورەکەی، ئەیەوێ ماچی بکات، ئەیەوێ لەباوەشی بگرێ، بەڵام مریەم بەبێ دەنگ بەدەستەکانیی ترێ لەخۆی دوور ئەکاتەوەو جارێکی تریش گوێ شل ئەکات بۆ قسەکانی دایكو باوکی، بەردەوامیش ووشەکان بۆی دێنە ژوورەوە بەڵام لێیان تێناگات چونکە هەمووی بەتێکەڵو پێکەڵی بەرگوێی ئەکەون.

ئەگەر بگەڕێنەوە دەرەوە لەنێو حەوشەکە سەیری مام خدر بکەین بەچ شێوەیەك قسە بۆ هەیبەتی هاوسەری ئەکات! چۆن چۆنی لەگەڵ قسەکردنیدا ئەگری! چۆنیش ناو وهەواڵی مردنی یەعقوب بەژنەکەی رادەگەیەنێ! ئەگەر سەیری پلکە هەیبت بکەین چۆن گوێی گرتوە بۆ مێردەکەی! کاتێ هەواڵی مردنی یەعقوب ئەبیستێ! چۆن هەردووکیان بەجووتە ئەگرین بۆ ئەو لاوە! چونکە ناسیاویان لەگەڵ سەرجەم خێزانەکەی ماڵی یەعقوب-دا هەیە هەروەها ئەو کوڕەش تاقانەیەو لەچوار برا هەرخۆی ماوەتەوە بۆیە زۆر بەپەرۆشن بۆی، بۆیە ئەگرین.

پلکە هەیبەت// خدر بۆ قسە ناکەی؟! بۆ پێمناڵێی کێیە؟!

مام خدر// بڵێم چی؟! (لەپڕ لەپرمەی گریان ئەدات) یەعقوبی کوڕی مەلا عەلی! (دەست بۆ گوندەکەی ئەودیو رائەکێشێ).

دوای بێدەنگ کردنی تریێ لەلایەن مریەم، دوای کش‌وماتبوونی ژوورەکەی مریەم، ئەم هەواڵە جەرگبڕەی دەمی مام خدر بەزووترین کات گەیشتە بەردەرگای ژووری ئەو دوو خوشکە جوانکیلەیە! بەشەرمەوە، بەترسەوە! بەناچاری خۆی خزاندە ئەودیو ژوورە تازە رووناك بووەکەو کەوتە سەرجێگەی خوشکان.

ئاخ....لەو ساتەوەختەی ئەم ووشەیە بەرگوێ مریەم کەوت! ئەم کیژە عاشقە کەناوی یەعقوبی بیست یەکسەر لەناو جێگەکەی راتەچڵەکێ‌و لێی هاتە دەرێ! تاگەیشتە بەردەرگای ژوورەکە بەرچاوی تاریك بوو، بەدەستەکوتێ دەرگاکەی کردەوەو لەوێ وەستا! حەوشەکە یەك پارچە بەفر داپۆشیوە، بایەکی ساردیش بەسەر قاچەکانی مریەم-دا بەژووریێ کەوت، رووناکیش تاریکی ناو ژوورەکەی دڕی‌و ناو جێگەی هەردووکیان‌و دیوارو کەل‌وپەلی نێو ژوورەکە کەمێك سارد بوونەوە، تەنانەت تریێ دەستەکانی لە سنگی‌خۆی ئالاندو زۆر چاك هەست بەهەوا ساردەکە ئەکات، دواتر کەمێك پێخەفەکە رائەکێشێتە سەرخۆی بۆ ئەوەی لەش‌ولارە گەرمەکەی لەو ساردیە بپارێزێ.

مریەم لەنێو دەرگاکە وەستاوە وردە وردە بەرچاوی روون ئەبێتەوە، وەکو تریێ هەست بەسەرما ناکات چونکە نەك جەستەی بەڵکو مێشکیشی سڕ بووە، هەرلەوێوە سەیری دایك‌و باوکی دەکات لەبەردەمی ژوورەکەی تر بەم بەیانیە بەیەکەوە وەستاون‌و قسە ئەکەن، ئەبینێ هەردووکیان دەستەکانیان لەیەکتر ئالاندووەو خەم دایگرتوون! ئەیبینی باوکی فرمێسکەکانی ئەسڕێ، هەردووکیان بەشێوەیەکی زۆر غەمبار وەستاون تەنانەت ئەگەر گوێی لەمردنی یەعقوب-یش نەبوایە! ئەوا بەبینینی دەم‌وچاوی دایك‌و باوکی‌دا ئەیزانی کەکارەساتێکی ناخۆش روویداوە.

تریێ لەژوورەوە لەناو جێگەکەی خۆی دانیشتووە، خۆی گرمۆڵە کردووە، کەمێك رووناکی حەوشەکە هاتۆتە نێو ژوورە تاریکەکەیان، خەریکە ژوورە گڵەکەیان زۆر سارد ئەبێتەوە، لەدواوە سەیری مریەم ئەکات‌و چاوەڕێیە بێتە ژوورەوەو دەرگاکە دابخات، تا کەمێکی‌تر خۆی بخاتەوە نێو پێخەفەکان‌و گەرمی بێتەوە، هەواڵی ئەم وەستانەشی لێبپرسێت، بەڵام هەر بەم شێوەیە تریێ لەژوورەوە دانیشتووەو چاوەڕێیە.

مریەم لەبەردەرگای ژوورەکە وەستاوە، لایەکی سنگی خستۆتە سەر دەرگاکە تاکو یارمەتی وەستانە بێهێزەکەی بدات کەرووەو دایك‌و باوکی وەستاوە، دەرگاکەش بەهۆی ئەو کیژە عاشقەوە کراوەتەوە ئەگەرنا بەبێ دەستلێدان خۆی بەجیڕەجیڕ دائەخرێتەوە، لەوێوە بەسەر دیوارە نزمەکەی ماڵی خۆیاندا چاوێك هەڵئەبڕی بۆ کۆڵان چەند پیاوێك ئەبینێ بەپەلە ئەڕۆن بەرەو مزگەوت، چەند گەنجێکیشی لێوەدیارە بەڕاکردن بەرەو ئەوێ ئەڕۆن! گوێی لەوگەنجانە بوو بەدەم ڕاکردنەوە ئەیانووت:-

- مردووە؟!
- نازانم! بابچین سەیری بکەین!
- ئەرێ بوەستن منیش دێم بۆ مزگەوت.
- تۆزێ خێراکە....بەڵکو نەمردبێ بافریای بکەوین!

لێرەدا موزیکە گوزارشتیەکە ئەپچڕێت، سکرینی خوێندنەوە تەنها واق ووڕمانی ئەم کچە عاشقەی لەسەر وێنا کراوە، مریەم کەگوێی لەم هەموو قسانەو مردن‌و نەمردن ئەبێت خەریکە ئەبوورێتەوە، خەریکە ئەمرێت، ئەوقسانەن کەئەو رقی لێیانە، ئاوات بەمەرگی خۆی ئەخوازی نەك گوێگرتن لەو ووشانەی چواردەوری مەرگی یەعقوب-یان داوە.

لەولاترەوە چەند پیاوێکیتر ئەبینێ رائەکەن بەرەو مزگەوت! ئەوانیش هەمان وتووێژ ئەکەن‌و باسی مردن‌و ژیانی ئەو کوڕە عاشقە ئەکەن! ئەویش لە ناو ئەو دەرگایە وەستاوە ئەوەندەی نەماوە گیانی دەرچێ، هەرچەند دەستە دەستە پیاوان ئەبینێ بەرەوماڵی خوا رائەکەن ئەو زیاتر لەبوورانەوەو گیان دەرچوون نزیك ئەبێتەوە.

خۆ منارەی مزگەوتی بەچاکی لێدیارە کەمێکیش دیواری حەوشەکەی ئەبینێ‌و چەند پیاوێکیش لەوێ دوو دوو سێ سێ وەستاون‌و قسە ئەکەن بەڵام نەگوێی لەوتووێژیانە نەئەتوانێ‌و نەئەبێ ئافرەت بچێ بۆ مزگەوت کەشوێنێکە بۆ پیاوان، تەنهاو تەنها سەری پیاوەکانی لێوەدیارەو ئەشزانێ خەریکی ئەو کوڕە عاشقەن، بەڵام هێشتا بەتەواوی بۆی روون نەبۆتەوە کە یەعقوب لەمزگەوتە؟! یان نا! مردووە؟! یان نا! خۆ ئەو گوێ لەباوکی بوو چۆن ئەو هەواڵەی بەدایکی رائەگەیاند بەڵام کەمی تەمەن‌و باوەڕ نەکردن بەدڵ‌و حەزەکانی خۆی‌و خەستیی خۆشەویستیەکەی هۆکارن بۆ ئەوەی بەهیچ شێوەیەك مردنی یەعقوب قەبوڵ نەکات، یان وەکو رای خۆی مردن بۆ یەعقوب دانەنرابێت‌و لەهەموو ساتێکدا ئامادەبێت خۆی بکات بەقوربانی ئەو کوڕە سەرکێشە، هەرچەندە عاشق زۆر هەستیارە و بەهۆی دڵە بێ سیمەکەی هەواڵی مەرگێکی پێگەیشتووە.

مریم لەناو دەرگای ژوورەکەی خۆی وەستاوەو ئەو هەموو رووداوانە تاوتوێ دەکات‌و ترێ-ش لەژوورەوە لەدواوە بەسووکی هەربانگی خوشکە عاشقەکەی دەکات‌و لێی ئەپرسێ:-

ترێ// مریەم گیان ئەوە چیە؟

مریەم// ............

ترێ// توخوا بۆ لەوێ وەستاوی؟

مریەم// ............

تریَ// ئەری بۆ وەلامم نادەیەوە؟ دەوەرە ژوورەوە،

بەسە ئیتر.

مریەم-یش بۆ زانینی دوا هەواڵو دڵنیا بوون لەیەعقوب زەینەکانی ئاڵۆز بوون، وەك لاشەیەکی بێگیان بەپێوە وەستا بوو، شانو سنگی دابووە لاینێی دەرگاکەو هەرلەوێوە چاوی بڕیە دایكو باوکی، زۆر کزو هێمن بوو، هەرچی ئەندامە هەستیارەکانی لەشی هەبوو هەر هەمووی کزبووبوون، لەباری ئاسایی کەمتر درکی بەشت دەکرد، بەلام چاوەکانی لەکارکردن نەوەستابوون....هەر لەنێو دەرگاکەوە بەمەلوولیەوە ئەیڕوانیە دایكو باوکی تا بزانیَ هەواڵی مردنی دڵدارەکەی راستە یان چی؟!

دایکی مریەم خۆی ئەکوژیَو ئەبڕیَو لە خدری مێردی نزیك ئەبێتەوە هەواڵی یەعقوبی لێئەپرسیَ، مێردەکەشی لە ژنەکەی زیاتر پەشۆکاوە چونکە ئەزانن ئەو کوڕە تاقانەیەو پێشخۆی سیَ برایتری تیاچوون، هەموو ئەو پرسیارو وەلامانەی دایكو باوکی بەکزیو دەنگێکی نزم دێتە گویَی ئەم کچە شێتە، تەنها جوولەی دەستو دەمیان دەبینی، ئەگینا بەچاکی لەووشەکان ئاگات.

* * *

بالێرەدا موزیکێکی ناسكو غەمبار بکەین بەبەرگی ئەم دیمەنە ناسکە بۆ ئەو کیژە ناسکە، لەسەرەخۆ شێوەی وەستانو ئامادەکاریی هەستی بینینی مریەم لەگەڵ ئەو موزیکە گونجاوە تێکەڵاو بەیەکتر بەجێبهێڵین وردە وردە کامیرای روئیامان بگوازینەوە نزیك مام خدرو هەیبەتی هاوسەری تابزانین چۆن باسی ئەم بەسەرهاتە دەکەن، بەشێوەیەك لەودیویان بوەستین تالەئاسۆی ئەواندا لەدوورەوە مریەم-مان لێدیار بێت چۆن لەبەر دەرگای

ژوورەکەی خۆی وەستاوەو سەیریان دەکات، ناو حەوشەکەش یەک پارچە بەفرە.

هەیبەت// چۆن تووشی ئەو مینانە بووە؟!

مام خدر// (سەری داخستبووو هەندێجاریش لەوێوە سەیری ناو مزگەوتی دەکرد).

مریەم// (لەدوورەوە دیارە بەبێ هێزێ ئەیروانیە دایکو باوکی و بەئاستەم گوێی لەووشەکان دەبووو زۆریش لێی حاڵی نەدەبو).

هەیبەت// بەم بەیانیە لەوێ چی دەکرد؟!

مریەم// (بەبێ هێزێ ئەیروانیە دایکو باوکی و بەئاستەم گوێی لەووشەکان دەبووو زۆریش لێی حاڵی نەدەبو).

هەیبەت// خۆ هەر هەمووومان شارەزای ئەم رەبیە کۆنەین! رەبی سەدام پارچەپارچە کرێ.

مریەم هەرلەوێ وەستاوەو جارجارەش بەرچاوی تاریک ئەبووو جووڵەی دەستو دەمی دایکو باوکی بەڵێڵی ئەبینی و کاتی واش هەبوو هەردووکیانی لەبەرچاو وون ئەبوو! سەرێکی رائەتکاندو وجارێکیتر هەردووکیان بەدەم جووڵەی دەستو دەمیان ئەهاتنەوە بەرچاوی.

ترێش لەژوورەوە هەرچاوەرێی ئەو خوشکەی دەکات تاکو بێتە ژوورەوەو دەرگاکە دابخات بۆ ئەوەی لەو هەوا ساردە نەجاتی بێت، هەروەها ئەو هەواڵەش بزانێ کەمریەم گوێی لێگرتبوو.

مام خدریش هیچ وەڵامێکیتری پێنیە بۆ ژنەکەی، بەحەپەساوی لەحەوشەکەی خۆیان سەیری مزگەوت ئەکات، بەچاوێکی پڕ لەفرمێسک

ئاوێتەی راکەراکی پیاوان بووە کەبەرەو ئەوێ ئەڕۆن، هیچ ئاگاشی لە مریەم-ی عاشق نیە چۆن و بۆ لەوێ وەستاوە.

هەیبەت// کورم بەم بەیانیە تۆ لەو شاخە چی ئەکەیت؟!

مام خدر// (بەبێ هێزی سەیری ژنەکەی دەکات) مەلا عەلی هەرتەنها ئەو کوڕەی مابوو.

مریەم// (چرکە دوای چرکە رەنگی مردووی لێدەنیشت).

هەیبەت// دەك دایکت بمرێ رۆڵە.

مریەم// (ئەوەندەی‌تر تێك چوو).

مام خدر// مەلاعەلی ئەم هەواڵە ببیستێ ئەمرێ.

مریەم// (تەنها ئەوەندە مابوو گیانی دەرچێ، خەریکە چیتر بەپێوە خۆی بۆ ناگیرێ).

دایك و باوکی مریەم سەرقاڵی هەواڵی یەعقوب بوون ئاگایان لەمریەم نەبوو لەولاوە لەبەردەمی ژوورەکەی خۆی سەیریان دەکات.

مام خدر// (بەگریانەوە) خەڵکی خۆمان چووبوون بەبرینداری لەسەر شاخەکە هێنابویانە خوارێ.

هەیبەت// هەرمابێ! چش لەبرینداری.

مام خدر// (هەناسەیەکی هەڵکێشا!!!!!).

مریەم-یش کەلەولاوە وەستاوە، لێرەدا لەو چەند ووشەی دوایی تێکەیشت! چاکیش ئەزانێ مەبەست لەم ووتووێژە مان و نەمانی ئەو کوڕە شێت و سەرکێشەیە، گوێی بۆ قسەکانیان گرتبوو، سەرقاڵی ئەو هەناسە قووڵەی باوکی بوو! ئەیویست کاردانەوەکەی بزانێ کەپەیوەستە بەمان و

نەمانی یەعقوب-ی گەنج، یەعقوب-ی دڵداری، یەعقوب-ی رۆحی، یەعقوب-ی سوارچاکی خەونەکانی گەنجێتیی ئەو کچە لادێییە جوانو وردیلەیە، ئەو لاوە عاشقە هەموو شتێکە بۆ مریەم.

*       *       *

لێرەداو لەچوارچێوەی دیزاینی گێڕانەوەو نەخشەسازی دارشتنی ئەم چیرۆکەمدا، وەڵامی مام خدر بۆ هەیبەتی ژنی:- ووشەی مردنی یەعقوب بوو کەبەرگوێی مریەم-یش کەوت. هەرلەسەرەتای دامەزراندنی بناغەی ئەم دەقە ئەدەبیەم وام دانابوو بەیانی دووەم رۆژی زستانی ساڵی ١٩٩٤ مریەم هەواڵی مردنی یەعقوب ببیستێ، تاکو لەسەر هێڵی کارای گشتی دارشتندا، یەعقوب لەزەینی مریەم-دا مردبێ، من مردنی یەعقوب-م مەبەستە بۆ ئەوەی کاردانەوەی ئەم هەواڵە جەرگ بڕو ناخۆشە بەشێوازێکیتر لەچوارچێوەی کەسێتی مریەم-دا بەکۆتا بگەیەنم.

*       *       *

مـام خـدر// (هەناسـەکەی دایـەوە) کـەمن لەنوێـژ

بوومەوە گیانی دەرچوو بوو!

هـەیڕۆ........هـەیڕۆ........ئەگـەر ئـەم دیمەنـە لەسـەر سـکرین ببینرێـت!!!!! ئـاخۆ بەبیسـتنی ووشـەی (گیـانی دەرچـوو بـوو!) چ جـۆرە مـوزیکێکی گوزارشـتی ئەچـێتە نـاخی مریـەم! چـۆن دەموچـاوە وردیلەکـەی ئەبلـەق ئـەبێت! چـۆن دەم دائەچـەقێنێ! چـۆن چاوەکانی زەق دەکاتـەوە، ئـەی چۆن توانای گرتنی رۆحی خۆی هەیە تا دەرنەچێت؟!

دەبا هەموومان ئەگەر کەمێکیش بێت بەشداری شینو هاوغەمی مریەم بین تاهەست بەئازارەکانی ئەو کیژە جوانە بکەین، باکەمێك بگرین تاخۆمان

لەئازار بشۆینەوە، باتوزێك ئاخی بۆ هەڵکێشین نەبادا ئەویش دوای هەواڵی مردنی دڵدارەکەی شتێکی لێبەسەربێت.

ئای لەو رۆژانەی دڵی دولبەر هەست بەمردنی پێشوەختی دڵدارەکەی دەکاتو مەراق دایئەگرێت.

ئای لەوساتانەی مرۆڤ هەواڵی مردنی ئازیزان ئەبیستێ پەشۆکاوی دڵو هەستو بیر دایئەگرێت.

ئای لەوکاتانەی مردنی دڵ رەق بەبێ ترس یەخەی خۆشەویستان ئەگرێت.

کاتێ مریەم-ی دولبەر ووشەی گیان دەرچوونی یەعقوب-ی بیست ئەوەندەیتر ووشك بوو! روخساری لەبەفرەکەی بەردەگای ژوورەکەیان سپیتر هەڵگەڕا، گەرمی لەلەشیدا نەما، لاشەیەکی بێ هەست گەڕایەوە دواوە بۆ سەرجێگاکەی، تاگەیشتە شوێنی خۆی دەرگاکەش بەجیڕەیەکی ناخۆش بەدوایدا داخرایەوەو تاریکی کەوتەوە ژوورێ، تەنها لەدرزەکانەوە رووناکی ئەم بەیانیەی سەر بەفرەکە ئەهاتە سەر جێگای ئەو دوو خوشکە، بەگەیشتنی بۆ سەر جێگەکەی تەپەی لێهەڵسا، ترێش کەمێك بەم کەوتنە پەشۆکا.

ئەم ماوەیەش ترێی خوشکی هەرلەناو جێگەکەی خۆیەوە سەیری ئەم خوشکەی دەرکرد، کەبینی بەم شێوەیە گەڕایەوە ژوورەوە کەمێك بۆی هەستایە سەرپێو بەپەلە گرتی، لەگەڵ تەپەی کەوتنەکەی لەسەر جێگەکە داینا، ئەو کچە دولبەرەش تەنها جەستە بووو هیچیتر، ئاگای لەخۆی نەمابوو هەربەو دانیشتنەوە ترێ بەسووکی ئەیکێشا بەرووەمەتەکانی تاوەئاگابێتەوە بەلام کەڵکی نەبوو، چەند پرسیارێکیشی ئاڕاستە کرد:-

ترێ// چی بووە؟

مریەم// (بێدەنگەو قسە ناکات).

تریێ// بۆ وانەکەی؟

مریەم// (بێدەنگەو قسە ناکات).

تریێ// دایکمو باوکم باسی چی ئەکەن؟!

مریەم// (بێدەنگەو قسە ناکات).

تریێ// (بەرگەی بێ دەنگی ئەو خوشکە نازدارەی نەگرت، زۆر ترساو هەردوو شانی گرتو نیمچە هاوارێکی کرد) ئەوە چیە؟! بۆ بێدەنگیت؟!

بەلام ئەویش سوودی نەبوو، مریەم واق وڕماو لەسەر جێگەکەی دانیشتبوو، تریێی خوشکی چەند پێخەفێکی خستە پالی بۆ ئەوەی نەکەوێ، لەبەرامبەری دانیشتبوو وبەردەمیشی بەرنەئەدا، ئەویش بەحەپەساوی هەستەکانی بەنێو درزی دەرگاکە ئاڕاستەی ئەودیو حەوشەکە کردبوو زۆر هەستیارانە هەموو هەواڵێکی نێو حەوشەکەی خۆیانی لەوێوە بۆ ئەهاتە ژوورەوە، لەدەرەوە باوکی قسەی بۆ دایکی دەکرد ئەویش هەردوو گوێ بۆراگرتبوون:-

مام خدر// لەڕێگا نەمردبوو.

هەیبەت// ئۆهـ....سەدام.

ئەم چەند ووشەیە لەنێو حەوشەکەدا جارێکیتریش بەدرزەکانی دەرگاکەوە خۆیان کرد بەژوورەکەو بەسەر دەموچاوە سپی هەڵگەڕاوەکەی مریەم نیشتنەوەو جوولەیان لێبڕی! بەلام بەشێوەیەکی ئالۆز ووشەکانی بەرگوێ نەکەوت، تریێش لەبێدەنگیەکەی مریەم-ی خوشکی ترسا! کەوا بەمشێوە دەم نووقاویە دانیشتووەو هیچ نالێ! بەتەواوی گوێی لەقسەکانی دەرەوەی دایكو باوکی بوو کەباسی مردنیان ئەکرد، باوەشی کردووە

بەمریەمو ئاوڕی داوەتەوە بۆ دەرگاکە، دواتر سەیری مریەم ئەکاتو لەسەرەخۆ پرسیاری لێدەکات:-

ترێ// مریەم کێ مردووە؟!

بەلام ترێ گوێی لەهیچ وەلامێك نەبوو بۆیە زۆر ترسا! ژوورە تاریکەکەش ئەوەندەیتر سەری لەو کچە بچکۆلەیە شێواندبوو! چەند جارێك شانی خوشکەکەی راتەکاندو پرسیاری لێکرد هۆی واقوڕمانەکەی بۆ باسبکات بەلام وەلامی نەبیست، چەند جارێك گرتیەوە باوەشیو نووساندی بەسنگی خۆیەوەو بەسەریدا گریاو نووزایەوە ئەویش سوودی نەبوو، دواجار ترێی بچکۆلە ئارامی نەما زۆر بەتوندی هاواری کرد:-

ترێ// (بەهاوارکردنەوە) دایکە وەرە بزانە مریەم چیەتی؟!

لێرەدا روئیای خوێنەر لەژوورەوە بەنێو دەرگا دارەکەدا بۆ دواوە ئەگەڕێنمەوەو ئەیگەیەنمە نێو حەوشەکە، ئەم دوو خوشکە وردە وردە ئەچنە قوولایی سکرینو بەبچووکی دوور ئەکەونەوەو ئاسۆی ئەوانیش دیوارێکی قوڕەو چرا رەش بووەکەی پیا هەلواسراوە کەئەکەوێتە بەرامبەر دەرگاکە.

خوێنەری بەرێز کەگەڕایتەوە بۆ دواوە ئەگەیتە نێو حەوشەکە دواتر کەمێك دەرگای ژوورەکە لەدوای خۆت بەکراوەیی بەجێبهێلە، سەیرکە ترێو مریەم بەیەکەوە دانیشتوون، مریەم بەحەپەساویو ترێ-ش لەبەردەمیا دانیشتووەو هەردوو شانی گرتووە بەدەموچاوێکی شلەژاویەوە ئاوڕی داوەتەوە بۆ دەرگاکە تادایکی بەهانایان دێت، رووناکی دەرەوەی سەربەفرەکەش کەمێك چووەتە ژوورێ کەهیچ گلۆپێکی تیانیە، ئەولادیوارەی چرا کوژاوەکەی پیا هەلواسرابوو کەمێك رەشی تابنمیچەکە رۆیشتبوو،

دەرگاکە خەریکە دووبارە بەهۆی داخستنیەوە جیڕە بێتامەکە دەرئەکاتەوە بەڵام بەرلەوەی تری لەبەرچاو وون ببێت دووبارە هاوار ئەکاتەوە:-

تریێ// دایکە بۆ نایەیت!؟

خوێنەری ئازیز....

حەزئەکەم بتکەم بە (بینەر).

لێرەدا هەرئەوەندەت پێ ئەڵێم باجی هەیبەتو مام خدر لەو شوێنەی لێی وەستا بوون کەبەردەمی ژوورەکەی تریانە بەیەکەوە بەرەو ژووری کچەکانیان بەڕاکردن ڕۆیشتن، کەئەگەنە لایان دوا ساتی جیڕەی داخستنی دەرگاکە ئەبیستن، دەمو چاوو لەشو ناوجێگەی کچەکانیان بەهۆی نیمچە داخستنی دەرگاکەوە کەمێك تاریکتر ئەینواند، باجی هەیبتە لەپێش مێردەکەیەوە گەیشتە بەردەرگاو دواتر بەتوندی کردیەوە دووبارە ڕووناکی گەڕایەوە نێو ژوورەکەو هەردوو خوشکەکە ڕوونتر بینران، سەیریکرد تریێ بەواق وڕماوی دانیشتووەو باوەشی کردووە بە مریەم یەکسەر قیژاندی:-

هەیبەت// (قیژاندی) تریێ گیان ئەوە چی بووە!!؟؟

مریەم چیەتی!!؟؟

*    *    *

## هێلی گشتی بەردەوامە........

### کات

### هەمان بەیانیی دووەم ڕۆژی زستانی ١٩٩٤

### لەم گوندەو لەژوورەکەی مریەم

خوێنەری بەڕێز....

باماڵی مام خدری دوکاندار جێبهێڵین و بەرەو مزگەوت بچین بزانین یەعقوب-ی بریندارو دڵدارو سەرکێش چی بەسەرهاتووە، ئەو پیاوانەی ئەوێ لەدەوری ئەو کوڕە چی ئەکەن؟!

لەمزگەوتی ماڵی خوا چەند پیاوێك بەدەوری یەعقوب وەستاون، هەندێکیان دانیشتوون، چەند دانەیەکیش لەولاوە خەریکی قسەکردن بوون، ئەویش لەنێویاندا ڕاکشاوە، بێهەستە، چاوەکانی نوقاوە، جلە تازەکانی هەمووی لەباریەك دەرهاتبوون، پیاوانی مزگەوتیش هەرهەمووی سەرقاڵی ڕووداوی تەقینەوەکەی ئەم بەیانیەن.

ئەو پیاوانە زۆر بەسەیرەوە تێیان ئەڕوانی و هەستیارانەش لەنێوخۆیاندا باسی ئەم تەقینەوەیان دەکردو بیروڕایان لەگەڵ یەکتر دەگۆڕیەوە، یەکێکیان زۆر سەیری یەعقوب-ی دەکردو لێی وورد دەبووەوە! لەپڕ قسەی بەهەموویان بڕی، ڕووی کردە پیاوەکانی ئەوێ و پەنجەی بۆ یەعقوب درێژکرد.

گوندیەك// لەوەناچێ ئەو کوڕە مردبێ.

یەعقوب هەرئەوەندە بەئاستەم جووڵەیەکی کرد ئیتر صلاواتی ئەوپیاوانەی نێو مزگەوت بەرزبۆوە، هەندێ لەپیاوە پیرەکان کەشەوو ڕۆژ لەوێ دانیشتوون و ئەهلی مزگەوتن بەخۆیان و گۆچانەکانیان هاتنە پێشەوەو

چواردەوری ئەو گەنجە برینداریان گرت، دوای جوولەی عاشقی بریندار یەکسەر بەگریانەوە صلاوات خوێندنیان دەست پێکرد.

یەعقوب بێهێزەو لێی راکشاوە، بەئاستم وەکو زندە خەوێك گوێ لەگریانی ئەو پیرانە ئەبێت بۆیە زیاتر جوڵە بەلەشە سڕبووەکەی ئەکات، دواتر بەهۆی گەرمی سۆبای نێو مزگەوت کەتازە کەمێك لەشی گەرمی وەرگرتبووو خوێنی برینەکانیشی وەستابوو، جارێکیتر ئەخەوێتەوە، بەهۆی زۆر هیلاکیو ماندوو بوونو بریندار بوونو سەرما بوونی زۆریەوە ئەوەندەی پێناچێت وردە پرخەیەك ئەکاتو لەگەڵ مریەمدا یەك ئەگرنەوە.

پیاوە پیرەکان جارێکیتریش سوپاسی خواو ئیشە جوانەکانی خوا دەکەنو لەخۆشیا دەم بەپێکەنینو چاو بەفرمێسك خەریکی خوێندنی ئایەتو شوکرانەو نوێژکردن دەبن، هەندێك لەو پیاوانە لەسەر لاشەی سڕبووی یەعقوب وەستاونو نوێژ دەکەن وەك نزیك بوونەوە لەخواو دوعای چاکبوونەوە بۆ ئەم گەنجە، چەند دانەیەکیان لەولاتر خەریکی ووتنەوەی ووشە پیرۆزەکانی خوا دەبن وەك فاتحەو شتی تر.

ئەم گەنجەش سەرلەنوێ خەوتەوەو لەخەویدا بەبینینی دولبەرەکەی زەردەخەنە پەڕیوەتە لێوەکانی چونکە چاوەکانی بڕیوەتە لەشولاری ئەونازدارە لادێییە، دیمەنەکانی خەوەکەو گرتەکانی نێو مزگەوت چەند جارێك لەسکرینیی خوێندنەوەی ئەم دەقە تێکەڵاو بەیەکتر دەبێت، ئەهلی مزگەوتیش کەهەندێکیان تازە لەنوێژکردن بۆ سوپاسکردنی خوا تەواو بوون، سەیری دەکەنو سەریان لێی دەرناچێ تەنها بەهۆی خەندەی لێوەکانی ئومێدی چاکبوونەوەیان لادروست بووە، قیژەی پلکە هەیبەتی دایکی مریەم ئەگەیشتە نێو مزگەوتو جارجارە پیاوە پیرەکان سەریان هەڵدەبڕی وەك بیانەوێ سەیری دەرەوە بکەن بۆ زانینی ئەم گریانو هاوارو قیژەیە.

پیرێك// ئەو گریانە چیە؟!

پیرێك// (بەسەر سوڕمانەوە سەیری ئەم دەكات و ئاوریش بۆ شوێنی قیژەكە ئەداتەوە).

* * *

## خەوبینینی یەعقوب لەمزگەوت و هێلی گشتی بەردەوامە........

هەموو پیاوەكانی نێو مزگەوت سەرسوڕمانیان لەنێوان لاشەی راكشاوی یەعقوب و قیژەی دەرەوە دابەشكردووە، یەعقوب-یش لەو خەوەدا لەگەڵ مریەم و ترێ لەرۆژێكی رووناكدا لەبەردەمی دوكانەكەی مام خدر وەستاون و هیچ قسەیەك ناكەن، تەنها یەعقوب لەگەڵ ترێ بەزەردەخەنەوە سەیری مریەم ئەكەن....ئەویش قژی ئاڵۆزكاوەو بەخەمباریەوە وەك بێزار بوونێك لەوێ ئەڕوات و بەجێیان ئەهێڵێ ئەچێتە ژوورەوە بۆ ماڵیخۆیان، هەردووكیان لەدواوە حەپەساون و سەیری دەكەن كەچۆن بەنێو حەوشەكەیاندا ڕێ ئەكات، یەعقوب بەبێدەنگی هەرحەپەساوە سەیری رۆیشتنی مریەم ئەكات! دواتر شووشە عەترەكە بەساغی ئەداتە دەست ترێ و سەر هەڵئەبڕی بۆ ڕێوڕۆیشتنی دولبەرەكەی! ترێ باوەشی پیا ئەكات و دەست ئەكاتە ملی، دوای رۆیشتنی مریەم دووبارە سەیری ترێ ئەكات ئەبینێ شووشە عەترەكەی پێنەماوە! ئەویش بەحەپەساوی سەیری دەكات! ئەمجارەیان شوشە عەترەكە بەشكاوی لەباخەڵیدا دەرئەهێنێ و ئەیداتە دەست ترێ لەسەرسوڕمانیش بەردەوامە! ترێ-ش دیسان بەپێكەنینەوە لێی وەرئەگرێ و ئەمجارەش باوەشی پیائەكات، ئەویش لەباوەشی ئەگرێ و دەست ئەهێنێ بەسەرو قژیداو لەدواوە سەیری رۆیشتنەكەی مریەم ئەكەن و لێی تێناگەن بۆ ئەڕواو پشتیان

تێنەکات؟! هەر لەو خەوەدا مریەم نەختێك لێیان وون ئەبێ‌و دواتر کەمێك لەدووری ئەوان بەرامبەریان ئەوەستێ‌و سەیریان دەکات، ئەو شووشە عەترە بەرزدەکاتەوە کە یەکەمجار یەعقوب لەزستانی رابردوو بەدیاری بۆی هێنابوو وئێستاش ئەوەتا لەبەردەم ئاوێنەی ژوورەکەیان دانراوە، یەعقوب زیاتر ئەحەپەسێ! لەوکاتەدا منالێك دەرئەکەوێ! مریەم عەترەکە ئەداتە دەست منالەکەو رووەو یەعقوب‌و ترێ بەسووکی پالی پێوەئەنێ، یەعقوب بەسەرسوڕمانەوە سەیری ترێ ئەکات! دواتر سەر هەلئەبڕێ! مریەم لەشوێنی خۆی نەماوە! منالەکە ئەگاتە بەردەمیان عەترەکە ئەداتە دەست ترێ‌و ئەو کوڕەش هەر حەپەساوە.

* * *

## هێلی گشتی بەردەوامە........

### کات

### هەمان بەیانیی دووەم رۆژی زستانی ١٩٩٤

### لەم گوندەو لەژوورەکەی مریەم

دایکی مریەم لەژوورەوە کچە عاشقەکەی لەباوەشگرتووەو ئەقیژێنێ! هاوارو قیژەی ترێ‌و دایکی بەناو هەموو ئاوایی دەنگی دایەوە! بەم بەیانیە خەلك بەتەواوی وەئاگاهاتن‌و دەستە دەستە ئەچوون بەرەو مالی مام خدر، ئەو منالانەی لەگەل دایکیان هاتبوون بۆ ئەوێ دەم‌وچاویان نەشۆرابوو حەپەساویش یەخەی گرتبوون‌و چەند دانەیەکیان پارچ نانی وشکیان بەدەستەوە بوو بەدەم جوولەوە ئەیانخوارد، چونکە پێش خواردنی نان‌و بەرچایی ئەم بەیانیەیان دوو کارەساتی جەرگبڕ یەخەی گوندەکەیانی گرت.

ژوورەکەی ئەم کچە عاشقە پڕ بووبوو لەژنانی ئاوایی، هەموویان بەدەنگ گریان و هاواری تریێ و دایکی هاتبوون، ژوورەکە زۆر پڕ بوو لەژنان جێگەی کەسی‌تری تیا نەئەبووەوە، وای لێهاتبوو چەندین ژن لەبەر دەرگای ژوورەکە وەستابوون و چەندیتریش لەژوورەوە بەپێوە وەستاوو دانیشتوو بوون.

ئەگەر بەسەر سەری ژنەکانی بەردەرگا سەیری ژوورەوە بکەیت ئەبینی تریێ بەکەس دابین ناکرێ چونکە بەگریانەوە هەڵئەپەڕێ و ئەکێشێ بەسەو ملی خۆیدا! مام خدریش وەکو ئافرەت لەنێو ژنەکاندا ئەگری و هاوار دەکات، ئەم دیمەنە بەم شێوەیە بەردەوامە سات لەدوای سات قەرەباڵغیەکەی نێو ماڵی مام خدر زۆر ئەبێ وغەڵبە غەڵبەکەش زیاد ئەکات و دەنگ و هاوارەکانیان زیاتر ئەگاتە نێو مزگەوت. ئەو شوێنەی مریەم بەتاسەوە بوو بۆی بۆ بینینی لاشەی یەعقوب، ئەو پەرستگایەی لەنێو دەرگای ژوورەکەی مریەم دیاربوو، مریەم زۆر خەفەتی لە تەرمی دڵدارەکەی خوارد کە گوایە لەوێ راکشاوەو ئەویش ناتوانێ و داب و نەرێت رێگەی نادات بچی تێر تێر لاشەکەی لەباوەش بگرێ.

*   *   *

## ( پەخشانە شیوەن )ـێك
## بۆ مەرگی ناوادەی مریەم

ئاخ....هەزاران ئاخ بۆ مردنی مریەم-ی جوانەمەرگ، بۆ دولبەری وردیلە، بۆ کچی عاشق، بۆ ئەو کیژە لادێییە کەزوو زوو لەقسەکانی یەعقوب تورە دەبوو ودوای کەمێکیش بەقسەکانی ئەو ئەکەوتەوە پێکەنین، بۆ ئەو کەنیشکە دەستو پێ خەناویە.

ئاخ....بۆ نازە بێناز بەجێماوەکەی مریەم-ی عەیار وابەسەر لاشەی سڕبووی دڵدارەکەیدا بەبێ گیان تلیساوەتەوەو کەس نیە نازی بکێشێ، کەس نیە پێشوازی لێبکات، وەك زستانی رابردوو تێر تێر بۆنی پێوە بکاتو بیکاتە باوەشیو باڵاشی عەتر پرژێن بکا.

ئاخ....کیژە لادێییە بەنازە عەیارەکە، خۆ تۆ تاکە هاوڕێو خوشکی تری بوویت، خۆ تۆ تاکە یاوەرو هاوجێگەی خوشکە بچووکەکەت بوویت، لەشەوانی زستان هەر تۆ ئەتکردە باوەشو هەر تۆش بەیانیان بەماچ لەخەو وەئاگات ئەهێنایەوە، ئەوەتا هەر ئێستاو هەر ئەم بەیانیەو هەرلەنێو ژوورەکەی خۆت شیوەنی مەرگی تۆ ئەگێڕێ.

دە توخوا مەمرە....

توخوا بەجێمان مەهێڵە....

ئاخ....چیرۆکەکەی منیش بەکۆتایی مەرگی خۆت کۆتای مەهێنە، خۆ تۆ لەم سەرەتای زستانەدا لەسەرەتای بەهاری تەمەندا بوویت! کەچی پێش وادەی گەلا ڕێزان پاییزی عیشق یەخەی گرتیو باڵا ناسەکەکەتی بێگیان هێلایەوەو زۆر ساردوسڕ لەنێو ژوورەکەتدا پاڵیخست. خۆ تۆ هیچ نهێنیەك نەما لای تریێ جوانکیلە نەیدرکێنی کەچی پێش وادەی ماڵئاواییت هیچت بەو کیژە بچووکە نەووت.

ئاخ....با لەم زستانەدا کۆچت نەکردایە، بامنی نووسەر دوای چەند ڕۆژێکی‌تر لەگەڵ دڵدارەکەتدا بتانخەمەوە باوەشی یەکتر، پێی ئەڵێم چیتر پێت نەڵێ (مراوی)، لەمریەم گیان‌و مریەم گوڵ کاڵترت نەکاتەوە، با بۆی بنووسم شووشە عەترێکی‌تر بۆ تریێ بکڕیێ‌و لەژوانی بووکێنی تۆدا بۆی بکاتە دیاری، با بۆی بنووسم ئەبێت زۆر دڵی خۆش بکەیت چونکە نزیکەی ساڵێکە ئەم خو‌ێکە بچکۆلەیەمان چاوەڕێی بۆنێکی خۆش دەکات.

دە توخوا مەمرە....

توخوا بەجێمان مەهێڵە....

توخوا لەم کۆتایی ساڵەدا کۆچ مەکە، وەرزی حاجیلەو گوڵاڵە سوورە وابەڕێوەن. مەرج بێت هەر ئەم بەهارە بۆ مام خدری بنووسم بەکراسە جوانەکەی خۆت پێشکەشی دڵدارەکەت بکات، ئەویش بتکات بەبووکی ئەم نەورۆزە، دایکیشت چەپکێ نێرگزت بەدیاری بخاتە دەست‌و بەسواری ئەسپ بەتوولە ڕێگاکاندا هەڵگەڕێن، سورمەیەکی سوریش ئەخەمە دەستی تریێ بەدرێژایی ڕێگەکە بۆت هەڵتەکێنیێ‌و لەبەردەمتا هەڵبەزو دابەز بکات‌و هەر قریوەی بێت، سات ناساتێ ئاوڕت بۆ بداتەوە بەگیان گیان‌و بەقوربان ووشە بارانت بکات‌و بەدەستە بچکۆلەکانی ماچت بۆ هەڵبدات، سەرجەم کوڕو کچانی ئەم ناوچەیەش بکەم بەکۆمبارس‌و بەچەپڵە ڕێزان دواتان بکەون تادەگەنە دێکەی ماڵی زاوا، لەویێ لەناوەڕاستی دێ لەبەردەم دوکانەکەی مام حەمەد قادر-دا کەمێك بوەستن‌و هەموو کچانی ئەوێش تێنەگەیەنم بەجلی کوردی ڕەنگاوڕەنگ بێنە بەردەمت‌و گوڵ بارانت بکەن، تۆش لەوبەرزیەوە چەپکە نێرگزەکەت بکەرەوەو هەڵیبدە بەسەر کیژانی دەم بەپێکەنین، لەژێر تارا سپیەکەتدا نوخشەی هاوسەرگیریان بۆ بخوازە.

خوشکە مراوی گیان دەهەستەوە....

وەکو جاران ترێ بخەرە بەردەمی خۆت و سەرو قژە ئاڵۆزکاوەکەی بۆ بهۆنەوەو چەند کەزیەکی ووردیلەی بۆ بخەرە ئەملاولای سەری کەرێك وپێك ئارەو شێوەو روخسارە لادێییەکەی پێوە ئەنووسێ، بەلام ئاخ ئێستا ئاوێنەکەشت بێ نازەو چاوەڕوانی روخسارت دەکات تالەتۆوە خۆی ببینێ و شووشە عەترەکەشت لەبەردەمی خۆیدا بۆ بخاتە پێکەنین، دواتر قریوە بۆندارەکەی بەسەر سینەتدا بلاو بکاتەوە.

بەلام قەیناکا خوشکە مراوی گیان....

رۆژێ دێت لەئاسۆیەکی نادیاردا یەکتر ئەبینینەوە، ئەوسا تێدەگەی کەمن بورهان جۆلام چیرۆکی عیشقی تۆم داڕشتووەو لەمنەوە ئەیخوێنیتەوە ترێ و پلکە هەیبەتی دایکت و مام خدری باوکت و هەموو خەلکی ئاوایش چ شیوەنێکیان بۆ بەهاری مەرگی تۆ گێڕاوە، ئەوسا پێت ئەلێم:- خوشکە مراوی گیان ئەو بەیانیەی تۆ رۆحت بەئاسمان سپارد، ئەو بەیانیەی تۆ مالئاوایت کرد، ئەو بەیانیەی تۆ دوا هەناسەت دایەوە، نەمهێشت بەیان-ی خوشکی یەعقوب لەگوندەکەی خۆیان لەخەو هەلسێ، یەکسەر هەوالی مەرگی تۆم بەکاراکتەرێکی دەرەوەی ئەم دەقە ئەدەبیە پێڕاگەیاند.

ئاخ....مریەم گیان، حەزەکانی شنۆی هاوڕێت لەگەڵ مەرگی خۆت پێچایەوەو بردت بۆ بەهەشتە بەرینەکەی خوا، ئەوەتا هاتۆتە لات لەنێو ئاپۆرەی ژنەکانی حەوشی مالەکەت وەستاوەو هێندەی ترێ کەوتۆتە ژێر باری هەوالە سڕبووەکەی مەرگی لەناکاوی تۆی خۆشەویست.

مریەم گیان مالئاوا....

با گۆڕەکەشت لەسەر تەپۆلکە شاخەکەی نێوان گوندی هەردوولاتان بێت و بەشێك لەخاکی رەبیە کۆنەکە ببێتە گلکۆت، لەبەهاراندا دەستە دەستە کیژانی ئەو ناوچەیە سەردانت بکەن و پەڕۆی سەوز بەکێلە باریکەلەی چەشنی

بالات هەڵواسن بۆ هێنانەدی رازونیازی پەنگ خواردوویان، دواتر لەدەورت کۆببنەوە نێرگزو بەیبون و گوڵاڵە سووره بچنن و چەپك چەپك بیخەنە چواردەورت، هێندەی متومووری دەست و یەخەو سنگە بەرزەکەشت مەرجان و پیرۆزه شینە بخەنە سەر گۆڕت بۆ کرانەوەی بەختی کچێنیان.

ئینجا شنۆی هاوڕێت تێدەگات تۆ چ عاشقێکی پاك بوویت، ئینجا ئەزانێ تۆ چ دولبەرێکی عەیار بوویت، چ عەشارگەیەکی رازەکانی دڵی خۆت و یەعقوب بوویت، گۆڕەکەشت ئەبێتە خوێندنگەی دڵدارانی ناوچەکەو سەرجەم عاشقانی دەڤەرەکە لەخوارەوە سەیری مەرقەدی (سوڵتانە مریەم) دەکەن، هەموو بەهارانیش بەکۆمەڵ بۆت سەرئەکەون و تائێوارە بەجێت ناهێڵن، شەوانیش تادرەنگانێك پەستی مەرگی لەناکاوی تۆ ناخی ئەوان بەجێناهێڵێ.

ئاخ....بۆ غوربەتی ئەو عیشقەی گیرۆدەی داب و نەریتی دواکەوتووی کۆمەڵگەیەو لەئاسۆیەکی غەریبدا ماڵئاوایی وادەنەهاتوو ئەکات و سوێ ئەخاتە دڵی خاوەن دڵەکان و تاهەتایە لەیاد ناچنەوە.

* * *

## هێلی گشتی بەردەوامە........

## کات

## هەمان بەیانیی دووەم رۆژی زستانی ١٩٩٤

## لە مزگەوتی ئەم گوندە

لەنێو مزگەوت جوڵەو پێکەنینەکانی سەرلێوی یەعقوب زیادیکرد، پیاوە پیرەکانی چواردەوری بەو زەردەخەنەیە دڵیان زۆر خۆشە چونکە ئەزانن زیندووە بەڵام لەنێوان خەوو خەیاڵ سەریان دەرناچێ، بەهەرحاڵ و هەرچۆنێ بێت ئەو پیرانە حەز بەمەرگی ئەو گەنجە ناکەن.

گریانی تریێو دایکی بۆ مریەم-ی عاشق بەسووکیو لەسەرەخۆ بەردەوامە، قەرەباڵغیو دەنگە دەنگی خەڵکی دێ لەماڵی مام خدر بەسووکیو لەسەرەخۆ بەردەوامە، هەموو ئەمانە بەهۆی نزیکی ماڵەکەیان ئەگاتە نێو مزگەوت.

یەکێکیان عەترێکی بچووکی پیرەمێردانە لەباخەڵیدا دەرئەهێنێ وەك نەرێتێکی کوردەواری بەپەنجەکانی کەمێك ئەدات لەلوتی یەعقوب تاوەئاگا بێتەوە، ئەویش بەئاستەم هاتۆتەوە هۆش خۆی بەڵام بەهۆی سڕبوونی لەشیو خاوبوونەوەی ئێستایو زۆری سەرمای دوێنێ شەو ناتوانێ هەڵسێ و وەك هەموو مرۆڤێکی ئاسایی هەڵسوکەوت بکات.

گریانی تریێو دایکی بۆ مریەم-ی عاشق بەسووکیو لەسەرەخۆ بەردەوامە، قەرەباڵغیو دەنگە دەنگی خەڵکی دێ لەماڵی مام خدر بەسووکیو لەسەرەخۆ بەردەوامە، هەموو ئەمانە بەهۆی نزیکی ماڵەکەیان ئەگاتە نێو مزگەوت.

لەگەڵ هەڵمژینی بۆنەکەی نێو مزگەوت سەرلەنوێو جارێکیتریش ئەم عاشقە بریندارە بەخەیاڵیا دێتەوە کەلەژووری نێو ڕەزەکەدا شووشەعەترەکە لەژێر قاچی وورد بووەو ژوورەکە پڕبووە لەبۆن...ئەویش وردە وردە هەڵیئەمژێو کەمێکیش دەستو قاچەکانی کەوتنە جووڵە، دواتر گوێی لەدەنگی پیاوە پیرەکان بوو:-

- خەریکە وەئاگادێتەوە.
- زیاتر بۆنەکە بکەن بەلووتی.
- کەمێك ئاو بهێنن...با دەموچاوی تەڕبکەین.

یـەعقوب-یـش بەئاسـتەم هاتۆتـەوە سـەرخۆی بـەڵام ئێجگـار بـێهێزە، لەگــەڵ دەنگــی پیاوەکــان کــەمێك جوڵــەی بەلەشــی کــرد بــەڵام ســڕبوونی پێوەدیاربوو.

گریـانی تـرێو دایکـی بـۆ مریـەم-ی عاشـق بەسـووکیو لەسـەرەخۆ بەردەوامە، قەرەباڵغیو دەنگە دەنگی خەڵکی دێ لەماڵی مام خدر بەسووکیو لەسەرەخۆ بەردەوامـە، هـەموو ئەمانـە بـەهۆی نزیکـی ماڵەکـەیان ئەگاتـە نێـو مزگەوت.

دوای چــرکەیەكو دووان پرخەیــەکی نــەرمی کــردو جــارێکیتریش گەڕایەوە نێو خەوەکانیو بەرامبەر سکرینی خەیاڵی ئەوکاتەی کەلەگەڵ مریەم وەســتابوون ئەیویســت بەپەنجــەکانی خــۆی عەترەکــە بکــات بــەلووتی دولبەرەکـەی، بـەڵام لـەنێو ئـەم دیمەنـەدا گـوێی لـەدەنگی پیـاوە پیرەکـانی نێـو مزگەوت ئەبوو:-

- خوایـە تـۆ زۆر بـەرەحمی، رەحـم بـەم گەنجـە بکە.

چــەندین لــەو پیاوانــە هەنــدێکیان بەسەرســەریەوە وەســتاونو ئەوانیتریش بەچواردەوری دانیشتوون، یەکێکیان بەردەوام عەترەکـەی دەسـتی ئـەکات بـەلووتی ئـەم گەنجـە لـەهۆش چـووە، یـەعقوب-یـش دوای هەڵمـژینی ئەمجارەشیان گەڕایەوە نێو دونیای خەیاڵ:-

یـەعقوب لەگـەڵ مریـەم بەیەکـەوە وەسـتاون، ئەیـەوێ عەترەکـە بکـات بەلووتی دولبەرەکـەی، بـەڵام ئـەمجارە مریـەم دەسـتی ئـەگرێو نایـەڵێ نزیکـی بکەوێ، ئەم کچە وەك تووڕە بوونێك خۆی نیشـانی دڵدارەکـەی ئـەدات، دواتـر مریـەم دەستەکانی یـەعقوب-ی عاشـقی بـەرداو پشـتی تێکـردوو ورد ورد لێـی دور کەوتـەوە، ئـەویش بەحەپەسـاوی لـەوێ مایـەوەو دەسـتیکرد بـەگریان!

هـەموو ڕۆیشـتن و تورەبوونـەکانی مریـەم لـەنێو خـەوو خـەیاڵی یـەعقوب-دا نیشانەی درك پێکردنی ئەم گەنجە عاشقە بوو بۆ مردنی دولبەرەکەی. دوای ئـەوەی مریـەم لـەم خـەوەدا ڕۆیشـت یـەعقوب-ی بـەگریان و بەحەپەساوی بەجێهێشت!........

گریـانی تـریّو دایکـی بـۆ مریـەم-ی عاشـق بەسـووکی و لەسـەرەخۆ بەردەوامە! قەرەباڵغی و دەنگە دەنگی خەڵکی دێ لەماڵی مام خدر بەسووکی و لەسـەرەخۆ بەردەوامـە، هـەموو ئەمانـە بـەهۆی نزیکـی ماڵەکـەیان ئەکاتـە نێـو مزگەوت.

ئەوەتا لەمزگەوت پاڵکەوتووە زەردەخەنە لەسەر لێوەکانی هـەڵفڕین و سـوورایيان تيانـەما، بـەهۆی ڕۆیشـتنی مریـەم لەخەوەکەیـدا کـەمێکیش لچـی کردبوو، ئەویویسـت لـەنێو مزگـەوت بگـری، پیاوەکـانی نێـو مزگەوت سـەیری یـەعقوب دەکـەن و سـەریان لـە زەردەخەنـەو گریـانی سـەر دەموچاوی‌ئەو کوڕە دەرنا چێت.

چەند پیاوێك بەپەلە خۆیان گەیاندە مزگەوت و لـەوێ لەگـەڵ ئـەوانیتر بەسـەر سـەری یـەعقوب-ـەوە وەسـتان، سـەیری ئـەو دیمەنـەیان دەکـرد، هەرهەمووشـیان هـەواڵی مـاڵی مـام خـدر-یـان پێیـە! هەرهەمووشـیان بەدەموچاویانەوە دیارە کەبەم بەیانەیە بەرلەوەی خێرو شەڕ بەشبکرێ دوو کارەساتی جەرگ بڕ یەخەی گوندەکەیانی گرتووە.

ئەمجارە قیژەو هاواری دایك و کچە بچکۆلەکە بەرز بووەوەو گەیشتە بەرگوێی پیاوانی مزگەوت! یەعقوب لەگەڵ قیژەی ئەوان و هەڵمژینی بۆنی عەترەکـەی نێـو مزگـەوت و داخـی تـوڕە بـوون و ڕۆیشـتنی مریـەم-ی نێـو خەوەکەی چاوەکانی کردەوە، کەسەیری پیاوەپیرەکانی چواردەوری دەکرد هێشتا گریانی ڕۆیشتنەکەی مریەم بەسەر دەموچاوەیەوە مابوو، پیاوگەلێکی

زۆری بینـــی بەسەرســـەریەوە وەســـتابوون! هەنـــدێکیش بەچـــواردەوری دانیشـتبوون، هەرهـەموویان زەردەخەنـە کەوتـە سەرلێویان و خۆشـحاڵ بـوون، ئەویش بەبرینداری پاڵکەوتووەو یەك یەك سـەیریان دەکات، هەربـەو گریانـەوە پرسیاری کرد:-

یـەعقوب// (بـەبێ هێـزی) ئەو قیـژەو گریانـە چیە لـەم

دێیە؟ بۆمنە؟

ئـەو پیاوانـەی تـازە گەیشـتبوونە ئـەوێ لەسەرسـەری وەسـتابوون و وەڵامیان دایەوە، بـەڵام وەڵامێکـی داخکـەر، وەڵامێکـی مـەرگ ئامێز، وەڵامێکـی چاوەڕواننەکراو، وەڵامێکی جەرگبڕ!.....:-

گوندیـەك// نـەوەڵڵا کاکـە....کچـە گەورەکـەی مـام

خدری دوکاندار ئەمری خوایکرد.

دوای بیستنی ئـەم حیـوارە هـیچ دەنگێك لـەم دەقە ئەدەبیـەدا نامێنـێ، ناومزگەوت لاڵ ئەبێت، ئەوەتا گوێچکەکانی کاکەی عاشـق کـپ بـوون، سـروەی هیچیش نایـەت، چرکەی دڵـی دڵـدارە بریندارەکە خاوبۆتـەوە، تـەنها جووڵـەی کارەکتـەرەکان ئەبێتـە جووڵـەو حیـواریش، تـەنها حەپەسـاوی یـەعقوب ئەبێتـە جووڵـــەو حیـــواریش، تـــەنها رەنگـــە پەڕیوەکـــەی یـــەعقوب ئەبێتـــە جووڵـــەو حیـواریش، سـکرینی روئیـای خوێنــەر سەرسـام ئـەبێت دوای دوا ئاکـامی رووداوەکان ئەکەوێ و ئاگای لەهیچ نامێنێ.

یەعقوب هێشتا لەناوەڕاستی پیاوەکان پاڵ کـەوتووە! چاوەکانی زەق کردۆتەوە! یەك یەك سەیریان دەکات! ئەوانیش دەمیان ئەجووڵاو قسـەیان بۆ ئەکرد بەڵام لاوەی عاشـق گـوێی لـەهیچ ووشـەیەك نـەدەبوو، زۆر بـەکپی تـەنهاو تەنها جووڵەی دەست و دەمیانی ئەبینی.

چەند جارێك ووشەی (مردنی کچە گەورەکەی مام خدری دوکاندار) بەدەم جولاندنی پیاوە گوندیەکەشەوە ئەهاتەوە بەرچاوی، هەر دووبارەو سێبارە ئەبووەوە، دواتر هەرچی سوورایی سەر دەموچاوی یەعقوب هەبوو باڵی گرتو بەرەو ئاسمان فڕی! ئەویش بەحەپەساوی‌و بەبێ دەنگی‌و بەفرێمە خاوکراوەکانی سەر سکرینی ڕۆئیای ئەم دەقە ئەدەبیە هەڵسایەوەو دڕی بەپیاوەکانی چواردەوری دواو دوای ئەو ووشە جەرگ بڕە کەوت! ڕۆیشتنەکەشی لەگیان دەرچوون ئەچوو! پیاوەکانیش هەر بەو فرێمە خاوانەوە بەملاولا ئەکەوتن‌و بەسەرسوڕمانەوە تێیان ئەڕوانی.

یەعقوب بەردەوامە لەڕاکردنە خاوەکەی! لەنێو حەوشی ماڵی خوا بەرەو دەرەوە ئەڕوات، لەدەرگای مزگەوت دەرچوو، پێچی خواردەوە بەرەو ماڵی مراوی گیان سووڕایەوە گەیشتە بەردەرگاکەیان، لەنێو حەوشەکە مام خدری بەدیکرد لەنێو ژوورەکەی مریەم دەهاتە دەرێ‌و فرمێسکی ئەسڕیەوە، چەند پیاوێك لەنێو حەوشەکە وەستاون‌و ئەگرین، تاوێکی کەم سەیری باوکی مریەم-ی کردو دواتر چووە نێو حەوشەکەوە، ئاوڕی دایەوە بینی چەند ئافرەتێکیش لەحەوشەکە لەشوێنی جیاجیا وەستابوون‌و ئەگرین.

شنۆی هاوڕێ مریەم لەنێو ئافرەتەکان وەستاوە شیوەن بۆ مریەم ئەگێڕێ، قوڕ بۆ ئەو دەستە خوشکەی ئەپێوێ، هەر لەوێوە سەیری شڵەژاویەکەی ڕاکردنی یەعقوب-یشی دەکرد، بەچاوە تەڕەکانی تێیئەڕوانی، ئێستا بۆی دەرکەوت کەمریەم لەگەڵ ئەم گەنجە بریندارە دڵیان بەیەکەوەیە! هەر ئێستاش خەمی مردنی مریەم‌و حەپەساویی ڕاکردنی ئەم گەنجە بریندارەی تێکەڵاو بەیەکتر کرد.

یەعقوب دوای ئەوەی مام خدری بەگریانەوە بەجێهێشت هەر بەم ڕاکردنە خاوەوە رووی وەرگێڕا بەبەردەمی ژنەکان تێپەڕی‌و حەپەساویەکی

خەستتری بەسەر دەموچاوی شنۆدا بەجێهێشت! جلەکانیشی هەموو لەباریەکتر دەرهاتووە، شنۆش بەدوایدا رایکرد تابەردەرگای ژوورەکەی مریەم نەوەستانەوە، یەعقوب بینی چەند ئافرەتێك لەبەردەمی ژوورەکەی وەستاون! لەدواوە لەنێو سەری ژنەکانەوە سەیری ناوەوەی ئەکرد شنۆش لەدواوە دەستی خستبووە سەرشانی ئەو کوڕە عاشقەو لەگەڵ ئەودا سەیری ژوورەوەی دەکردو ئەیکێشا بەسەری خۆیدا.

باوکی مریەم-ی جوانەمەرگیش لەولاترەوە بەگریانەوە سەیری حەپەساویەکەی یەعقوب ئەکات! لەشنۆش ئەڕوانێ کەوا لەدواوە خەریکە باوەش ئەکات بەیەعقوب-دا! نیشانەی چەند پرسیارێکیش بەسەر دەموچاوی ئەو پیاوە پیرە جەرگ سووتاوە نیشتەوەو نازانێ ئەو پرسیارانەی نێو دڵی چۆن چۆنی ساغ بکاتەوەو شیتەڵیان بکات.

یەعقوبو شنۆش لەدواوەی ژنەکانی بەردەرگا وەستاونو سەیری ژوورەوە دەکەن، باجی هەیبەت-یش لەژوورەوە مریەمی کردۆتە باوەشو چەند ئافرەتێکیش بەچواردەوری دانیشتوون، ترێ-ش لەژوورەوە وەك چۆلەکەی سەربڕاو هەڵئەپەڕێ! چاوێکیشی هەڵبڕی بۆدەرەوەی دەرگاکە بۆ یەعقوب دواتر شنۆشی بینی لەپشتیەوە وەستاوە! چەند ئافرەتێك بەگریانەوە لەگەڵ تێڕوانینی ترێ ئاوڕیان بۆ دەرەوە دایەوە، بەڵام چی ئەبینن گەنجێکی حەپەساو! کەمێك خوێن بەدەستو دەموچاویەوە مابوو، جلەکانیشی هی خۆی نەبوو و بۆیە شێواو بوو هەروەکو ئێستا لەشەڕێکی ترسناك گەڕابێتەوە ئاوا ئەهاتە بەرچاویان.

دڵداری برینداری وەکو شێتی لێهاتووە، هەرلەبەردەرگاکەوە بەگریانێکی بێدەنگ گەڕایەوە بۆلای باوکی مریەم، تابەیەکەوە قوڕی

جوانەمەرگی مریەم بپێوون، بەیەکەوە بگرین، هەموو ئەم دیمەنانە بەبێدەنگی و بەخاوی ئەگەیەنمە سکرینی روئیای خوێنەری خۆشەویست.

مام خدر لەگەڵ چەند پیاوێکی‌تر کەلەولای حەوشەکە بەپێوە وەستاون‌و ئەگرین، ئەکێشن بەسەری خۆیان، بەڵام جگە لەجووڵەیان دەنگی هیچ ناگاتە گوێچکەکانی یەعقوب، مام خدر سەیری یەعقوب ئەکات گریان‌و حەپەساوی تێکەڵ بەیەکتر بووە! یەعقوب بەرەو رووی مام خدر دەڕوات وەك بەسەر هەورەوە بڕوات وایە، حەپەساوە! هەرچەند تەوژم‌و تین ئەخاتە سەرقاچەکانی بۆ گەیشتن کەچەند مەترێك لێی دوورە بەڵام نایگاتێ، بەڵام هێزی نیە، هەر بەردەوامیشە لەرۆیشتن بەرەو رووی باوکی مرە گیان، بەرەو رووی باوکی دولبەرەکەی، بەرەو رووی ئەو پیاوەی خۆشی دەوێ، ئەوپیاوەی هەمووجار پاکەتێك جگەرەی لێئەکڕی بۆ مەلاعەلی باوکیی، شنۆش هاتۆتەوە شوێنی خۆی، لەنێو ژنەکانی حەوشە وەستاوە هەربەو چاوە پڕ فرمێسکەوە سەیری گەڕانەوەی یەعقوب-ی عاشق دەکات کەخەریکە ئەگاتە بەردەمی مام خدر.

دوای ئەوە تریێ لەژوورەوە وەکو شێت دەرئەپەڕێ، بەدەستەکانی ئافرەتەکانی بەردەرگا لائەدا بۆئەوەی رێگای بۆ چۆڵ بکەن‌و بێتە دەرەوە، هەربەگریان بەڵام بەشێوەی چەند فرێمێکی خاو بەبێدەنگی رادەکات بۆ نێو حەوشەکە، ئەویش دووبارە ئەگاتەوە بەردەمی شنۆ کەهەرچی قژی هەیە هەموو ڕنیوەتەوەو خوێنیش بەسەر دەم‌و چاویەوە دیارە.

تریێ لەیەعقوب خێراترەو پێی ئەگاتەوە....لەدواوە باوەش دەکات بەیەعقوب‌و هەردووکیان بەیەکەوە ئەگەنە بەردەمی مام خدر، شنۆش بەو لەخۆدان‌و گریان‌و حەپەساویەوە سەیریان دەکات، ئەوان باوەش ئەکەن بەمام

خدرو بەبێدەنگی ئەگرین، ئەوپیاوە پیرەش دەست ئەکاتە ملی هەردووکیان‌و بەبێدەنگی ئەگری.

منیش وەکو نووسەری ئەم تێکستە چیتر زەینی ئێوەی خوێنەر ماندوو ناکەم دوای ئەوان منیش پشوو وەردەگرم‌و بۆخۆم ئەگریم.

تایتلی کۆتایی

*    *    *

## دواتر...............

بەم دیمەنی باوەش بەیەکداکردنەی هەرسێکیان قورسایی لەسەرهێلی گشتی بەسەرهاتەکان نامێنێت‌و رووداو تەواو ئەبێت، واتا دوای ئەم دیمەنی گریانی یەعقوب‌و ترێ‌و مام خدرو کۆبوونەوەی خەڵکی دێ لەناو حەوشی ماڵی مریەم-داو حەپەساوی شنۆ، هەرچیەك بڵێین‌و بنووسین کاریگەری نابێت بۆ دوا رووداو چونکە ئەم دیمەنە دواگرتەیەو خۆی تەواوکاری هێلی کارای سوورە لەم چیرۆکەدا.

لەمریەم زیاتر...هیچ کەسێك دوای مردنی هەر کەسێك هیچی لێنایەت، ئەوەتا مریەم مرد! ترێ‌ی تاقە خوشکیشی تاقانە ماوەتەوەو ئەگری، بەتەمایە باوەشی باوکی بەجێبهێڵێ‌و هەربەو هاڕەی گریانەوە بچێتەوە ژوورەکەی خۆی‌و لەوێ لەگەڵ دایکیدا تەرمی مریەم لەباوەش بگرن.

مام خدر-ی باوکیشی لەنێو حەوشەکە لەگەڵ پیاوانی دێ بەپێوە وەستاوەو ئەگری، ئەوە چەندین جارە پشدێنەکەی بکاتەوە فرمێسکەکانی پێ بسڕێ‌و دوبارە بیخاتەوە بەرپشتی.

یەعقوب-یش دوای گریانێکی زۆرو دوای تەواو بوونی کاری نووسینی من ئەیەوێ لەحەوشەکە لەگەڵ مندا بێتە دەرەوە، بەلام ئەو ئەچێت

بۆ ماڵی خوا کەزۆر لەماڵی مریەم-ی جوانەمەرگ نزیکە، دوای ئەوەی مریەم ئەنێژن لەوێ لەگەڵ خەڵکی ئاوایی پرسە ئەگرن و تادووسێ رۆژ لەوێ ئەمێنێتەوە، دواتر ئەویش بەناچاری ئەگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی خۆیان، منیش هەرلەئێستاوە ئەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ ماڵەکەی خۆم چونکە بەم شێوە کۆتاییەو دوای تێر تێر گریانم زەین و روئیای من لێوانلێو ئەبێ.

* * *

## دواجار خوێنەری بەڕێز....

ئەگەر تۆش دیمەنی زیاترت گەرەکەو زیاتر حەزت لەبەدواداچوونە، ئەتوانی لەگەڵ تریێ بەنێو قەرەباڵغی ژنان و پیاوانی نێو حەوشەکەدا بچیتە بەردەمی ژوورەکەی ئەو دوو خوشکە، لەوێشەوە بەدەستەکانی خۆتان ژنەکانی بەردەرگا لابدەن و لەگەڵ تریێ بچنە ژووریێ، دواتر تریێ بەگریانەوە باوەش ئەکات بەدایکیداو تەرمەکەی مریەم ئەگرێتە باوەش و ماچی دەکات.

تۆش بەنێو ژوورەکەدا چاو بخشێنە رووەو دەرەوە بوەستە، سەیری لای دەستی راستت بکە ئەبینی لەبەردەمی ئاوێنە تەڵخەکە لەسەر تەختەیەك چەند شتێکی جوانکاری کچانەی لەسەر کەوتووە، دوو شانەی چڵکنیشی لەسەرە کەچەند تاڵە موویەکی پێوەنووساوە، شووشە عەترە باڵا بەرزەکەش لەوێ بڕیاری قەتیسماوی خۆی داوە بەبێ فەرمانی پەنجەکانی مریەم نایەتە دەرەوە، بەتەنیشت ئاوێنەکە چەند جلێکی رەنگاورەنگی کچانە بەسەر پارچە نایلۆنێك هەڵواسراوەو هەرهەموی بەقوماشێکی تەنك داپۆشراوە بەڵام لای خوارەوەی جلەکان بەدەرەوەیە، لەپشتیشت چرایەکی کوژاوە هەڵواسراوەو لەئاستی خۆی تابنمیچ بەسەر دیوارەکەدا رەشی هەڵکشاوە.

* * *

## بەرێزان....

خوێنەرە ئافرەتەکان ئەتوانن لەژوورەوە لەگەڵ ژنەکانیتر بمێننەوە، بەڵام خوێنەری پیاو بەپێی دابونەریتی کوردەواری ئەبێ ژوورەکەو ناو ژنان بەجێبهێڵنو بێنە ناو حەوشەکە لەگەڵ پیاوەکاندا بوەستنو دڵنەوایی مام خدر بکەن.

ئەمڕۆ دووەم ڕۆژی زستانی ساڵی ١٩٩٤ـە، کاتیش لەهەشتی بەیانی تێپەڕی کردووە، بەفرو باران وەستاوەتەوە بەڵام هەواکەی زۆر ساردە، ئەوەتا چەند پیاوێکی ئاوایی بەپاچو خاکەناس گەیشتنە بەردەرگای ماڵی مام خدر! ئەیانەوێ پیاوان کۆبکەنەوەو بچن لەگۆڕستانەکەی خۆیان گۆڕێك بۆ ئەو کچە جوانەمەرگە هەڵبکەنن، دواتریش هەرهەموویان لەمزگەوت کۆئەبنەوە بۆ پرسەگرتن.

بەڵام بڕیاری ترێ‌ی بچکۆلە سەر ئەگرێو کەسیش دڵی نایەت قسەی بشکێنێ بەتایبەتی دایكو باوکە پیرەکەی، ترێ داوا دەکات کە گۆڕی مریەمی جوانەمەرگ لەسەر تەپۆلکە شاخەکەی بەرامبەریان لەنزیك ڕەبیە کۆنەکە بێت کە ئەم بەیانیە لەسەرجەم مینەکان پاککراوەتەوەو هەر ئەم ترسی تەقینەوەیەش بووە هۆی دیقکردنی دڵی ئەم خوشکە عاشقەی‌و لەهەڕەتی جوانیدا مەرگی تەسلیم بەدەسەلاتی ئاسمان کرد، لەوێشەوە گۆڕەکەی بەسەر ئاواییدا بڕوانێو ئەوانیش بەردەوام لەنێو گوندەکەوە سەیری بکەن.

لەکۆتاییدا ئەڵێم:- هەزاران سڵاوو ڕەحمەت لەڕۆحی ئەوانەی گیانی خۆیان لەپێناوی عیشقدا بەخشی. وەك مەمو زین، لاسو خەزاڵ، خەجو سیامەند، خوشکە مراوی.....هتد.

*    *    *

## دوای تەواو بوونی هێلی گشتی ئەم دەقە

١. مام خدرو بلکە هەیبەت-ی باوك‌و دایکی مراوی گیان ساڵێك کەمتر دوای جوانەمەرگ بوونی مریەم واتا پێش کۆتایی ساڵی١٩٩٥ ئەم دونیایەیان بەجێهێشت.

٢. مام حەمەد قادر-ی دوکاندار لەبەهاری ساڵی ١٩٩٦دا کۆچی دوایی کرد، خەڵکی ئاوایی بەرێوڕەسمێکی زۆر جوان تەسلیم بەخاکیان کردو تائێستاش هەموویان‌و یەعقوب-یش سەردانی گۆڕەکەی دەکەن.

٣. مەلا عەلی‌و ئایشێ خانی باوك‌و دایکی یەعقوب لەساڵی ١٩٩٧ ماڵئاواییان لەم ژیانە کرد.

٤. بەیان-ی خوشکی یەعقوب هەرلەدێکەی خۆیان لەساڵی ٢٠٠٠ شووی کردووە بەئامۆزای خۆی‌و کچ‌و کوڕێکی هەیە، کچەکەی بەناوی مریەم-ەوە ناوناوەو لەماڵەوەش بۆ خۆشەویستی بانگی ئەکەن مراوی، کوڕەکەشی بەناوی باوکیەوە ناوناوە عەلی، جارجارە سەردانی یەعقەب دەکات.

٥. ترێ دوای مردنی دایك‌و باوکی لەماڵی خزمێکی خۆیان مایەوە تاگەورە بوو، لەساڵی ٢٠٠٤ هەر لەگوندەکەی خۆیان شووی بەکوڕێك کرد، تائێستاش منالیان نەبووە، هەرلەنێوماڵە کۆنەکەی خۆیاندا لەگەڵ مێردەکەی لەژوورە کۆنەکەی دایك‌و باوکی ژیان بەسەر دەبات، بەلام ژوورەکەی مریەم گیان....چۆن داخراوە تا ئێستاش وەکو خۆی ماوەو دڵی نایەت بیکاتەوە، هەندێجار

بەسەردان ئەچن بۆ گوندەکەی ئەودیویان بۆ ماڵی خاڵە یەعقوبی دوکانداری بەیان-یش دێت بۆ لایان، زۆرجار بەیەکەوە باسی رابردوو ئەکەن و ئەگرین.

٦. یەعقوب-یش بەتەنها لەماڵە کۆنەکەی خۆیان ماوەتەوە، وازی لەمەڕداری هێناوە، هەرلەناو ماڵەکەی خۆیان دوکانێکی بچکۆلەی کردۆتەوەو تائێستاش ژنی نەهێناوە، بەنیازیش نیە دوای مراوی گیان هاوسەرگیری بکات، بەردەوام بەیان-ی خوشکی سەردانی دەکات و جل شتن و چەند ئیش و کارێکی‌تری ناوماڵیشی بۆ ئەکات، بەردەوامیش مناڵەکانی بەیان لەباوەش دەگرێ و لەنێو دوکانەکەدا خەریکی کێك و نقول خواردنن، خاڵە یەعقوب مریەم-ی بچکۆلەی زۆر خۆش دەوێ و هەردەم لەباوەشی ئەگرێ، عەلی بچکۆلیشی خۆش دەوێ، خۆشی تائێستا لەگەڵ فرمێسك و هەنسك ئەژی و دوکانەکەشی بووتە شوێنی کۆبوونەوەی گەنجانی گوندەکەی.

* * *

## سەردانی گۆڕەکەی مریەم

لەگەڵ سەرەتای هەموو بەهارێك، لەگەڵ دەرکەوتنی گوڵاڵە سوورەدا کەهێشتا ئەو ناوچەیە سەرماو سۆڵەی تیا ماوە یەعەقوب ئۆقرەی لێ ئەبڕێ، لەگەڵ بەیان-ی خوشکیدا سەرئەکەون بۆ تەپۆلکە بەرزەکەی نێوان هەردوو گوند بۆ سەردانی گۆڕی خوشکە مراوی، بەیان-یش دڵی یەعقوب ناشکێنێ چەند خواردنێك ئامادە دەکات‌و منداڵەکانیش ئەبەن‌و ئەڕۆن بۆ ئەوێ، کچانی ناوچەکە چەندین پەڕۆی سەوزو مۆم‌و بوخوردو شتیتریان لەسەر گۆڕی مریەم داناوە، ئێستاش کچانی ئەوێ لەوەرزی بەهاراندا بۆ کردنەوەی رازو نیازو بەختیان سەردانی دەکەن‌و لەخوشکە مراوی دەپاڕێنەوە کەئەوەی لەدڵیاندایە بۆیان بهێنێتە دی.

هەرکە یەعەقوب‌و بەیان ئەگەنە ئەوێ خەبەریش بۆ ترێ ئەنێرن کەبێت بۆ سەرگۆڕی ئەو جوانەمەرگە، ئەویش شنۆی هاوڕێ کۆنەکەی مریەم لەگەڵ خۆی ئەهێنێ‌و چەند کچێکی تریش دوایان دەکەون، شنۆ ئەو هاروهاجیەی جارانی نەماوە، ئێستا لەبەهاراندا لەگەڵ یەعقوب لەسەر گۆڕی مریەم گیان لەجیاتی گاڵتەو گەپەکانی پێشووی خەریکی فرمێسك رشتنە.

کەئەگەنە ئەوێ هێشتا بەفر لەسەر ئەو بەرزاییە نەبڕاوە، سەرجەم کچان‌و ژنان بەدەوری ئەو تاکە گۆڕە دانیشتوون، لەیەکەم سەردانی بەهاری ١٩٩٥دا بۆ سەر گۆڕی مریەم، ترێ ئەوکاتە منداڵ بوو

لەنێو کچەکانی هاوڕێ دانیشتبوو، سەری هەڵبڕی بۆ یەعقوب و بەگریانەوە پێی ووت:-

تریێ// (بەگریانەوە) کاکە یەعقوب ئەوشەوە

مریەم لەبەر دواکەوتنی تۆ دیقی کرد.

یەعقوب-یش هەربەپێوە سەیرێکی دەکات و بەگریانەوە بەچواردەوری گۆڕی مراوی گیان ئەسوڕێتەوە، جارجارە دەست ئەهێنی بەکێلاکان و پاکی دەکاتەوە کەلەسەری نووسراوە ( الفاتحە.....خوالێخۆشبوو مریەم خدر رەسول لە شەوی ٢١لەسەر ٢٢/١٢/١٩٩٤دا کۆچی دوایی کردووە).

شنۆی هاوڕێ مریەم-یش بەحەپەساویەوە، بەچاوێکی سوور هەڵگەڕاوی پڕ لەفرمێسکەوە دوای قسەکانی تریێ سەیری یەعقوب و تریێ دەکات، وەکو بڵێی ئێستا بەتەواوی تێگەیشتم کەمریەم لەگەڵ یەعقوب دڵیان بەیەکەوە بوو، ئەو دیمەنەی ئەهاتەوە بەرچاو کەمریەم بەپێکەنینەوە نکوڵی لەعاشق بوونی خۆی دەکرد، شنۆش لەوێ زیاتر دەگری و سەیری یەعقوب و تریێ و گۆڕەکەی مریەم گیان دەکات و لەبەر خۆیەوە ورتەیەك دەکات:-

شنۆ// مریەم گیان بەقوربانی گۆڕەکەشت بم.

*　　*　　*

لەم شیعرە تابلۆیەشدا

کەچوارەمو دوا تابلۆی ژوانە گورگە

مەرقەدی مریم، لەسەر لووتکەی شاخ،

گشت تێی‌ئەڕوانن، بەکەسەرو داخ.

لەوەرزی بەهار، کیژان وەکو باخ،

جلی ڕەنگاو ڕەنگ، زۆر پۆشتەو پەرداخ.

چواردەوری ئەگرن، بۆی ئەگرین لەناخ،

بێدەنگ دانیشتوون، هەڵئەکێشن ئاخ.

* * *

ئەگەر لەبەهاری ساڵی ٢٠٠٧ بمانتوانیایە بەفرۆکەیەك لەسەر گۆڕەکەی مریەم بەرز ببینەوە، ئەمانبینی کچان لەچواردەوری گۆڕی مریەم دانیشتوون، یەعقوب-یش بەپێوە وەستاوە بەریش‌و سمێڵێکی ماش‌و برنجیەوە لەگەڵ ئەوانی‌تر ئەگری، بەردەوامیش بەیان‌و ترێ‌و شنۆ سەیری روخساری خاڵە یەعقوب-ی دوکاندار دەکەن‌و هێندەی خۆیان‌و ئەویش قووڵپی هەنسك قووت ئەدەنەوە، عەلی‌و مریەمی بچکۆلەش لەوناوە بەدەم یاریکردن ئەکەون‌و هەڵئەستنەوە.

* * *

تەواو